# ش

**ش- حر (ش-Ş):**
پیتی شازدەیەمی ئەلفبای فارسییەو بە (شین) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی (ئەبجەد) بەرانبەر بە ژمارە (٣٠٠) سێسەدە.

**ش-** ضمیر(ش- ş): مانای ئەوە دەگەیەنێ وەک: کاغزش= کاغەزی ئەو.

**شائبە-** ا.فا(شائیبە- şa'îbe): خەوش، گومان، لەوتاوی، گەرد.

**شائق-** ا.فا(شائیغ- şa'ix): ئارەزوومەند، کەسێک تاسەی بکرێ.

**شائک-** ص.ع(شائیک- şaik): دڕکاوی، تێک ئالاو، دڕکدار.

**شاب-** ص.ع(شاب- şab): گەنج، لاو، خورت.

**شاباش-** ا(شاباش- şabaş): شاباش، پارەوپولێ کە لە زەماوەندا بە شایەر بدرێ یان بەسەربووکدا هەڵبدرێ.

**شابانک-** ا(شابانەک- şabanek): جۆرە رووەکێکە بۆ دەرمان بەکاردێ.

**شابرقان-** ا(شابورغان- şaburxan): پولا.

**شابیزک-** ا(شابیزەک- şabîzek): جۆرە رووەکێکە.

**شاپکا-** ا(شاپکا- şapka): شەپقە، جۆرە کلاوێکی قەراغدارە..

**شاپو-** ا.فر(شاپو- şapû): شەپقە. شاپور- ا.مر(شاپوور- şapûr): شازادە، کوڕی شا.

**شاپورگان-** ا.مر(شاپوورگان- şapûrgan): پولا.

**شات-** ا.ع(شات- şat): مەڕ، (یەک مەڕ چ بەران بێ و چ مەڕ).

**شاتل-** ا(شاتیل- şatil): جۆرە دانەوێڵەیەکە بۆ دەرمان دەشێت.

**شاتون-** ا.فر(شاتوون-şatûn): دەسکی پیستۆن.

**شاخ-** ا(شاخ- şax): لقی درەخت، بەش، شاخ و قۆچی هەندێ لە حەیوانات.

**شاخ-** ا(شاخ- şax): پیاڵەی شەراو خواردنەوە، جاران لە شاخی گاو کەرگەدەن یان عاج پیاڵەیان دروست دەکرد.

**شاخابە-** ا.مر(شاخابە- şaxabe): کەنداو، رووبار، جۆگەی بچووک کە لە رووبار یان دەریا جیابێتەوە.

**شاخ آهو-** ا.مر(شاخی ئاهو- şaxi ahû): کەوان، بەڵێندانی شتێک کە وەدەست هێنانی مەحاڵ بێ.

**شاخ بشاخ-** ص.مر(شاخ بیشاخ- şax bişax): جۆراو جۆر، شەڕەقۆچ، پێکدا هەڵشاخانی دوو کەس.

**شاخ بن**- ا.مـر(شاخ بون- şaxbun): لقی درەخت.

**شاخچه**- ا(شاخ چە- şaxçe): بوختان، شاخی بچووک، لقی بچووک.

**شاخدار**- ص.فـا(شاخـدار- şaxdar): گیانلەبەرانی شاخدار (بەرانو گاو کەڵەکێوی).

**شاخ در آوردن**- مص.ل(شاخ دەر ئاڤـەردەن- şax der averden): سەرسوڕمان، حەیرمان، شاخ دەرکردنی گیانلەبەران.

**شاخ زدن**- مص.م(شاخ زەدەن- şax zeden): لق دەرکردنی درەخت، شەڕەقۆچکردن، قۆچانێ.

**شاخسار**- ا.مر(شاخسار- şaxsar): ترۆپکی لق و پۆپی درەخت، لق و پۆپ.

**شاخشانه**- ا.مـر.شاخ شانە- şaxşane): هەڕەشـە، شـاخی گـا یان بەران و شـانە(ئەوزاری دەرۆزە)..

**شاخص**- ص.ا.ع(شـاخـیش- şaxis): بەرز، پیـاوی چاوگـەورەی چاوتیـژ، سـەعـاتی هەتاوی، هەڵبژاردە و دیار.

**شاخک**- ا(شاخەک- şaxek): شاخی بچووک، لقی بچووک.

**شاخل**- ا(شاخول- şaxul): جۆرە دانەوێڵەیەکە لە ماش دەچێو دەکرێ بەنان.

**شاخ و بال**- ا.مر(شاخو بال- şaxû bal): لق و پۆپی درەخت.

**شاخ و برگ**- ا.مـر(شـاخ و بەرگ- şax û berg): لق و پۆپ، شـاخ و باڵ نان لە قـسـەو باسان.

**شاخور**- ص(شاخڤەر- şax ver): شاخدار، پڕ لق و پۆپ.

**شاخور**- ا(شاخوور- şaxûr): شاکورە، کوورەی گەورە، کوورەی خشت سوورکردنەوە.

**شاخه**- ا(شاخـە- şaxe): لقی درەخت، لقی جۆگەو رووبار، دەستە.

**شاخین**- ص.ن(شاخین- şaxîn): درەخـتی پڕ لق و پۆپ.

**شاد**- ص.شـاد- şad): بە کـەیف، بێ خـەم، خۆشحاڵ، دڵخۆش، شاد.

**شاداب**- ص.مـر(شـاداب- şadab): تێـراو، پاراو، تەڕو تازە، ئاودار.

**شادان**- ص(شـادان- şadan): شـادمـان، دڵخۆش، خۆشحاڵ، بە کەیف، بێ خەم.

**شادانج**- ا(شادانەج- şadanec): شادانە.

**شادباد**- ا.مر(شادباد- şadbad): ئاهەنگێکی کۆنی مۆسیقای ئێرانییە.

**شادباش**- ا(شادباش- şadbaş): پیـرۆزبایی، شـاباش، (پارەدان بە شـایەرو چاوشـان یان پارە هەڵدان بەسەر بووکو زاوادا).

**شادبهر**- ص.مـر(شـادبەهر- şadbehr): خۆشحـاڵ، سوودمەند لە خۆشی دنیـا، کەسێک بەشی لە خۆشی و شادی دنیا زۆربێ.

**شادخ**- ص.ع(شـادیخ- şadix): منداڵ، لاو، وردیلەو ناسکو تەڕو تازە.

**شادخو**- ص.مر(شادخوو- şadxû): دڵخۆش، شادمان، بە کەیف و بە دەماخ.

**شادخواب**- ا.مر(شادخاب- şadxab): خەوی خۆش، خەوی شیرین، شەکرەخەو.

**شادخوار**- ص.فـا(شـادیخـار- şadixar): شـەرابخـۆر، شـاد، شـادمـان، خـۆشگوزەران، سۆزانی، رووسپی..

**شادخه**- ص.ا.ع((شادیخە- şadixe): سپێتی تەوێڵی ئەسپ، کە گەیبێتە سەر قەپۆزی.

**شادخی**- ص.ن(شادیخی- şadixî): خەڵکی شادخ (ناوی گوندێکی نزیکی بەلخ)ـە.

**شادربان**- ا(شـادوربان- şadurban): سەراپەردە، خێوەتی گەورە.

**شادروان**- ا(شـادورڤـان- şadurvan): سـەراپەردە، دیوانی مـیـرو سـوڵتـانان، فـەرشی نەخشین و گرانبەها، چادر.

**شادروان**- ص.مـر(شـادرەڤـان- şadrevan): رەحـمـەتی، خـوالێـخـۆشـبـوو، وشـەی رێزە بۆ مردووان.

**شادروان مروارید**- ا.مر(شادورڤانی مورڤارید- şadûrvani murvarîd): یەکێکە لەو سی ئاوازەی کە باربەد دایناب‌وو و بۆ خوسرەو پەرویزی لێدەدا.

**شادروز**- ص.مر(شادرووز- şadrûz): بەختەوەر، بە بەخت.

**شادزیستن**- مص.ل(شادزیستەن- şadzîsten): بە خۆشی ژیان، خۆشژینی، خۆشگوزەرانی.

**شادکار**- ص.مر(شادکار- şadkar): شادمان، دڵخۆش، بە کەیف، بێ خەم.

**شادکام**- ص.مر(شادکام- şadkam): کامەران، دڵخۆش، شادمان.

**شادکامی**- ا.مص(شادکامی- şadkamî): کامەرانی.

**شادگونه**- ا.مر(شادگونە- şadgûne): دۆشەک، پشتی، جبە، عەبا، گۆرانی بێژ (ئافرەت).

**شادمان**- ص(شادمان- şadman): دڵخۆش، خۆشحاڵ، شاد، شادمان.

**شادمانه**- ص(شادمانە- şadmane): ئاهەنگی خۆشی و شادی.

**شادمند**- ص.مر(شادمەند- şadmend): دڵخۆش، بە کەیف و بە دەماخ.

**شادناک**- ص.مر.شادناک- şadnak): خۆشحاڵ، پێچەوانەی خەمناک.

**شادنج**- ا(شادەنەج- şadenec): بەردێکی نیسک ئاسایە، جاران بۆ مالیجەی چاویەشە بەکار دەهات.

**شادنه**- ا(شادەنە- şadene): جۆرە بەردێکی نیسک ئاسایە..

**شادوان**- ا(شادوڤان- şaduvan): سەراپەردە، دیوانی میرو پاشایان.

**شادورد**- ا(شادڤەرد- şadverd): خەرمانەی مانگ، تەختی پاشایەتی، ناوی ئاهەنگێکی مۆسیقایە.

**شادیانه**- ق.ص(شادییانە- şadyane): مزگێنی، ئاهەنگ و کەیفی شادی.

**شادیچه**- ا(شادیچە- şadîçe): تەختی نووستن، لێفە، جبە، باڵاپۆش.

**شادی فزا**- ص.فا(شادی فەزا- şadî feza): شادیزا، زیادکەری شادی.

**شادی گرای**-ص.فا(شادی گیرای- şadî giray): شادیگێڕ، ئەهلی کەیف و شادی.

**شادی گستر**- ص.فا(شادی گوستەر- şadî guster): مایەی کەیف و خۆشی.

**شادی مرگ**- ا.ص(شادی مەرگ- şadî merg): شامەرگ، مردن لە خۆشیا.

**شاذ**- ص.ع(شاز- şaz): دەگمەن، تاقانە، نایاب، ریزپەڕ.

**شار**- ا(شار- şar): شار، بینای بەرز، ڕێگەی بەرین، شارێگە.

**شار**- ا(شار- şar): شاڵ، قوماشێکی زۆر ناسک و ڕەنگینە کە زیاتر ژنان دەیکەنە جلوبەرگ.

**شار**- ا(شار- şar): باڵندەیەکی ڕەشە وەکو تووتی قسان دەکات.

**شار**- ا(شار- şar): ناوی کۆنی پاشایانی گورجستان بووە.

**شارب**- ا.فا.ع(شاریب- şarib): شەرابخۆر، مەیخۆر، بخۆرەوە.

**شارب**- ا.ع(شاریب-şarib): سمێڵ.

**شاربن**- ا.فر(شاربون- şarbun): نەخۆشییەکی حەیواناتە.

**شاربین**- ا(شاربین- şarbîn): جۆرە درەختێکە لە جۆری سنۆبەر یان سەرو.

**شارح**- ا.فا.ع(شاریه- şarih): شەرحکار، شرۆڤەکار، راڤەکەر.

**شارد**- ا.فا.ع(شارید- şarid): رەڤی، یاخی، لاسار، هەڵاتوو، سەرکێش.

**شارده**- ا.فا.ع(شاریدە- şaride): رەڤی، یاخی، سەرکێش (بۆمێ).

**شارژ**- ا.فر(شارژ- şarj): بار، چارج، پایە، وزەی پاتری، پلەوپایە.

**شارژدافر**- ا.فر(شارژدافیر-şarjdafir): کاردار، ماموری سیاسی، جێگری وەزیر.

**شارسان**- ا (شارسان- şarsan): شارستان.

**شارستان**- ا(شاریستان- şaristan): شارستان، باژێر.

**شارشک**- ا(شارەشک- şareşk): رەبابە، ئامێرێکی مۆسیقایە.

**شارع**- ا.فا.ع(شاریع- şari’): شەرعکار، رێنوێن، خودان شەرع، پەیداکەری رێی ئاین.

**شارع**- ا.ع(شاریع- şari’): شەقام، خیابان، رێگە، جادە.

**شارف**- ص.ع(شاریف- şarif): کۆن (شەرابی کۆن)، کەسێک چی وای نەمابێ بۆ پایەی شەریفی.

**شارفە**- ص.ع(شاریفە- şarife): وشتری مێچکەی پیرو لەرو لاواز، ئامانی شەرابی وەکو گۆزەو کوپەو خەمری.

**شارق**- ا.فا.ع(شاریغ- şarix): هەتاو، پرشنگدار، تابان.

**شارک**- ا(شارەک- şarek): باڵندەیەکی رەشە وەکو تووتی قسە دەکات.

**شارلاتان**- ص.فر(شارلاتان- şarlatan): فێڵباز، بێبار، لاتی شاران، شەلاتی.

**شارمار**- ا.مر(شارمار- şarmar): شامار، ماری گەورە، حەزیا، ئەژدیها.

**شارو**- ا(شاروو- şarû): جۆرە باڵندەیەکی رەشە وەکو تووتی قسە دەکات.

**شاروان**- ا(شارڤان- şarvan): سەراپەردە، دیوانی میرو سوڵتانان، چادر.

**شارە**- ا(شارە- şare): سەروبەستێکی گەورەیە کە پیاوانی هیندی لەسەری دەکەن، چارشێوێکی تەنکە ژنانی هندی بەکاری دێنن.

**شارە**- ا.ع(شارە- şare): کەلوپەل، جلوبەرگ، جوانی و جەماڵ.

**شاریدن**- مص.ل(شاریدەن- şarîden): رژانی ئاو لە سەرەوە بۆ خوارێ.

**شاس**- ص.ع(شاسس- şass): لاواز، وشک، بەدخوو، بەد تەبیعەت.

**شاسپرم**- ا(شاسپەرەم- şasperem): رێحانە.

**شاست**- ا(شاست- şast): کەودەن، گەوج، چێرگ، میشەسی، چرک.

**شاسع**- ص.ع(شاسیع- şasi’): دوور، دوورە وڵات.

**شاسعە**- ص.ع(ساسیئە- şasi’e): دوور، دوورە وڵات، (بۆمێ).

**شاسی**- ا.فر(شاسی- şasî): چوارچێوە، بەدەن، شاسی ئوتومبیل.

**شاش**- ا(شاش- şaş): میز، پێشاو.

**شاش**- ا.ع(شاش- şaş): شاش، جۆرە شەدەیەکی ئاڵدوزییە لەسەر دەکرێ.

**شاش بند**- ا.مر(شاش بەند- şaş bend): نەخۆشی میزگیران.

**شاشدان**- ا.مر(شاشدان- şaşdan): میزڵدان، موسڵدان، تەنەکەیەک یان قاپێ کە میزی تێ بکرێ.

**شاشدن**- مص.ل(شاشیدەن- şaşiden): میزتن، میزکردن.

**شاش زدن**- مص.ل(شاشزەدەن- şaşzeden): پێدامیزتن.

**شاشک**- ا(شاشەک- şaşek): رەبابە، ئامێرێکی مۆسیقایە، سوێسکە.

**شاشنگ**- ا(شاشەنگ- şaşeng): سوێسکە.

**شاشو**-ص(شاشو- şaşû): میزن، مناڵێک بە خۆیدا بمیزێ، کەسێک لە خەودا میز بە خۆدا بکات.

**شاشە**- ا(شاشە- şaşe): میز.

**شاشی**- ص.ن(شاشی- şaşî): خەڵکی شاش (کە ناوی کۆنی شاری تاشقەند بوو).

**شاشیدن**- مص.ل(شاشیدەن- şaşîden): میزتن، رژان و رۆیبشتنی ئاو.

**شاشیه**- ا.ع(شاشییه- şaşiye): جۆرە تەڕبووشێکە کە لە میسرو هەندێ وڵاتی دیدا لەسەر دەکرێ.

**شاطر**- ص.ع(شاتیر- şatir): شاتر، نانەوا، نان پێوەدەر، چالاک، زیرەک، سەر قافڵەی کاروانی پاشایان.

**شاطی**- ا.ع(شاتی- şatî): رەخ، قەراخ، کەناری رووبارو دەریا.

**شاع**- ص.ع(شاع- şa'): ئاشکرا، پەراگەندە، هاوبەش.

**شاعر**- ا.فا.ع(شائیر- şa'ir): هەستیار، هەڵبەستوان، هۆزانڤان، شاعیر.

**شاعرانه**- ق.ص(شائیرانە- şa'irane): شاعیرانە، شاعیرئاسا.

**شاعره**- ا.فا(شائیره- şa'ire): هەستیار، هەڵبەستوان (بۆمێ).

**شاعی**- ا.ص. ع(شائی- şa'î): دوور، بەشی هاوبەش.

**شاغل**- ا.فا.ع(شاغیل- şaxil): کارو پیشەیەک کە مرۆڤ مژۆل بکات، مژولکار، سەرقاڵکار.

**شاغول**- ا(شاغوول- şaxûl): شاوڵ، ئەوزارێکە بۆ تاقیکردنەوەی خواری و راستی دیوارو پایە بەکاردێ.

**شاغوله**- ا(شاغوله- şaxûle): گوڵینگ و ریشووی شاشک و شەدە.

**شاف**- ا(شاف- şaf): شاف.

**شافع**- ا.فا.ع(شافیع- şafî'): تکاکار، شەفاعەتکار.

**شافعی**- ص.ن.ع(شافیئی- şafi'î): یەکێکە لە چوار مەزەبەکەی ئەهلی سوننەتو دەدرێتە پاڵ ئەبو عەبدوڵلا محەمەدی کوڕی ئیدریس کە یەکێکە لە ئیمامانی ئەهلی سوننەت.

**شافیعه**- ا.ص.ع(شافیئییه- şafi'îye): مەزەبی شافیعی.

**شافه**- ا(شافه- şafe): شاف.

**شافی**- ا.فا.ع(شافی- şafî): شیفابەخش، دەرمانێ کە نە خۆش پێی چاک بێتەوە، بنج بڕ (وەڵامی بێ چەندو چوون)..

**شافیدن**- مص.ل(شافیدەن- şafîden): کەوتن، خزین.

**شاق**- ص.ع(شاغ- şax): دژوار، ئەستەم، قورس، زەحمەت، کاری سەخت و دژوار.

**شاقول**- ا.ع(شاغول- şaxûl): شاقووڵ، شاوڵ.

**شاقه**- ص.ع(شاغغه- şaxxe): کاری قورس و زەحمەت، دژوار، سەخت.

**شاک**- ا(شاک- şak): سابرێن، تەگە، نێری.

**شاک**- ا.ع(شاکک- şakk): بە گومان، گومانکار، گوماندار.

**شاکار**- ا(شاکار- şakar): بێگار، سوخرە، کاری خۆڕایی.

**شاکر**- ا.فا.ع(شاکیر- şakir): سوپاسگوزار، شوکرانەبژێر.

**شاکری**- ا.ع(شاکیری- şakirî): کرێگرتە، خولام، نۆکەر.

**شاکله**- ا.ع(شاکیله- şakile): شێوە و روخسار، رێچکەو رێباز، نیاز، پێویستی، لا، خالیگە.

**شاکله**- ا(شاکیله- şakile): تووی فەرەنگی.

**شاکمند**- ا(شاکمەند- şakmend): لباد.

**شاکی**- ا.فا.ع(شاکی- şakî): دەم بە گلەیی، قەرەشکات، زار بە سکاڵا.

**شاگرد**- ا.ص(شاگیرد- şagird): قوتابی.

**شاگردانگی**- ا.مر(شاگیردانەگی- şagirdanegî): شاگردانە، پارەیەک کە کڕیار بە ناوی بەخشیش بیدات بە شاگردی دوکان.

**شاگردانه**- ق.ص((شاگیردانه- şagirdane): شاگردانە، وەکو شاگردان، شاگردان ئاسا.

**شال**- ا(شال- şal): شاڵ، جۆرە کوتاڵێکە، پشتێن، شاشک.

**شالده**- ا(شالوده- şalude): بناغه، بناغەی دیوار و تەلاران، هێم، بنەڕەت.

**شال سنجد**- ا(شال سینجەد- şal sinced): زەیتونی تاڵ.

**شالم**- ا.ع(شالەم- şalem): گەنمی کێوی، دانی جۆرە گیایەکە لە جۆ باریکترەو تامی زۆر تاڵە.

**شالنگ**- ا(شالەنگ- şaleng): رایەخێ کە لە ژێر فەرش و رایەخێن دییەوە رابخرێ.

**شالنگی**- ا.ص(شالەنگی- şalengî): موتاب، کەسێک کە موو بۆ خێوەت و ئەو شتانە برێسێ.

**شالوده**- ا(شالودە- şalûde): بناغە، بناخە، هێم، بنەڕەت، نەخشە، پلۆت.

**شالهنگ**- ا(شالهەنگ- şal heng): بارمتە، سەرکێش، لاسارو بزێو، فێڵو دەهۆو ئاژاوە.

**شالی**- ا(شالی- şalî): چەڵتووک، برنجی کرِنەکراو.

**شالی پایه**- ا.مر(شالی پایە- şalî paye): مەرەزە.

**شالی زار**- ا.مر(شالی زار- şalî zar): مەرەزە، کێڵگەی برنج.

**شالی کار**-ا.ص(شالی کار-şalî kar): مەرەزەوان، کەسێک کە برنج بچێنێ.

**شام**- ا(شام- şam): هەوەڵی شەو، سەرەتای شەو کە دنیا تازە تاریک دەبێ، خواردنی ئێوارە، ژەمی ئێواران.

**شاماخ**- ا(شاماخ- şamax): جۆرە هەرزنێکە..

**شاماخ**- ا(شاماخ- şamax): بەرکۆشە، سوخمەی مەمک، مەمکدان، مەمک لغ.

**شاماک**- ا(شاماک- şamak): سوخمە، مەمکدان، بەرکۆشە، بەرهەڵبێنە.

**شامپانی**- ا.فر(شامپانی- şampanî): جۆرە شەرابێکە کە لە باشترین جۆری ترێ دروستی دەکەن، شامپانی.

**شامپو**- ا.فر(شامپو- şampû): شامپۆی قژ شتن.

**شامپیون**- ص.فر(شامپیون- şampîyûn): قارەمان، پاڵەوان، براوەی پێشبرکێ، زێڕەڤان.

**شامخ**- ص.ع(شامیخ- şamix): بەرز، بڵند، لووتبەرز، خۆپەسەند، روح زل، بەدەعییە.

**شامخه**- ص.ع(شامیخە- şamixe): بەرز، بڵند، روحزل، (بۆمێ).

**شامگاه**- ا.مر(شامگاه- şamgah): ئێوارە وەختە، مەغریب.

**شامگاهان**- ا.مر(شامگاهان- şamgahan): ئێواران، مەغریبان.

**شامل**- ا.فا.ع(شامیل- şamil): هەمەگیر، بە هەموو کەسێکراگەیین.

**شامه**- ا.ع(شاممە- şamme): هەستی بۆنکردن (کەپوو).

**شامه**- ا(شامە- şame): لەچک، سەرپۆشی ژنان، پەردەی ناسک وەکو پەردەی دڵ.

**شامی**- ص.ن(شامی- şamî): خەڵکی شام (وڵاتی سوریا).

**شامی**- ا(شامی- şamî): کوبەی شام، جۆرە خواردنێکە.

**شامیانه**- ا(شامیانە- şamiyane): سەراپەردە، سابات، چەتر.

**شان**- ض(شان- şan): ئەوان.

**شان**- ا(شان- şan): شان و شەوکەت، رێزو حورمەت.

**شان**- ا(شان- şan): شانەی مێش هەنگ، پلوورە هەنگ.

**شانتاژ**- ا.فر(شانتاژ- şantaj): فروفێڵ، حیلەو هەواڵە، بێدەنگ کردنی کەسێک بەوەی هەڕەشەی ئاشکراکردنی نهێنییەکانی لێبکرێ.

**شاندن**- مص.م(شاندەن- şanden): شێکردن، شانەکردنی قژ.

**شـــاندن**- مص.م(شـــانـدەن- şanden): دانیشاندن.

**شـــانزده**- ا(شـــانزدە- şanzde): ژمـــارە شازدە(١٦).

**شانس**- ا.فر(شانس- şans): بەخت، یەغباڵ، تالع، شانس.

**شـــانک**- ا(شـــانەک- şanek): زیقـــەتۆرە، چیکڵدانە، سیقڵدانە.

**شانکر**- ا.فر(شـانکر- şankr): ئاگرە، زامی سیفلیس.

**شانه**- ا(شانە- şane): شان.

**شـــانه**- ا(شـــانە- şane): شێ، شـــانەی قـــژ داهێنان.

**شانه**- ا(شانە- şane): شانەی مێش هەنگ، پلووره هەنگ.

**شـــانەبین**- ا.ص(شـــانـەبین- şanebîn): فاڵگرەوە، فاڵچی.

**شانەسر**- ا.مر(شانەسەر- şane ser): جۆرە باڵندەیەکە، شانەسەر، پەپوسلێمانی.

**شـــانەگـــر**- ا.ص(شـــانەگـــەر- şaneger): شانەساز، کەسێ شانە دروست بکات.

**شانی**- ا(شانی- şanî): جۆرە دراوێکی کۆنە لە خۆراساندا باو بووە.

**شـــانیـــدن**- مص.م(شـــانیـــدە- şanîden): دانیشاندن.

**شـــاه**- ا.ص(شـــاە- şah): گـــەورە، پاشـــا، سوڵتان، فەرمانڕەوا.

**شاه اسپرغم**- ا.مر(شاە ئیسپەرغەم- şah isperxem): رەشە رێحانە.

**شاه اسپرم**- ا.مر(شاە ئیسپەرەم- şah isperem): رێحانە.

**شاه افسر**- ا.مر(شاە ئەفسەر- şah efser): گوڵەتاج، جۆرە رووەکێکە.

**شاەانجم**- ا.مر(شاهی ئەنجوم- şahi encum): خۆر، هەتاو، شائەستێرە.

**شاه انجیر**- ا.مر(شاە ئەنجیر- şah encîr): شاهەنجیر، هەنجیری زۆر چاک، هەنجیری وەزیری.

**شاهانه**- ق.ص(شاهانە- şahane): شـاهانە، وەکو پاشایان، شائاسا.

**شـاهانی**- ا(شـاهانی- şahanî): شـاهانی، جۆرە ترێیەکە.

**شـاهباز**- ا.مر(شـاهبـاز- şahbaz): شـاباز، بازی سپی.

**شاهبال**- ا.مر (شـاهبـال- şahbal): شـاپەڕ، گەورەترین پەڕی باڵی باڵندە.

**شـاەبالا**- ا.مـر(شـاە بالا- şah bala): برا زاوا.

**شاهبانک**- ا(شاهبانەک- şahbanek): جۆرە رووەکێکە.

**شاه بلوط**- ا.مـر(شـاە بەلوت- şahbelût): جۆرە درەختێکە، شابەڕوو.

**شاه بندر**- ا.ص(شاە بەندەر- şahbender): بەندەری گەورە، سەرۆک بازرگانان، باجگر.

**شاهبو**- ا.مر(شـاهبـو- şahbû): شـابۆن، بۆنی عەنبەر، مسک.

**شـاه بیت**- ا.مـر.شـاە بەیت- şah beyt): شـابەیت، بەیتێ کە لە هەموو بەیتەکانی غـەزەل یان قەسیدە باشترو رەوانتر بێ.

**شـاهپـر**- ا.مر(شـاهپـەر- şahper): شـاپەڕ، شاباڵی مەل.

**شـاەپرم**- ا(شـاە پەرەم- şahperem): رەشـە رێحانە.

**شـاه پسند**- ا.مـر(شـاە پەسـەند- şah pesend): شاپەسن، جۆرە گوڵێکی جوانە و رەنگی زۆری هەس.

**شاهپـور**- ا.مـر(شـاهپـوور- şahpûr): کـوڕی شا، شازادە.

**شـاه تره**- ا.مـــر(شـــاە تەرە- şah tere): شاتەڕە، جۆرە رووەکێکە بۆ دەرمان دەکار دەبرێ.

**شاهتـوت**- ا.مر(شاە توت- şah tût): شـاتوو، جۆرە درەختێکە، گاتوو، تووە سوورە.

**شاەتیر**- ا.مر(شاه تیر- şahtîr): کاریتە، دیرەک، شاتیر.

**شاهجان**- ص.ن(شاهجانی- şahcanî): لە قەبێکە لە زەمانی سەنجەرپاشای سەلجوقیدا بە شاری (مەرو) دراوە.

**شاه چینی**- ا.مر(شاه چینی- şah çînî): شیلەی گیایەکە لە چین دەڕوێ و بۆ دەرمان بەکار دێ.

**شاهد**- ا.فا.ع(شاهید- şahid): شایەت، گەواهیچی، ماشوق، دڵبەر، دڵدار.

**شاه دارو**- ا.ص(شاه داروو- şahdarû): شەراب، شادەرمان، باشترین دەرمان.

**شاه داماد**- ا.ص(شاه داماد- şah damad): زاوا، تازە زاوا.

**شاەدانە**- ا.مر(شاه دانە- şah dane): شادانە، جۆرە گیایەکە.

**شاهد باز**- ص.فا(شاهید باز- şahid baz): جوان باز، (لەگەڵ کوڕ یان ژندا)، هەتیوباز، ژن باز.

**شاهد پرست**- ص.فا(شاهید پەرەست- şahid perest): دڵبەر پەرست.

**شاهدخت**- ا.مر(شاهدوخت- şahduxt): کیژی شا، شازادە خانم.

**شاه درخت**- ا.مر(شاه دیرەخت-şah dirext): دەختی سنۆبەر.

**شاهدوش**- ص.مر(شاهیدڤەش- şahid veş): جوان.

**شاهده**- ا.فا(شاهیدە- şahide): جوان، دڵبەر.

**شاهراه**- ا.مر(شاهراه- şahrah): شارێ، جادە، شەقامەرێ.

**شاه رش**- ا.مر(شاه رەش- şahreş): پێوانەیەکە بە درێژی هەردوو باڵ.

**شاهرگ**- ا.مر(شاهرەگ- şahreg): شادەمار، دەماری مل.

**شاهرود**- ا.مر(شاهروود- şahrûd): رووباری گەورە، جۆرە سازێکە.

**شاهزاده**- ا.مر(شاهزادە- şahzade): شازادە، فەرزەندی شا، کوڕی پاشا.

**شاه زنگ**- ا.مر(شاهی زەنگ- şahi zeng): تاریکی شەو، شەو، شەوەزەنگ.

**شاه زیره**- ا.مر(شاه زیرە- şah zîre): شازیرە، زیرە، (جۆرە گیایەکە)..

**شاه سپرغم**- ا.مر(شاه سیپەرغەم- şha siperxem): ڕێحانە.

**شاه سپرم**- ا(شاه سیپەرەم- şah siperem): ڕێحانە.

**شاه سوار**- ص.مر(شاه سەڤار- şah sevar): سوارچاک، سوارخاس.

**شاهسون**- ا.خ(شاه سەڤەن- şah seven): گاردی تایبەتی شا عەباس، ناوی عێلێکی گەورەی ئێرانە.

**شاه فش**- ص(شاه فەش- şah feş): شائاسا، وەکو شا.

**شاه فنر**-ا.مر(شاه فەنەر-şah fener): شاسپرینگ، دەبلێی ئوتومبیل.

**شاهق**- ص.ع(شاهیغ- şahix): بەرز، بڵند.

**شاهقه**- ص.ع(شاهیغە- şahixe): بەرز، بڵند، شاخی بەرز.

**شاهکار**- ص.مر(شاهکار- şahkar): شاکار، کاری گەورەو پڕ هونەر.

**شاهگان**- ص(شاهگان- şahgan): شاهانە، پاشایانە.

**شاەمات**- ا.مر(شاه مات- şah mat): کش مات (لە گەمەی شەترەنجدا).

**شاه ماهی**- ا.مر(شاه ماهی- şahmatî): جۆرە ماسییەکی بچووکی دەریاییە.

**شاهنامه**- ا.مر(شاهنامە- şahname): کۆمەڵە کتێبێک بەو ناوە هەن کە سەربوورو سەرگوزەشتەی پاشایانی ئێرانی بە پەخشان یان هۆنراوە تۆمارکردووەو شانامەکەی فیردەوسی کە بریتییە لە شەست هەزار بەیت، یەکێکە لەو

شانامانەو لە خانەی داستانە هەرە بەناوبانگەکانی دنیا دادەنرێ.

**شاهنای**- ا.مر(شاهنای- şahnay): زورنا، زڕنا.

**شاهندن**- مص.ل(شاهەندەن- şahenden): پارێزکردن لە خراپە و کەچرەوی.

**شاهنده**- ص. فا(شاهەندە- şahende): چاکەکار، دروستکار.

**شاهنشاه**- ا.ص(شاهەنشاه- şahenşah): شای شاهان، پاشای گەورە.

**شاه نشین**- ا.مر(شاه نیشین- şah nişîn): شانشین، شوێنی دانیشتنی شا، کورسی پاشایەتی.

**شاهوار**- ص(شاهڤار- şahvar): شایستەی شا، شتی چاکو گرانبەها.

**شاهورد**- ا(شاه ڤەرد- şah verd): خەرمانە، خەرمانەی مانگ.

**شاهوش**- ص(شاه ڤەش- şahveş): شائاسا، وەکوشا.

**شاهول**- ا(شاهوول- şahûl): شاووڵ، شاقوولی بەنا.

**شاهی**- ا.مص(شاهی- şahî): پاشایەتی، فەرمانڕەوایەتی.

**شاهی**- ا(شاهی- şahî): جۆرە دراوێکی ئێرانییە.

**شاهی**- ا(شاهی- şahî): تەڕەتیزە، جۆرە سەوزەیەکە.

**شاهیدن**-مص.ل(شاهیدەن- şahîden): پاشایەتی کردن، سەروەری کردن، خواناسی.

**شاهیده**- ا.فا(شاهیدە- şahîde): چاکەکار، دروستکار، پارێزکار لە خەراپە.

**شاهین**- ا(شاهین- şahîn): شەهێن، جۆرە بازێکە.

**شاهین**- ا(شاهین- şahîn): شایەن، زمانەی تەرازوو.

**شایان**- ص(شایان- şayan): شایان، لایەق، شایستە، هەژ.

**شایستن**- مص.ل(شایستەن- şayisten): شایستەبوون، لایەق بوون، هەژبوون.

**شایع**- ص.ع(شاییء- şayî’): قاو، بڵاو، ئاشکرا، بانگەشە، دەنگۆ.

**شایعه**- ا.ع(شاییئە- şayî’e): دەنگۆ، گوتگوتک، قومی قومی، بانگەشە، هەواڵی بڵاوەبوو (راست یان درۆ)، مقۆ مقۆ.

**شایگان**- ص(شایگان- şaygan): شایستە، لایەق، هەژ، هەر شتێکی چاکو گرانبەها، بێگار.

**شایگان**- ا(شایگان- şaygan): جۆرە قافیە و سەروایەکی شیعرییە.

**شایورد**- ا(شای ڤەرد- şayverd): خەرمانە، خەرمانەی مانگ.

**شاییدن**- مص.ل(شاییدەن- şayîden): شایستەبوون، هەژبوون.

**شامت**- مص.ع(شەئامەت- şe’amet): شوومی، بەدبەختی، نەگبەتی، بەدێومی.

**شأن**- ا.ع(شەئن- şe’n): کاروبار، کاری گەورە، پلەوپایە، شان و شکۆ.

**شئون**- ا.ع(شوئون- şu’ûn): کاروباران.

**شب**- ا(شەب- şeb): شەو، لە رۆژئاواوە تا رۆژهەڵات.

**شب**- ا.ع(شەبب- şebb): زاخ.

**شباب**- مص.م(شەباب- şebab): جەوان بوون، لە بالق بوونەوە تا سی ساڵی، هەوەڵی هەر شتێک.

**شباب**- ا.ع(شەباب- şebab): لاوان، گەنجان، جەوانان، خورتان.

**شباب**- ا(شیباب- şibab): جۆرە رووەکێکە.

**شبابیر**- ا.ع(شەبابیر- şebabîr): شەیپووران.

**شباروز**- ا.مر(شەبارووز- şebarûz): شەو و رۆژ، هەمیشە، بەردەوام.

**شباشب**- ق(شەباشەب- şebaşeb): شەوانە، شەواوشەو، لە شەودا.

**شباط**- ا.ع(شوبات- şubat): مانگی شوبات(٢).

**شب افروز**- ص.فا(شەب ئەفرووز- şeb efrûz): هەر شتێک لە شەودا بدرەوشێتەوە، مانگ، گوڵەئەستێرە.

**شباک**- ا.ع(شیباک- şibak): تۆڕ، کۆمەڵە دەزگایەکی هاوپەیوەستو هاو شێوە لە کاردا.

**شبال**- ا.ع(شیبال- şibal): بێچووە شێران.

**شبالنگ**- ا(شەبالەنگ- şebaleng): نێچیر.

شبان- ا(شەبان- şeban): شەوان.

**شبان**- ا.ص(شەبان- şeban): شوان، شوانکارە، شڤان.

**شبان**- ا.ع(شوببان- şubban): لاوان، گەنجان، نەوجەوانان.

**شب انبوی**- ا.مر(شەب ئەنبوی- şeb enbûy): شەوبۆ (گیایەکی بۆن خۆشە).

**شب اندر روز**- ق(شەب ئەندەر رووز- şeb ender rûz): شەو و رۆژ، ٢٤سەعات.

**شبانروز**- ا.مر(شەبانرووز- şebanrûz): شەو و رۆژ.

**شبان فریب**- ا.مر(شەبان فەریب- şeban ferîb): باڵندەیەکە، شوان هەڵخەڵەتێنە.

**شبانگاه**- ا.مر.ق(شەبانگاه- şebangah): کاتی شەوێ، شوێنی شەوی چوار پێو پەزان.

**شبانگاه**- ا.مر(شەبانگاه- şebangah): شوێنی شەوانەی پەز..

**شبانه**- ص.ن(شەبانە- şebane): شەوانە، شەومەنە، جلی شەو، شیو، شەرابێ لە شەوا بخورێتەوە.

**شبانه**- ا.ص(شەبانە- şebane): شوانکارە، شوان، پەزەوان.

**شبانه روز**- ا.مر(شەبانە رووز- şebane rûz): شەو و رۆژ، ٢٤ سەعات، هەمیشە.

**شباویز**- ا.مر(شەباڤیز- şebavîz): تاق تاقکەرە.

**شباهت**- ا.مص(شەباهەت- şebahet): لێکچوون، پێک شوبهان.

**شباهنگ**- ا.مر(شەباهەنگ- şebaheng): بولبول، ئەستێرەی بەیانی، ئەستێرەی کاروان کوژە، ددانی ماشوقە، تەویلەی ولاخان.

**شباهنگام**- ا.مر(شەباهەنگام- şebahengam): کاتی شەوان.

**شب باره**- ص.مر.شەب بارە- şeb bare): ئاشقەشەو، ژنی سۆزانی و خراپ.

**شب بازه**- ا.مر(شەب بازە- şeb baze): شەمشەمە کوێرە.

**شب بازی**- ا.مر(شەب بازی- şeb bazî): فروفێڵ، نێرەنگو سیحربازی، بووکەڵەبازی.

**شب برات**- ا.مر(شەبی بەرات- şebi berat): شەوی بەرات، شەوی پازدەی مانگی شەعبان.

**شب بو**- ا.مر(شەب بوو- şeb bû): گوڵی شەوبۆ.

**شب پره**- ا.مر(شەب پەرە- şeb pere): شەمشەمە کوێرە.

**شب پوش**- ا.مر(شەب پووش- şeb pûş): لێفە، جلی شەو، چەرچەف، لەچکێک کە شەوان لەسەر بکرێ.

**شب پوی**- ص.فا(شەب پووی- şeb pûy): شەورۆ.

**شب پیما**- ص.فا(شەب پەیما- şeb pey-ma): کەسێک شەورەوی بکات، شەونخوونی و بێقەراری، عاشقی ناکام و بێقەرار.

**شبت**- ا(شیبت- şibt): دالان، ڕاڕەوی سەرگیراو.

**شبت**- ا.ع(شیبیت- şibit): شویت، (رووەک).

**شب تاب**- ص.فا(شەب تاب- şebtab): هەر شتێ بەشەو بدرەوشێتەوە، مانگ، گوڵەئەستێرە.

**شب تاز**- ا.مص(شەب تاز- şeb taz): شەبەیخون، شەوپەلامار.

**شبچراغ**- ا.مر (شەب چراغ- şeb çrax): گەوهەری بەدرەوشە، گەوهەری ئاودارو پرشنگدار.

**شبچراغک**- ا.مر(شەب چراغەک- şeb çraxek): گوڵە ئەستێرە.

**شب چرە**- ا.مر(شەب چەرە- şeb çere): شەوچەرە، ئاجیلو میوەکە لە شەونشینیدا بخورێ، لەوەرگەی شەوی پەزان.

**شب چک**- ا.مر(شەبی چەک- şebi çek): شەوی بەرات، شەوی پازدەی شەعبان.

**شبح**- ا.ع(شەبەھ- şebeh): تاپۆ، تارمایی، شەبەنگ.

**شبخانە**- ا.مر(شەبخانە- şebxane): شەوخانە، خانوویەک کە دەروێشان شەوی تیا بگوزەرێنن.

**شب خسب**- ا.ص (شەب خوسب- şebxusb): شەوخەو.

**شبخواب**- ا.ص(شەب خاب- şeb xab): شەوخەو، رابواردنی شەوانە لەگەڵ سۆزانیاندا.

**شبخوان**- ا.ص(شەب خان- şebxan): بولبول، هوزار.

**شب خوش**- (شەب خوش- şeb xûş): شەو بەخێر، شەوباش، (بەتایبەتی لە کاتی دوعاخوازیدا بەشەو).

**شبخون**- ا.مر(شەبخوون- şebxûn): شەبەیخون، هێرشی لەنکاوی شەوانە.

**شبخیز**- ص.فا(شەبخیز- şebxîz): شەوهەستان، شەوبێداری بۆ نوێژو عیبادەت.

**شبدر**- ا(شەبدەر- şebder): چەودەر، جۆرە رووەکێکە.

**شب دیز**- ا.ص(شەبدیز- şebdîz): شەو رەنگ، بەرەنگی شەو، شەودێز؛ ناوی ئەسپەکەی خوسرەو پەرویزە کە رەش بوو.

**شبر**- ا.ع(شیبر- şibr): بست،.

**شبر**- ا.ع(شەبر- şebr): زەوجین، مارەیی.

**شبر**- ا.ع(شەبەر- şeber): بەخشین، خێر، چاکی، چاکە.

**شبر**- ا.ع(شەببەر- şebber): ناوی حەزرەتی حەسەن و حوسەین کە هەندێ جار پێغەمبەر (د.خ) وای ناو دەبردن.

**شبراق**- ا.ع(شیبراغ- şibrax): جلی شڕو دڕاو، سیپاڵ، شپڕێو.

**شبرم**- ا(شیبرەم- şibrem): جۆرە رووەکێکی کێوییە.

**شبرنگ**- ص.مر(شەب رەنگ- şebreng): تاریک، رەش، ئەسپی رەش، گوڵێکی رەشە، بەردێکی رەشە.

**شبرو**- ص.فا(شەب رەو- şebrew): شەورەو، شەوبێدار، خواناس، حەس حەس، شەوگەڕ، دارۆغە، دز، رێگر، جەردە.

**شب زندەدار**- ص.فا(شەب زیندەدار- şeb zindedar): شەوبێدار، کەسێک بەشەو نەخەوێ، (بۆ عیبادەت یان شتی دی).

**شبست**- ص(شیبیست- şibist): ناپەسند، دزێو، ناحەز، ناشیرین.

**شبستان**- ا.مر(شەبیستان- şebistan): خەوتنگەی شەو، حەرمسەرا، بەشی سەرگیراوی مزگەوتێن گەورە، میحراب.

**شبع**- مص.ع(شەبء- şeb'): تێربوون، تێری.

**شبعان**- ص.ع(شەبئان- şeb'an): تێر.

**شبغارە**- ا.مر(شەبغارە- şeb xare): ئاغەڵی شەوانەی پەزان.

**شب فرخ**- ا.مر(شەبی فەرەخ- şebi ferex): ناوی ئاوازێکە لە سی ئاوازەکەی باربەد.

**شب فروز**- ص.فا(شەب فوروز- şeb furûz): هەر شتێ شەو روناک بکاتەوە، چرا، مانگ، مۆم، گوڵە ئەستێرە، ئەستێرۆک.

**شبق**- مص.ع(شەبەغ- şebex): بەر بەتاو، ئارەزووکردنی گان، ئالۆشی.

**شب قدر**- ا.مر(شەبی غەدر- şebi xedr): شەوێکی مانگی رەمەزانە کە شەوی عیبادەتو پاڕانەوەیە، قورئان لەم شەوەدا بۆ پێغەمبەر هاتۆتە خوارێ، ئەم شەوە بە تەواوی دیار نییە

دەڵێین یەکێکە لە شەوانی ١٧، ١٩، ٢١، ٢٣، ٢٥و ٢٧ی رەمەزان.

**شبک**- ا(شیبک- şibk): تەشی، نێرکی تەشی.

**شبک**- ا.ع(شەبەک- şebek): تۆڕ.

**شبکار**- ص.مر(شەبکار- şebkar): شەوکار، کرێکارێک بەشەو کار بکات.

**شب کلاە**- ا.مر (شەب کولاە-şeb kulah): شەوکڵاو، کڵاوی سوک کە شەو یان لەکاتی خەوتندا لەسەر بکرێ.

**شبکور**- ص.مر(شەبکور- şebkûr): شەوکوێر، کەسێک بەشەو نەبینێ.

**شبکوک**- ص(شەبکووک- şebkûk): دەروێش، هەژار، قەلەندەر، دەروێشێ لە شەوا بچێتە شوێنێکی بەرزو دوعای خێر بۆ خەڵکی بکات و سەدەقە وەربگرێ.

**شبکە**- ا.ع(شەبەکە- şebeke): تۆڕ، پەنجەرەو کڵاو رۆژنەی کون کون، تۆڕی جاسوسی.

**شبکیە**- ا.ع(شەبەکییە- şebekiye): پەردەی چاو.

**شبگاە**- ا.مر(شەبگاە- şebgah): شەوگا، شەڤین، جێی حەوانەوەی شەوانەی ئاژەڵان.

**شبگاە**- ا.مر(شەبگاە- şebgah): کاتی شەوێ، شەوەکی.

**شبگرد**- ص.فا(شەبگەرد- şebgerd): شەوگەڕ، حەس حەس، پاسەوان، دز، رێگر، گەڕان لە شەودا، مانگ.

**شبگز**- ا.ص(شەبگەز- şebgez): گەنە.

**شبگون**- ص(شەبگون- şebgûn): تاریک، رەش وەکو شەو، گەوهەری شەوچرا.

**شبگیر**- ا.مر(شەبگیر- şebgîr): کاتی بەرەبەیان، سەفەر لە دوای نیوە شەوەوە.

**شبل**- ا.ع(شیبل- şibl): بێچوە شێر، بێچوە شێرێ کە بتوانێ راو بکات.

**شبلی**- ص.ن(شیبلی- şiblî): ناوی گوندێکە، خەڵکی شبلی (ناوی گوندێکە).

**شب ماندە**- ص.مر(شەب ماندە- şebmande): شەومەنە، شەوبەسارە، شەوی، بەیات.

**شب نامە**- ا.مر(شەب نامە- şebname): شەونامە، بەیاننامەی یاساغ کە بە نهێنی و بە شەوان بڵاوبکرێتەوە.

**شب نشینی**- ا.مص(شەب نیشینی- şebnişînî): میوانی شەوو پێکەوە دانیشتن، شەونیشینی.

**شبنم**- ا.مر(شەبنەم- şebnem): شەونم، ئاونگ، شەڤنەم، خوناڤ، سیخوار.

**شب نما**- ص.فا (شەب نەما- şebnema): هەر شتێ بە شەو بدرەوشێتەوەو روناکی بدات، لابەری تاریکی.

**شب نهە**- ا.ص(شەب نیهە- şebnihe): گەنجی زێرو خشڵ کە لە ژێر زەویدا تەقەت بکرێ.

**شبور**- ا.ع(شەبوور- şebûr): شەیپور، بۆقی، کەرِنا.

**شبوط**- ا.ع(شەبووت- şebût): جۆرە ماسییەکە.

**شبە**- ا.ع(شیبە- şibh): چون یەک، هاوشێوە، وەک، میناک.

**شبە**- ا.ع(شەبەە- şebeh): مسی زەرد، جۆرە بەردێکی رەشی بریقەدارە.

**شبە**- ا.ع(شەبەە- şebeh): جۆرە رووەکێکە.

**شبهات**- ا.ع(شوبوهات- şubuhat): گومان و دوودڵی، شتێ نامەعلوم بێ و نەتوانرێ حوکمی لەسەر بدرێ.

**شب هنگام**- ا.مر(شەب هەنگام- şeb hengam): کاتی شەوێ، شەوەکی.

**شبهە**- ا.ع(شوبهە- şubhe): گومان.

**شبی**- ا.ص(شەبی- şebî): بیجامەی شەو، جلی خەوتن.

**شب یار**- ا.مر(شەب یار- şebyar): شەکراو.

**شب یازە**- ا.مر(شەب یازە- şeb yaze): شەمشەمە کوێرە، شەمشە.

**شبیبی**- ا(شەبیبی- şebîbî): جۆرە رووەکێکە.

**شبیخون**- ا.مر(شەبەیخوون- şebeyxûn): شەبەیخون، هێرشی لەنکاوی شەوانە بۆ سەر دژمن، شەوبگیر.

**شبینه**- ص.ن(شەبینە- şebîne): شەوانە، خواردنی شەومەنە، بەیات.

**شبیه**- ص.ع(شەبیه- şebîh): وەک، هاوشێوە، میناک.

**شپاشاپ**- ا(شەپاشاپ- şepaşap): شەپەشەپ.

**شپش**-ا(شیپیش- şipiş): ئەسپێ، دایکی رشک.

**شپشاپ**- ا(شەپشاپ- şep şap): شەپەشەپ.

**شپشپ**- ا(شەپ شەپ- şep şep): شەپە شەپ.

**شپشک**- ا(شپشەک- şipşep) ئەسپێی ئارد.

شپشه- ا(شیپیشە- şipişe): ئەسپێ.

**شپل**- ا(شیپل- şipl): فیکەکێشان.

**شپلت**- ا(شیپلەت- şiplet): فیکە لێدان.

**شپلیدن**- مص.ل(شیپلیدەن- şiplîden): فیکەکێشان.

**شپوختن**- مص.م(شیپووختەن- şipûxten): رشتن.

**شپیل**- ا(شیپیل- şipîl): فیکە .

**شپیلیدن**- مص.م(شەپیلیدەن- şepîlîden): گوشین.

**شت**- ا(شەت- şet): حەزرەت، جەناب.

**شت**- مص.ع(شەتت- şett): پەراگەندەبوون، پەرتەوازەبوون، بڵاوبوونەوە.

**شت**- ص.ع(شەتت- şett): پەراگەندەیی، پەرتەوازەیی.

**شتا**- ص(شیتا- şita): برسی، کەسێک کە فراڤین یان چێشتی نەخوارد بێ، ناشتا.

**شتاء**- ا.ع(شیتاء- şita’): زستان.

**شتاب**- ا.مص(شیتاب- şitab): لەز، پەلە، خێرا.

**شتابان**- ص.فا(شیتابان- şitaban): کەسێک بە پەلە رێ بکات یان کار بکات.

**شتاب زده**- ص.مر(شیتاب زەدە- şitab zede): پەلەپەل، هەڵەپەڵە.

**شتابکار**- ص.فا(شیتابکار- şitabkar): پەلەپەلکەر.

**شتابگر**- ص.فا(شیتابگەر- şitabger): پەلەکار.

**شتابگرفتن**- مص.ل(شیتاب گیرفتەن- şitab girften): پەلەکردن، گورپەستنەوە.

**شتابیدن**- مص.ل(شیتابیدەن- şitabîden): پەلەکردن، لەزکردن.

**شتات**- مص. ع(شەتات- şetat): پەراگەندەبوون، بڵاوبوونەوە، تەرتەو وەرتە بوون.

**شتات**- ص.ع(شەتات- şetat): پەراگەندە، پەرتوبڵاو.

**شتافتن**- مص.ل(شیتافتەن- şitaften): پەلەکردن، لەزکردن، عەجەلەکردن.

**شتاک**- ا(شیتاک- şitak): لقی درەخت، لقی تازە.

**شتالنگ**- ا(شیتالەنگ- şitaleng): پاژنەی پێ.

**شتام**- ص.ع(شەتتام- şettam): جوێن فرۆش، دەم پیس، زمان پیس.

**شتر**- مص.ع(شەتر- şetr): بڕین، پارچە پارچەکردن.

**شتر**- ا.ع(شەتەر- şeter): هەڵگەڕانەوەی پێڵوی چاو، کەموکوری.

**شتر**- ا(شوتور- şutur): وشتر، حوشتر، دەڤەهان.

**شتربار**- ا.مر(شوتوربار- şuturbar): وشتربار، باری وشترێک.

**شتربان**- ا.ص(شوتوربان- şutur ban): سارەوان، وشترەوان، شوانی دەڤەهان.

**شتربە**- ا(شەتربە- şetrebe): ناوی ئەم مانگایەیە کە لە کلیلە و دمنەدا بەفێڵی دمنە بە دەستی شێر کوژرا.

**شترچران**- ص.فا(شوتور چەران- şutur çeran): شوانی دەڤەهان، وشتر لە وەڕین.

**شترخار**- ا.مر(شوتورخار- şutuxar): وشترالوک، عاگول، وشتر خۆرکە.

**شترخان**- ا.مر(شوتورخان- şutur xan): خانی وشتران، تەویلەی وشتران.

**شترخو**- ص.مر(شوتورخو- şuturxû): دڵڕەش، رقن، کینە لە دڵ، بەسەبرو حەوسەڵە.

**شتردار**- ص.فا(شوتور دار- şutur dar): سارەوان، وشترەوان.

**شتردل**- ص.مر(شوتوردیل- şutur dil): دڵڕەق، رقن، بوغزن، ترسنۆک.

**شترغار**- ا.مر(شوتور غاز- şutur xaz): جۆرە گیایەکە.

**شتر قربانی**- ا.مص(شوتور غوربانی- şutur xurbanî): وشتر کوشتنەوە بۆ قوربانی.

**شترک**- ا(شوتورەک- şuturek): بێچووە وشتر، شەپۆلی دەریا، خیزاو.

**شترکین**- ص.مر(شوتورکین- şutur kîn): وشترکینە، رقن، بوغز لەزگ، پۆرغز.

**شترگاو**- ا.مر(شوتور گاڤ- şutur gav): زەڕافە.

**شترگربە**- ا.مر(شوتور گوربە- şutur gurbe): دوو شتی نەگونجاو وەکو وشترو پشیلە، وشتر و قاپ قاپ.

**شترگلو**- ا.مر(شوتورگەلو- şutur gelû): گەلی بۆ ئاو، گونج، رەهەند.

**شترگیا**- ا.مر(شوتور گییا- şutur giya): وشترالوک، عاگوڵ، وشترخۆرکە.

**شترماب**- ص.مر(شوتورمەئاب- şutur meab): کەسێک وشتر ئاسا خاو بێ لە هەڵس و کەوتیا.

**شترمرغ**- ا.مر(شوتور مورغ- şutur murx): وشتر مر.

**شترمور**- ا.مر(شوتور مور- şutur mûr): وشترمر.

**شترنج**- ا(شەترەنج- şetrenc): شەترەنج.

**شتروار**- ق.ص(شەتورڤار- şutur var): وشترئاسا.

**شتروان**- ا.ص(شوتورڤان- şuturvan): سارەوان، وشترەوان.

**شتک**- ا(شیتەک- şitek): پرژەی ئاو.

**شتکار**- ا(شەتکار- şetkar): زەوی کێڵدراوی تۆودراو.

**شتل**- ا(شەتەل- şetel): پارەیەک کە قومارباز براوە وەکو بەخشیش بیدات بە خاوەن ماڵ یان کەسانی دیکە.

**شتلم**- ا(شوتولوم- şutulum: زۆر، ستەم، زوڵم، داد و بێداد، هات و هاوار.

**شتم**-مص.ع(شەتم- şetm): جوێن، جوێندان، جماندان، دوژێن.

**شتوی**- ص.ن.ع(شەتڤی- şetvî): زستانە، زستانی.

**شتە**- ا(شەتە- şete): جۆرە مێروویەکە لە گەڵای دارو درەخت و گیادەداو دەیخوات.

**شتە**- ا(شەتە- şete): ئەنگور، ترێ، خۆراکی شەومەنە، بەیات.

**شتی**- ص.ع(شەتا- şeta): پەراگەندە.

**شتیت**- ص.ع(شەتیت- şetît): کاری پەراگەندەو پچڕ پچڕ.

**شج**- مص.ع(شەجج- şecc): شکاندنی سەری کەسێک، شەقکردنی ئاوی دەریا لەلایەن کەشتییەوە.

**شجاج**- مص.ع(شیجاج- şicac): سەری یەکدی شکاندن.

**شجاج**- ا.ع(شیجاج- şicac): برینی سەر.

**شجار**- مص. ع(شیـجـار- şicar): شەڕکردن، ناحەزیکردن.

**شجار**- ا.ع(شیـجـار- şicar): داری کەژاوە، شـەوژەن، شـەوبەن، داریّ لە ژوورەوە بەپشـتـی دەرگاوە بنری، پشتکۆڵ.

**شجاع**- ص.ع(شوجاء- şuca’): ئازا، دلێر، بوێر، دلاوەر، جۆرە مارێکی باریکە، تیرەمار.

**شجاعت**- مص.ع(شـەجـائەت- şeca’et): ئازایەتی، دلێری.

**شجام**- ا(شەجام- şecam): سەرمای تووش کە درەختان وشک بکات.

**شـجـانـیـدن**- مص.م(شـەجـانـیـدەن- şecanîden): ساردکرنەوە، تەزاندن.

**شجر**- ا.ع(شەجر- şecr): کۆتایی دەم.

**شجر**- ا.ع(شەجەر- şecer): دارو درەخت.

**شجره**- ا.ع(شـەجـەرە- şecere): یەک دار، یەک درەخت.

**شـجـعـاء**- ا.ع(شـوجـەئاء- şuce’a’): دلاوەران، دلێران، بوێر و ئازایان.

**شجعان**- ا.ع(شوجئان- şuc’an): دلێران، دلاوەران.

**شجعه**- ص.ع(شەجەئە- şece’e): دلێران.

**شجلیز**- ا(شەجلیز- şeclîz): سەرمای تووش، توشک، کەلواز، تەشڵەخە، جەوەرە.

**شـجم**- ا.ع(شـەجـەم- şecem): لەناوچوون، فەوتان.

**شجن**- ا.ع(شەجەن- şecen): خەم، خەفەت، کول و کۆڤان، کەسەر، لق.

**شـجـون**- ا.ع(شـوجـوون- şucûn): خـەمـان، خەفەت و پەژاران.

**شـجـون**- مص.ع(شـوجـون- şucûn): خـەمین بوون، دڵتەنگ بوون.

**شجه**- ا.ع(شەجەجە- şecce): برینی سەر، زامی سەر.

**شجیج**- ص.ع(شەجیج- şecîc): کەسێک سەری شکابێ، سەرشکیاگ.

**شـجـیـدن**- مص.ل(شـەجـیـدەن- şecîden): ساردبوونەوە، سەرمابوون، تەزین.

**شجیع**- ص.ع(شەجیع- şecî’): دلێر، ئازا، دلاوەر، بوێر.

**شجیعه**- ص.ع(شەجیئە- şecî’e): ژنی ئازا، شێرەژن.

**شح**- مص.ع(شـەح- şeh): بەخـیـل بوون، بەخیلی، چروکی، ڕژدی.

**شح**- ص.ع(شـەح- şeh): پیـسـکە، ڕژد، دەسنوقاو.

**شحاح**- ص.ع(شەهاح- şehah): چاوچنۆک، تەماعکار، ڕژد، دەست نوقاو.

**شحرور**- ا.ع(شـوهروور- şuhrûr): شـالوور، ریشۆڵەی ڕەش، گاوانی سیا.

**شـحم**- ا.ع(شـەهم- şehm): پیـوو چەوری، غەزو بەز.

**شـحـمـه**- ا.ع(شـەهـمـە- şehme): پارچە پیوێک، پارچە بەزێک.

**شـحنه**- ا.ع(شـیـهنە- şihne): داروغـە، پۆلیس، پاسەوانی شار، حوکمداری سەربازی.

**شحوم**- ا.ع(شوهووم- şuhûm): غەزوبەز.

**شحیح**- ص.ع(شەهیـە- şehîh): چاوچنۆک، تەماعکار، دەستنوقاو، پیسکە، ڕژد.

**شـحـیم**- ص.ع(شـەهیم- şehîm): قـەڵەو، تێکسمڕاو.

**شخ**- ا(شەخ-şex): شاخی ئاژەڵان، لقی درەخت.

**شخ**- ا.ص(شـەخ- şex): لوتکەی چیـا، ترۆپکی شاخ، زەوی ڕەقو ناهەموار، بتەو.

**شخ**- ا(شـوخ- şux): چڵک، (هی لەش یان جلو بەرگ).

**شخار**- ا(شەخار- şexar): نوشادر.

**شخال**- ا(شەخال- şexal): ڕووشاو.

**شخالیدن**- مص.م(شەخالیدەن- şexalîden): ڕووشاندن.

**شخانه**- ا(شەخانە- şexane): ئەو گرە سپیوازەی لە ئەنجامی راخوشینی ئەستێرانەوە دەبینرێ.

**شخاییدن**- مص.م(شەخاییدەن- şexayîden): رووشاندن، برین کردن.

**شخسار**- ا.مر(شەخسار- şexsar): بەردەلان، چرە دارستان، زەوی رەقەنو ناهەموار.

**شخسار**- ا.ص(شەخسار- şexsar): چرە دارستان، بەردەلان.

**شخش**- ا(شەخیش- şexis): بالندەیەکی چکۆلەی دەنگخۆشە.

**شخش**- ص(شەخش- şexş): کۆن، شڕ، جلی کۆن و شڕ.

**شخش**- ا.مص(شەخش- şexş): خزین، کەوتن.

**شخشانیدن**- مص.م(شەخشانیدەن- şexşanîden): خزاندن، خزین.

**شخشخه**- ا.ع(شەخشەخە- şexşexe): خشەخش.

**شخشیدن**- مص.ل(شەخشیدەن- şexşîden): خزین.

**شخشیده**- ا.مف(شەخشیدە- şexşîde): خزیو.

**شخص**- ا.ع(شەخس- şexs): کەس، تارمایی لە دوورەوە، کاراکتەر.

**شخکاسه**- ا(شەخکاسە- şexkase): تەرزە، تەزرە، تەگر، شەونم، خوناف.

**شخ کمان**- ص.مر(شەخ کەمان- şexkeman): تیرەندازێ کە کەوانی قایمی هەبێ، بەهێز، تۆکمە.

**شخل**- ا(شەخل- şexel): نالەو فریادو هاوار، فیکە.

**شخلیدن**- مص.ل(شەخلیدەن- şexlîden): رووشاندن، بریندارکردن.

**شخم**- ا(شوخم- şuxm): شۆو، زەوی کێلراو.

**شخن**- ا(شەخەن- şexen): رووشاو، بریندار.

**شخودن**- مص.ا(شەخوودەن- şexûden): رووشاندن، بریندار کردن، بەنینۆک هەڵکەندن.

**شخوص**- مص.ع(شوخووس- şuxûs): بەرزبوون، هەڵاتنی ئەستێرە، چاونەنوقان، چاو نەتروکاندن.

**شخول**- ا(شەخوول- şexûl): هاوار، نالەو فریاد، فیکە.

**شخولیدن**- مص.ل(شەخوولیدەن- şexûlîden): ژاکان، سیس بوون، هاوارکردن، فیکەکێشان.

**شخولیده**- ا.مف(شەخوولیدە- şexû lîde): ژاکاو، سیس بوو.

**شخیدن**- مص.ل(شەخیدەن- şexîden): خزین، کەوتن لە شوێنێکەوە، ژاکان، سیس بوون.

**شخیر**- ا.ع(شەخیر- şexîr): پرخەپرخ.

**شخیش**- ا(شەخیش- şexîs): بالندەیەکی چکۆلەی خۆشئاوازە.

**شخیص**- ص.ع(شەخیس- şexîs): پیاوی کەتە، بەکەلەش، پیاوی گەورە.

**شخیصه**- ص.ع(شەخیسە- şexîse): کەسایەتی دیار.

**شخیل**- ا(شەخیل- şexîl): هاوار، نالە، فیکە.

**شخیلیدن**- مص.ل(شەخیلیدەن- şexîlîden): رووشان، بریندار‌بوون.

**شد**- مص.ع(شەدد- şedd): قایمکردن، بەهێزکردن، هەڵاتنی خۆر، راکردن، پەلاماردان.

**شدائد**- ا.ع(شەدائید- şeda'id): ناخۆشی، تەنگانە، کارەسات.

**شداد**- ع(شیداد- şidad): توند، سەخت، مکووم، بەرز.

**شداد**- ا.خ(شەدداد- şeddad): شەدادی کوڕی عاد.

**شدت**- ا.مص(شیددەت- şiddet): ناخۆشی، تەنگانەو سەختی ژیان.

**شدق**- ا.ع(شەدخ- şedx): لالغاوە، رەخی دۆڵ

یان دەریا.

**شدکار**- ا(شیدکار- şidkar): جووتکار، زەوی کێڵراوی تۆو دراو.

**شدکیس**- ا(شەدکیس- şedkîs): کوڵکە زێرینە، پەلکەزێرینە، زەردینە و سمینە، رەنگین کەوان.

**شدن**- مص.ل(شودەن- şuden): بوون، رۆیشتن، تێپەڕبوون.

**شده**- ص.مف(شودە- şude): بوو، تێپەڕیوو، رۆییوو.

**شدن**- ا.ع(شەدەن- şeden): درەختێکە لە یاسەمین دەچێت.

**شدو**- مص.ع(شەدوو- şedû): شیعر خوێندنەوە بە ئاوازەوە.

**شدو**- ا.ع(شەدو- şedû): تۆزێک لە هەر شتێکی زۆر.

**شده**- ا(شیدە- şide): هۆنراوە، ملوانکەی هونراوە، ریشو، گوڵینگ.

**شده بند**- ا.ص(شودە بەند- şude bend): رۆژنامەنووس، مێژوونووس.

**شدیار**- ا(شودیار- şudyar): شۆو، زەوی جووتکراو، وەرد.

**شدید**- ص.ع(شەدید- şedîd): توند، قایم، مکووم، بەهێز.

**شدیده**- ص.ع(شەدیدە- şedîde): توند، قایم.

**شر**- مص.ع(شەڕ- şerr): خراپەکردن، بەدکاری.

**شر**- ص.ع(شەڕ- şer): بەدکار، خراپەکار، بەدکردەوە.

**شراء**- مص.ع(شیراء- şira’): کڕین و فرۆشتن.

**شراب**- ا.ع(شەراب- şerab): خواردنەوە، مەی.

**شراب**- ص.ع(شەراب- şerab): مەی خۆر، شەرابخۆر، کەسێک زۆر بخواتەوە.

**شرابخانه**- ا.مر(شەرابخانە- şerabxane): مەیخانە، مەیکەدە.

**شرابخوار**- ص.فا(شەرابخار- şerabxar): شەرابخۆر.

**شرابدار**- ا.ص(شەرابدار- şerabdar): ساقی.

**شراب زده**- ص.مر(شەراب زەدە- şerab zede): کەسێک شەراب لێی دابێ و لەبەر چاوی کەوتبێ.

**شرابساز**- ص.فا(شەرابساز- şerabsaz): شەرابساز، دروستکەری شەراب.

**شرابه**- ا.ع(شەرابە- şerabe): ریشوو گوڵینگ.

**شرابی**- ص.ع(شەرابی- şerabî): سەقا، شەرابفرۆش.

**شرازم**- ا.ع(شەرازیم- şerazim): چەند کەسێکی کەم.

**شرار**- ا.ع(شەرار- şerar): پزیسکی ئاگر، پریشکی ئاگر.

**شرارت**- مص.ع(شەرارەت- şeraret): خراپە کردن، فیتنەگێڕی، بەدکرداری.

**شراره**- ا.ع(شەرارە- şerare): پزیسکی ئاگر.

**شراست**- مص.ع(شەراسەت- şeraset): بەدکاری، خراپەکردن، قەرقەشەکردن، ناکۆکی.

**شراشر**- ا.ع(شەراشیر- şeraşir): سەراپای کەسێک.

**شراع**- ا.ع(شیراء- şira’): بادەوان، بەربا، چارۆکەی گەمی بائاژۆ.

**شراعی**- ا.ص(شیرائی- şira’î): وشتری مل درێژ.

**شراعی**- ا.ص(شورائی- şura’iy): نێزەی راست و درێژ.

**شرافت**- مص.ع(شەرافەت- şerafet): بەشەرەف بوون، گەورەبوون.

**شرافتمند**- ص.مر(شەرافەتمەند- şerafetmend): رەسەن و نەجیم، ئابروومەند..

**شرافتمندانه**- ق.ص(شەرافەتمەندانە- şerafetmendane): ئابرومەندانە، سەربەرزانە.

**شراک**- ا.ع(شیراک- şirak): قەیتانی قۆندەرە، پووشی باران خواردوو.

**شران**- ص.فا(شوڕان- şurran): باران، شوڕەشوڕی ئاوی ڕەوان.

**شراهت**- مص.ع(شەراهەت- şerahet): ئارەزووکردنی خواردن، چڵێسیو چاوبرسێتی، نەوسنی چاوچنۆک.

**شرایط**- ا.ع(شەرایت- şerayît): هەلومەرجان.

**شرایع**- ا.ع(شەرایع- şerayî’): ئایینی پێغەمبەران.

**شرایین**- ا.ع(شەرایین- şerayîn): شادەماران.

**شرب**- ا(شەرب- şerb): جۆرە کەتانێکی ناسک و جوانە لە کۆندا دەکرا بە کراس و شاشک.

**شرب**- مص.ع(شورب- şurb): خواردنەوە.

**شربت**- ا.ع(شەربەت- şerbet): شەربەتی میوە، دەرمان.

**شربه**- ا.ع(شەربە- şerebe): هەڕەتی گەرما، تونێتی.

**شربین**- ا(شەربین- şerbîn): درەختێکە لە جۆری سنۆبەر، یان سەرو، داری پستە.

**شرپ**- ا(شیرپ- şirp): شڵپ، شتێ بکەوێتە ناو ئاو یان سەر زەوی و شڵپەی بێ.

**شرپا**- ا(شیرپا- şirpa): تایفەیەکی بودایین لە دەوروبەری هێمالایاو ئێڤریست دەژین.

**شرتی**- ص.عا(شیرتی- şirtî): ژنی جرپن و کاری نا ڕێک و پێک.

**شرج**- مص.ع(شەرج- şerc): کۆکردنەوە، بەدەست هێنانی شتێ، تێکەڵ کردنی شەراب لەگەڵ ئاودا.

**شرج**- ا.ع(شەرج- şerc): جۆر، دەستە، گروپ، ئاوەڕۆ.

**شرح**- مص. م .ع(شەرهـ- şerh): شەرح کردن، شرۆڤەکردن، راڤە، روونکردنەوە.

**شرحه**- ا.ع(شەرهە- şerhe): پارچە گۆشت.

**شرخ**- ا.ع(شەرخ- şerx): بنج و بناوان، هاوتا، هەوەڵی لاوی.

**شرذمه**- ا.ع(شیرزیمە- şirzime): دەستەیەکی کەم لە خەڵکی، کەمێکی کەم، پارچەیەک.

**شرر**- ا.ع(شەرەر- şerer): پزیسکی ئاگر.

**شرربار**- ص.فا(شەرەربار- şerer bar): شتێ ئاگری لێ هەستێ، شتێ پزیسکی لێ ببێتەوە، پزیسکدار.

**شررفشان**- ص.فا(شەرەرفەشان- şerer feşan): هەر شتێ پزیسکی ئاگری لێ ببێتەوە.

**شرزدک**- ا(شیریزدەک- şirizdek): گوێژ.

**شرزه**- ص(شەرزە- şerze): توندو تیژ، توڕە، پەشم و غەزەب.

**شرس**- مص.ع(شەرەس- şeres): دڕی، بەدخویی.

**شرس**- ص.ع(شەریس- şeris): بەدخوودڕ.

**شرشر**- ا(شورشور- şurşur): شوڕەشوڕی ئاو، دەنگی باران، دەنگی سۆلاڤ و تاڤگە.

**شرشره**- ا(شورشورە- şur şure): تاڤگەی بچووک، قەڵبەز.

**شرط**- مص.ع(شەرت- şert): مەرج دانان.

**شرط**- ا.ع(شەرت- şert): قەرار، پەیمان، مەرج.

**شرط**- ا.ع(شەرەت- şeret): نیشانە، ئاوەڕۆی بچووک، ڕەشە خەڵک، سەرداری قەوم.

**شرطه**- ا.ع(شورتە- şurte): شەرت و پەیمان، پاسەوان، پاسەوانی شار.

**شرطيه**- ص.ن(شەرتییە- şertiye): کارێک بەند بێ بە مەرجەوە، ڕستەی مەرجی.

**شرع**- ا.ع(شەرء- şer’): ڕێچکە، ڕێباز، ئایین، دین.

**شرعی**- ص.ن.ع(شەرئی- şer’î): هەر شتێ لەگەڵ حوکمی شەرعدا بگونجێ.

**اهل شرع**- ا.مر(ئەهلی شەرء- ehli şer’): قازی، پسپۆڕ لە زانستو کاروباری ئایین.

**شرعت**- ا.ع(شیرئەت- şir’et): عورف و عادەت، ئایین، وەک، میناک.

**شرعه**- ا.ع(شیرئە- şir’e): ژێی کەوان، ژێی ساز.

**شرف**- ا.مص. ع(شەرەف- şeref): ئابروو، شکۆ، گەورەیی، شوێنی بەرز.

**شرف**- ا.ع(شورووف- şuruf): نزیک.

**شرف**- ا.ع(شورەف- şuref): بالکۆنە، بەلەکۆنە، بانیژە.

**شرفاء**- ا.ع(شورەفاء- şurefa’): پیاوماقولان، گەورەپیاوان، پایەبەرزو نەجیمان.

**شرفات**- ا.ع(شەرەفات- şerfat): بانیژە، بالکۆنە.

**شرفاک**- ا(شەرفاک- şerfak): دەنگی پێ، هەر دەنگێکی هێواش.

**شرفالنگ**- ا(شەرفالەنگ- şerfaleng): دەنگی پێ، هەر دەنگێکی هێواش.

**شرفانگ**- ا(شەرفانگ- şerfang): دەنگی پێ.

**شرفه**- ا.ع(شورفە- şurfe): هەیوان بەلەکۆنە، بانیژە.

**شرفه**- ا.ع(شەرەفە- şerefe): مۆرەی سەر دیوار.

**شرفه**- ا.ع(شورفە- şurfe): باشترین و هەڵبژاردەترین بەشی دارایی.

**شرفه**- ا(شەرفە- şerfe): دەنگی پێ، هەر دەنگێکی هێواش.

**شرفیاب**- ص.فا(شەرەفیاب- şerefyab): کەسێک شەرەف و شانازییەکی پێ ببڕێ.

**شرفیابی**- ا.مص(شەرەفیابی- şerefyabî): موشەرەف بوون، گەیینە خزمەتی کەسێکی گەورە.

**شرق**- مص.ع(شەرغ- şerx): ڕۆژهەڵات، شوێنی هەڵاتنی خۆر، خۆرهەڵات.

**شرق اقصی**- ا.مر(شەرغی ئەغسا- şerxi exsa): ڕۆژهەڵاتی دوور.

**شرق اوسط**- ا.مر(شەرغی ئەوسەت- şerxi ewset): ڕۆژهەڵاتی ناڤین.

**شرقراق**- ا.ع(شەرەغراغ- şerexrax): دارکونکەرە.

**شرق شناس**- ا.ص(شەرغ شیناس- şer¨x şinas): ڕۆژهەڵاتناس، شارەزا لە وەزعو حاڵو زمانو داب و نەریتی میللەتانی ڕۆژهەڵات.

**شرک**- ا(شەرەک- şerek): زیپکە.

**شرک**- ا.ع(شیرک- şirk): کفر، شەریک پەیداکردن بۆ خودا.

**شرک**- ا.ع(شەرەک- şerek): داو، داوی ڕاوکردنی باڵندان.

**شرکاء**- ا.ع(شورەکاء- şureka’): شەریکان، هاوبەشان.

**شرکت**- مص.ع(شیرکەت- şirket): شەراکەت، کۆمپانیای شەریکی، کۆمپانیای هەمەجۆر هەیە.

**شرم**- ا(شەرم- şerm): شەرم، هەڵچوون، ناموس، ئامێری زاوزێ، حەیا.

**شرم**- ا.ع(شەرم- şerm): شەلەگەی دەریا، گیای زۆرو چڕ.

**شرم**- ا.ع(شەرەم- şerem): کەلی نەرمەی کەپوو.

**شرم الود**- ص.مف(شەرم ئالوود- şerm alûd): شەرمەزار.

**شرم آور**- ص.فا(شەرم ئاڤەر- şerm aver): مایەی شەرمەزاری.

**شرمجا**- ا.مر(شەرمجا- şermça): قوز، کێر.

**شرمزد**- ص.مر(شەرم زەد- şerm zed): شەرمەزار، خجڵ.

**شرمسار**- ص.مر(شەرمسار- şermsar): شەرمەزار.

**شرمگاه**- ا.مر(شەرمگاه- şermgah): قوز، کێر.

**شرمگن**- ص(شەرمگین- şermgin): شەرمەزار، خجڵ.

**شرمگین**- ص(شەرمگین- şermgîn): شەرمەزار.

**شرمناک**- ص(شەرمناک- şermnak): شەرمەزاری.

**شرمنده**- ص(شەرمەندە- şermende): شەرمەزار.

**شرمین**- ص(شەرمین- şermîn): شەرمین، شەرمەزار.

**شرنگ**- ا(شەرەنگ- şereng): ژەهر، گوژاڵک، کاڵەکە مارانە، تەحلەسێڤ.

**شروانی**- ص.ن(شەرڤانی- şervanî): خەڵکی شەروان، ویلایەتێکە لە باشووری رۆژهەڵاتی قەفقاز.

**شروج**- ا.ع(شوروج- şurûc): ئاوەڕۆ.

**شروح**- ا.ع(شوروە- şurûh): راڤە و شرۆڤان.

**شرود**- ص.ع(شەرود- şerûd): رەوینەوە، ترسانو هەڵاتن، ئاوارە، هەڵاتوو.

**شرور**- ا.ع(شورور- şurûr): خراپی، بەدکاری.

**شروط**- ا.ع(شوروت- şurût): هەلومەرجان.

**شروع**- مص.ع(شوروء- şurû’): دەستپێکردن.

**شروق**- مص. ع(شورووغ- şurûx): هەڵاتنی رۆژ.

**شروور**- ا.مر(شیروڤیر- şirû vir): قسەی هەلەق و مەلەق، قسەی بێ سەروبەر.

**شره**- مص.ع(شەرەە- şereh): تەماعکاری، چاوچنۆکی، نەوس و چێڵێسی.

**شره**- ص.ع(شەریە- şerih): زۆر خۆر، چاوبرسی، چاوچنۆک.

**شری**- ا.ع(شەرا- şera): زیپکە.

**شری**- ا.ع(شەرا- şera): کاڵەکە مارانە، تەحلەسیڤ، گوژاڵک.

**شریان**- ا.ع(شیریان- şiryan): شادەمار، دەماری خوێنبەر لە دڵەوە بۆ لەش.

**شریب**- ا.ص(شەریب- şerîb): ئاوی خواردنەوە، خواردنەوە، شەریک لە ئاو خواردنەوەدا.

**شریج**- ا.ص.ع(شەریج- şerîc): هاوشێوە، دارێ کە کەوانی لێدروست بکەن.

**شریح**- ا.ع(شورەیە- şureyh): ناوی پیاوێکە کە لە زەمانی عومەردا قازی کوفە بووە، دەڵێن بە فیتی عوبەیدوڵلا زیاد فتوای داوە کە حوسەینی کوڕی عەلی لە خەلیفەی وەخت یاخی بووە، بۆیە واجبی موسڵمانانە بەگژیا بچنەوە. جا لەم رووەوە هەر قازییەک بە پێچەوانەی هەق فتوا بدات بەو کابرایە دەشوبهێنرێ.

**شریحه**- ا.ع(شەریهە- şerîhe): پارچەی گۆشت، توێ، توێژ.

**شریدن**- مص.ل(شوریدەن- şurrîden): رژانی ئاو بە شورە شورەوە.

**شریر**- ص.ع(شەریر- şerîr): بەدکار، دز، شەڕانی، شەڕخواز.

**شریر**- ص.ع(شیریر- şirrîrr): شەڕانی، لەقەبی ئیبلیسە.

**شریطه**- ا.ع(شەریتە- şerîte): شەڕانی، بەدکار، شەرخواز، (بۆمێ).

**شریعت**- ا.ع(شەریئەت- şerî’et): رێباز، رێچکە، مەزەب، ئایین، شەریعەت.

**شریعه**- ا.ع(شەریئە- şerî’): شوێنی ئاو خواردنەوە، شوێنی ئاوپڕکردن لە رووبار.

**شریف**- ص.ع(شەریف- şerîf): پایەبەرز،

میر، گەورە، ئابڕوومەند.

**شریک**- ص.ع(شەریک- şerîk): شەریک، هاوبەش.

**شست**- ا(شەست- şest): ژمارە (٦٠).

**شست**- ا(شەست- şest): پەنجە کەڵە، کەڵەموست.

**شست**- ا(شەست- şest): قولابی ماسیگرتن، داو، کەمەند.

**شست آویز**- ا.ص(شەست ئاڤیز- şest avîz): جۆرە ئەشکەنجەیەکە، کە تاوانبار بە هەردوو کەڵەموستی پێ هەڵواسن.

**شستک**- ا(شەستەک- şestek): هەر شتێک لە شێوەی کەڵەموستی دەست بێ.

**شستگانی**- ا(شیستگانی- şistganî): بناغە، تەمەڵ، بنەما، بناخە، هێم، بنەڕەت.

**شستگر**- ا.ص(شەست گەر- şestger): تیرئەنداز، کەواندار.

**شستن**- مص.م(شوستەن- şusten): پاک کردنەوە، شوشتن.

**شوینده**- ا.فا(شویەندە- şûyende): بشۆر، شۆرەر.

**شسته**- ا.مف(شوستە- şuste): شۆردراو.

**شستن**- مص.ل(شیستەن- şisten): دانیشتن، رۆنیشتن.

**شستی**- ص.ن(شەستی- şestî): شتێ لە قامکی گەورە بچێ، پاڵێت.

**شسع**- ا.ع(شیسء- şis'): قەیتانی پێلاو، ماڵی کەم، زەوی تەنگ و کەم.

**شش**- ا(شیش- şiş): ژمارە (٦) شەش.

**شش**- ا(شوش- şuş): سی، سیپەلک، سیپەلاک.

**شش انداز**- ا.ص(شیش ئەنداز-şiş endaz): تاوڵەچی، مانگی چوارده، مزرۆکە (هێلکە و پیاز).

**شش بانو**- ا.مر(شیش بانو- şiş banû): شەش ئەستێرەی زوحەل، مشتەری، مەریخ، زوهرە، عەتاردو مانگ.

**شش بندان**- ا.مر(شیش بەندان- şiş bendan): جۆرە رووەکێکە.

**شش پر**- ا.مر(شیش پەڕ- şişper): گورزی ئاسنی شەش پاڵو، دار دەستی ئەستووری کورتی سەر تۆپزی شەش پەڕ.

**شش پستان**- ص.مر(شوش پیستان- şuş pistan): ژنێ کە مەمکی گەورەو چرچ بێ، ژنی پیر.

**شش پستان**- ص.مر(شیش پیستان- şiş pistan): دێڵەسەگ، (جنێوە بە ژنان دەدرێ).

**شش تا**- ا.مر(شیش تا- şiş ta): شەش تار، هەر سازێ شەش ژێی هەبێ.

**شش جهت**- ا.مر(شیش جیهەت- şiş cihet): شەش دەر، شەش لا، (باشوور، باکوور، رۆژهەڵات، رۆژئاوا، سەر، خوار) شەش ئالی.

**شش خاتون**- ا.مر(شیش خاتوون- şiş xatûn): مانگ و پێنج ئەستێرە.

**شش خان**- ا.مر(شیش خان- şiş xan): خێوەتی خڕ، چادری بازنەیی، پەردە، سەراپەردە.

**شش دانگ**- ا.مر(شیش دانگ- şiş dang): تێکڕای مڵک، هێستری پشت پان و چوار پەل قەوی.

**ششدر**- ا.مر(شیش دەر- şiş der): شەش ئالی، پاش و پێش، سەرو خوار، راستو چەپ.

**ششدرفنا**- ا.مر(شیش دەری فەنا- şiş deri fena): دنیای فانی.

**شش روزن**- ا.مر(شیش رەوزەن- şiş rewzen): دنیا، مانگ، پێنج ئەستێرە.

**شش سری**- ا.ص(شیش سەری- şiş serî): زێڕی خالیسە، تەڵای تەواو عەیار.

**شش سو**- ا.مر(شیش سو- şiş sû): شەش ئالی، شەشدەر، شەشلا.

**ششصد**- ا(شیش سەد- şiş sed): ژمارە (٦٠٠).

**شش طاق**- ا.مر(شیش تاغ- şiş tax): سەراپەردە، خێوەتی گەورەی شەش گۆشە.

**شش عروس**- ا.مر(شیش ئەرووس- şiş erûs): مانگ و پێنج ئەستێرەی.

**شش گوشه**- ا.مر(شیش گووشە- şiş gûşe): شەش گۆشە، دەمانچە.

**شش لو**- ا.مر(شیش لوو- şiş lû): شەش لۆ، (هەر کاغەزێکی شەش خاڵی قومار).

**ششلول**- ا.مر(شیش لول- şiş lûl): دەمانچەی شەش خۆر.

**ششلیک**- ا(شیش لیک- şiş lîk): تکە، گۆشتی لەشیشدراوی برژاو.

**شش وبش**- ا.مر(شیشوبیش- şişû biş): شەش و بێش، لە فکر و خەیاڵان ڕۆچون.

**شش و پنج**- ا.مر(شیش و پەنج- şişû penc): شەش و پێنج لە تاوڵەدا، قومار، هەرشتێ لەبەر فەوتاندابێ.

**شصت**- ا٠(شەست- şest): ژمارە (٦٠)شەست.

**شط**- ا.ع(شەتت- şett): شەت، ڕووباری گەورە کە بڕژێتە دەریاوە.

**شطاح**- ص(شەتتاه- şettah): چاو قایم، بێ شەرم، لە جیهانی سۆفیگەریدا بە کەسێک دەوترێ کە قسەی خیلافی شەرع بکات، یان وشەیەلێک بەکار بێنێ کە بە رواڵەت خیلافی شەرع بێ، وەکو (انا الحق)ـەکەی حوسەینی کوڕی مەنسووری حەلاج.

**شطار**- ص.ع(شوتتار- şuttar): زیرەکان، زیتەڵ، بێ باک.

**شطارت**- مص.ع(شەتارەت- şetaret): بێباکی، زیرەکی، دلڕەشی.

**شطحیات**- ا(شەتهییات- şethîyat): شەلتوپەڵت، قسەیەلێک کە بە رواڵەت پێچەوانەی شەرع بێ.

**شطر**- ا.ع(شەتر- şetr): نیوەی شتێک، بەش، پارچەیەک.

**شطرنج**- ا.ع(شیترەنج- şitrenc): شەترەنج.

**شطط**- مص.ع(شەتەت- şetet): دەرچوون لە سنووری خۆ، دوورکەوتنەوە لە هەق، ستەم کردن، زوڵم کردن.

**شطن**- ا.ع(شەتەن- şeten): رستی درێژ، پەت.

**شطور**- ا.ع(شوتور- şutûr): نیوە، بەش، پارچە.

**شطوط**- ا.ع(شوتوت- şutût): شەتان، شەتاوان.

**شعائر**- ا.ع(شەئائیر- şe'a'ir): نیشانان، رێ و رەسم و سرووتی ئایینی.

**شعاب**- ا.ع(شیئاب- şi'ab): دۆڵ، دۆڵان.

**شعار**- ا.ع(شیئار- şi'ar): دروشم، عادەت، داب، پەنهان و ئاشکرا، رێچکەو رێباز.

**شعاریر**- ا.ع(شەئاریر- şe'arîr): شاعیرۆکان، خەیاری ورد.

**شعاع**- ا.ع(شوئاع- şu'a'): تیشک، تیرۆژ.

**شعب**- ا.ع(شوئەب- şu'eb): لق.

**شعب**- ا.ع(شەئب- şe'b): گەل، میللەت.

**شعب**- ا.ع(شیئب- şi'b): دۆڵ، ئاوەڕۆ، تیرە.

**شعباء**- ص.ع(شەئباء- şe'ba'): ژنی ناوشان پان.

**شعبان**- ا.ع(شەئبان- şe'ban): مانگی هەشتەمی ساڵی کۆچی (مانگی پێش رەمەزان).

**شعبذه**- ا.ع( شەئبەزە- şe'beze): تەڕ دەستی، فێڵبازی، نێرەنگ، سیحر، جادوو، تەڵەکەبازی.

**شعبه**- ا.ع(شوئبە- şu'be): لق، لقی درەخت، جۆگەی ئاو کە لە رووبار جیابێتەوە، دەستە، لقی دایەرەیەک، شەلەگە.

**شعث**- ا.ع(شەئەس- şe'es): کاری بێ سەرو بەرو شێواو، قژی لوول.

**صــــــیــــــرورت**- مص.ع(ســــــەیرووڕەت- seyreûret): گـــۆڕان لە حــــاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دی، دۆخگۆڕکێ بەرەو باشی.

**صیصە**- ا(سیسە- sîse): ئامێرێکە تانوپۆی تەونی پێ ڕێک دەخرێ، حەسارو پەناگە، قەڵا، پەناگە، شاخی گاو کەڵەکێوی.

**صیغ**- ا.ع(سـیـیـەغ- sîyex): هەر شـتـێ لە قـاڵبـدا دابڕێژرێ، داڕشتن (بۆ وشە یان زێڕو زیو یان هەر شتێکی دی)، شێوە، شەکڵ.

**صـیـغـە**- ا.ع(سـیـیـغـە- sîyxe): داڕشتن، داهێنان، ئەفـڕاندن، ژنی بە سـیـغـە، ژنـی کـاتی بەپێی مەرج و حوکمی تایبەتی.

**صیغەرو**- ص.فا(سیغەرەو- sîxerew): ژن یان کچێک بە سیغە شوو بە پیاوێک بکات.

**صیغە سازی**- ا.مص(سیـغـە سـازی- sîxe sazî): گەردان سازی وشە بەپێی یاساو ڕێسای زمان.

**صیف**- ا.ع(سەیف- seyf): هاوین، تاوسـان، وەرزی گەرما.

**صـیـفی**- ص.ن.ع(سەیفی- seyfî): هاوینە، هاوینی، کشتوکاڵی هاوینە.

**صیفی کار**- ا.ص(سەیفی کار- seyfî kar): زەرعـاتی هاوینە وەک: (کاڵەکو شوتیو خەیارو باینجانو بامێ و تەماتە).

**صـیـقل**- ص.ع(سـەیغـەل- seyxel): مـشتو ماڵدەری شمشێرو چەقۆو ئاوێنەو ئەو شتانە.

**صـیـقل گـر**- ص.فـا(سـەیغـەل گـەر - seyxel ger): سیقالکار، کەسێک کە کانزایان مشتو ماڵدەدات، چەرخچی..

# ض

**ض- حر** (**ض**-Z):
پیتی هەژدەیەمی ئەلفبای فارسییە، کە بە (ضاد) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (٨٠٠)، ئەم پیتە تایبەتە بە زمانی عەرەبی و لە زمانی فارسیدا نییە.

**ضائر**- ا.فا.ع(زائیر- zair): موزیر، زیان گەیەنەر، زیان رەسێن.

**ضابط**- ا.فا.ع(زابیت- zabit): پارێزەر، حاکم، فەرمانڕەوا، پێشەنگ، ئەفسەر، بەهێز، هوشیار.

**ضابطه**- ا.فا.ع(زابیتە- zabite): پارێزەر (بۆ مێ)، یاسا، رێسا، زەبت و رەبت.

**ضابی**- ا.ع(زابی- zabî): ژیلەمۆ.

**ضاجر**- ص.ع(زاجیر- zecir): بێزار، دڵتەنگ، بێ ئارام لە خەمباریدا، نیگەران.

**ضاجع**- ا.ص.ع(زاجئی- zacî'): پیاو کە لەسەر لا خەوتبێ، پیری پەککەوتە، پێچی رووبار یان شیو.

**ضاجعه**- ا.ص.ع(زاجیئە- zacî'): رێژگەی روبار، پەزێن فرە.

**ضاحک**- ا.فا.ع(زاهیک- zahik): دەم بە پێکەنین، هەوری بە بریسکە.

**ضاحکه**- ا.فا.ع(زاهیکە- zahike): ددانی پێشەوە، ددانێ کە لە کاتێ پێکەنیندا دەربکەوێ.

**ضاحی**- ا.فا.ع(زاهی- zahî): بەرز، دیارو ئاشکرا، ئەوەی هەتاو بیگاتێ.

**ضاحیه**- ا.فا.ع(زاهییە- zahiye): دوروبەری شار، بەرز، ئاشکراو دیار.

**ضار**- ا.فا.ع(زار- zar): موزیر، زیان بەخش، زیان رەسێن.

**ضارب**- ا.فا.ع(زاریب- zarib): شەوی زۆر تاریک، شوێنی نزمو هەموار کە درەختی لێ بێ.

**ضارع**- ص.ع(زاریع- zari'): خاکی، رام، باریک و بنێس، لەڕولاواز.

**ضارور**- ا.ع(زاروور- zarûr): پێویستی، زەروری.

**ضاروراء**- ا.ع(زارورراء- zarûra'): پێویستی، قاتی، تەنگانە.

**ضاروره**- ا.ع(زاررە- zarûre): ئاتاجی، پێویستی، زیان.

**ضاری**- ا.ص.ع(زاری- zarî): گیانلەبەرانی درندەو گۆشتخۆر وەکو شێرو بەورو گورگ، تانجی، موزیر، زەرەردار، هۆڤ.

**ضاغط**- ا.فا.ع(زاغیت- zaxît): گوشارکار، نیگابان.

**ضاغوط**- ا.ع(زاغوت- zaxût): مۆتەکە، مێردەزمە، شەوە، کابوس، شەوگ.

**ضال**- ص.ع(زالل- zall): گومڕا، ئاواره، ڕێ هەڵەکردوو، وێڵ.

**ضاله**- ص.ع(زالله- zalle): گومڕا، ئاواره، ڕێ هەڵەکردوو (بۆمێ).

**ضامر**- ص.ع(زامیر- zamir): لاواز، لەڕ، داڵەگۆشت، ناوقەد باریک، ئەندام باریک، وردیله.

**ضامن**- ص.ع(زامین- zamin): کەفیل، پابەند، زەمانەتکار، دابینکەر.

**ضایع**- ص.ع(زایع- zayi’): زایە، بێهوده، بێ کەڵک، گوم، پشت گوێ خراو.

**ضایعه**- ص.ع(زایئه- zayi’e): زایە، بێهوده، لە کەڵک کەوتوو، فەوتاو (بۆمێ).

**ضایق**- ص.ع(زایغ- zayix): تەنگ.

**ضب**- ا.ع(زەبب- zebb): مارمێلکه، بزن مژەک.

**ضب**- ا.ع(زەبب- zebb): رق و کینەی لە دڵدا پەنهان، دڵڕەشی.

**ضباب**- ا.ع(زەباب- zebab): تەمومژ، تەمتومان.

**ضبار**- ا.ع(زوبار- zubar): کتێبان، ئیزبارە، فایل.

**ضباط**- ص.ع(زەببات- zebbat): ئەرشیفکردنی ئەوراقی دایەرە لە فایل و پەروەنداندا.

**ضباط**- ا.ع(زوببات- zubbat): پارێزەران، حاکمان، ئەفسەران، بەهێزان.

**ضباع**- ا.ع(زیباء- ziba’): کەمتاران، قەمتاران، کەمتیاران.

**ضبان**- ا.ع(زوببان- zubban): مارمێلکان، بزن مژەکان.

**ضبط**- مص.ع(زەبت- zebt): گرتن، پاراستن، مەحکەم کردن، زەبت و رەبت.

**ضبط صوت**- ا.مر(زەبتی سەوت- zebti sewt): ڕێکۆردەر، تەسجیل.

**ضبع**- ا.ع(زەبع- zeb’): کەمتار، قەمتار.

**ضبع**- ا.ع(زەبوء- zebu’): وشکەساڵ، نەهاتە ساڵ.

**ضبعان**- ا.ع(زیبئان- zib’an): نێرەکەمتیار.

**ضبعانه**- ا.ع(زیبئانه- zibane): مێ کەمتیار، ما کەمتیار، دەڵە کەمتار.

**ضبه**- ا.ع(زەببه- zebbe): مارمێلکەی مێیە، شکۆفەی خورما بەر لە پشکوتن و گوڵ کردن.

**ضج**- مص.ع(زەجج- zecc): بانگ و هاوار لە ترسان.

**ضجاج**- مص.ل.ع(زوجاج- zucac): هاوارکردن، ناڵین و هاوارکردن لە ترسا.

**ضجاج**- ا.ع(زیجاج- zicac): شیلەی درەخت، کەتیرا.

**ضجاج**- ا.ع(زەججاج- zeccac): عاج، شەڵفەی فیل، جۆرە موروویەکە.

**ضجر**- مص.ل.ع(زەجەر- zecer): بێ قەراری کردن، ناڵین، دڵتەنگ بوون، دڵتەنگی، بێزاری، بێقەراری.

**ضجر**- ص.ع(زەجیر- zecir): مەلول، دڵتەنگ، بێ ئارام، بێ ئۆقره، بێزار.

**ضجرت**- ا.ع(زوجرەت- zucret): خەم، خەفەت، بێ ئۆقرەیی، دڵتەنگی، مەلولی.

**ضجور**- ص.ع(زەجور- zecûr): زۆر دڵتەنگ، بێ ئۆقره، زۆر بێزارو بێتاقەت.

**ضجه**- ا.ع(زەججه- zecce): هات و هاواری خەڵکی، شین و زاری، بانگو هاوار.

**ضجیج**- ص.ع(زەجیج- zecîc): بانگ و هاوار لە ترساندا، غەڵبەغەڵپ.

**ضجیع**- ص.ع(زەجیع- zecî’): هاوجێگە، هاوخەو.

**ضجیعه**- ص.ع(زەجیئه- zeci’e): هاوخەو (بۆ مێ).

**ضحاء**- ا.ع(زەهاء- zeha’): نزیکی نیوەڕۆ، کە ڕۆژ بگاتە نزیکی نیوە.

**ضحاک**- ص.ع(زەهـهـاک- zehhak): زۆرخەن.

**ضحایا**- ا.ع(زەهایا- zehaya): قوربانیان.

**ضحک**- مص.ل.ع(زیهک- zihk): پێکەنین، خەنینە، خەنستن.

**ضحکه**- ا.ع(زەهکە- zehke): یەک پێکەنین، خەنینەیەک.

**ضحکه**- ص.ع(زوهکە- zuhke): گەپجاڕ، کەسێک کە خەڵکی پێی پێبکەنن.

**ضحکه**- ص.ع(زوهەکە- zuheke): کەسێ بە خەڵکی پێبکەنێ.

**ضحو**- ا.ع(زەهڤ- zehv): چێشتەنگاو.

**ضحوک**- ص.ع(زەهوک- zehûk): زۆرخەن.

**ضحوه**- ا.ع(زەهڤە- zehve): چێشتەنگاو، چێشتان.

**ضحی**- ا.ع(زوها- zuha): چێشتان، خۆر، هەتاو، چێشتەنگا.

**ضحیه**- ا.ع(زەهییە- zehîye): چێشتەنگاو، مەڕی قوربانی.

**ضخام**- ص.ع(زوخام- zuxam): گەورە، بە کەلەش، قەڵەو، ئەستوور.

**ضخام**- ص.ع(زیخام- zixam): ئەستوورو قەبە.

**ضخامت**- مص.ل.ع(زەخامەت-zexamet): قەبەبوون، قەڵەو بوون، ئەستوور بوون.

**ضخم**- ص.ع(زەخم- zexm): گەورە، قەبە، قەڵەو، ئەستوور، زەبەلاح، کەتە.

**ضخیم**- ص.ع(زەخیم- zexîm): ئەستوور، قەبە، گەورە، زەلام.

**ضد**- ص.ع(زیدد- zidd): دژ، ناساز، ناکۆک، نا تەبا، پێچەوانە.

**ضدید**- ص.ع(زەدید- zedîd): دژ، ناکۆک، هاوتا.

**ضر**- مص.ع(زەڕ- zer): زەرەر گەیاندن، زیان، مەزەڕەت.

**ضراء**- ا.ع(زەڕاء- zera’): زیان، خەسارەت، ناخۆشی، قاتی، تەنگانە، لێقەوماوی.

**ضرائب**- ا.ع(زەرائیب- zerayib): باج و خەراجان، جۆرو نەوع.

**ضرائح**- ا.ع(زەرائیه- zeraih): مەزاران، مەزارگان، گۆڕو قەبران، گڵکۆیان، مەرقەدان.

**ضرائر**- ا.ع(زەرائیر- zerair): کوێران، نابینایان، زەلیلان، مزمەعیلان.

**ضراب**- مص.ل(زیراب- zirab): بەشەڕ هاتن، شەڕە شمشێر.

**ضراب**- ص.ع(زەڕاب- zerrab): کەسێک کە سکە لێبدات.

**ضرابخانه**- ا.مر(زەرابخانە-zerabxane): شوێنی سکە لێدان.

**ضراح**- مص.ع(زیراه- zirah): لەقەلێدان، لوشکەلێدانی چارەوێ، جووتە وەشاندن.

**ضرار**- مص.م.ع(زیرار- zirar): زەرەرگەیاندن، زیان گەیاندن بە یەکتر.

**ضرارت**- مص.ل.ع(زەرارەت-zeraret): نابینابوون، نابینایی.

**ضراط**- مص.ل.ع(زیرات-zirat): تڕین، تڕ کەندن.

**ضراط**- ص.ع(زەرات- zerat): تڕکەن.

**ضراعت**- مص.ل.ع(زەرائەت- zera’et): پاڕانەوە، کورووزانەوە، لالانەوە.

**ضراغم**- ا.ع(زەراغیم- zeraxim): شێران، شێرانی دڕندە.

**ضرام**- ا.ع(زیرام- ziram): چیلکە، دەستەچیلە.

**ضراوت**- مص.ل.ع(زەراڤەت-zeravet): حەسود بوون، چاوچنۆک بوون، خوگرتن، راهاتن لەسەر شتێ.

**ضرب**- مص.م.ع(زەرب- zerb): لێدان، کەڕەت (×).

**ضربات**- ا.ع(زەرەبات- zerebat): لێدان، جەزرەبە.

**ضـــــربان**- مـص.ل.ع(زەرەبان-zereban): لێدان، لێدانی دڵ.

**ضربت**- ا.ع(زەربەت- zerbet): یەک لێدان.

**ضربخانه**-ا.مر(زەربخانە-zerbxane): شوێنی لە سکەدانی زێڕو زیو.

**ضـرب خـوردن**- مـص.ل(زەرب خـوردن- zerb xûrdn): ئازار دیتن، جەزرەبە خواردن.

**ضـرب خـورده**- ص.مف(زەرب خـوردە- zerb xûrde): لێدراو، جەزرەبە خواردوو.

**ضــــرب دیـدن**- مـص.ل(زەرب دیـدەن- zerb dîden): ئازار دیتن.

**ضــــرب دیـده**- ص.مـف(زەرب دیـدە- zerb dîde): جــەزرەبە دیتــوو، ئازار پێگەییــوو، جەزرەبە دیدە.

**ضرب زدن**- مص.م(زەرب زەدەن- zerb zeden): لێدان، لێدانی کەسێک.

**ضرب گرفتن**- مص.م(زەرب گـیریفـتـەن- zerb giriften): تەپڵ ژەن، تەپڵ لێدان.

**ضربه**- ا.ع(زەربە- zerbe): یەک لێـدان، یەک زەربە، برین، زام.

**ضـربی**- ا.ص.ع(زەربی- zerbî): جـۆرە تاق یان گومەتێکە کە بە کەرپوچ بچنرێ، ئاوازێک کە بەتەپڵ لێ بدرێ، ئامـێـری زەربی: دەفـو دەهۆڵو تەپڵ و دونبک.

**ضرر**- ا.ع(زەرەر- zerer): زەرەر، زیان.

**ضـررزدن**- مص.م(زەرەر زەدەن- zerer zeden): زیان لێدان، خەسارەت لێدان.

**ضررکشـیدن**- مص.ل(زەرەر کەشـیدەن- zerer keşîden): زەرەرکردن، خـەسارەت کـردن، زیان کردن.

**ضــــرس**- ا.ع(زیـرس- zirs): ددانی هـاڕەر، کـاکـیلە، بارانی کـەم، گـردی ناهەمـوار کـە سەرکەوتنی زەحمەت بێ.

**ضــــرس**- ص.ع(زەریس- zeris): تـونـدە تەبیـعـەت، پیـاوی سەفەر کردوو جەنگ جەربێتن،

بەدخوو.

**ضرطه**- ا.ع(زەرتە- zerte): تڕ، تڕێک.

**ضرع**- ا.ع(زەرع- zer’): مەمک، گوانی مەڕو مانگا.

**ضـرع**- ا.ع(زیرع- zir’): هاوتا، وەکـویەک، چوونیەک.

**ضـــــرع**- مص.م.ع(زەرع- zer’): رامکردنی ئەسپ، لالانەوەو پاڕانەوەو کوڕووزانەوە.

**ضرغام**- ا.ع(زیرغام- zirxam): شێر، پیاوی ئازا، دلاوەر، بوێر.

**ضرغم**- ا.ع(زەرغەم- zerxem): شێر، شێری دڕندە.

**ضـرم**- مص.ع(زەرەم- zerem): هەڵایســانی ئاگر، برسی بوونی زۆر.

**ضرم**- ا.ع(زیرم- zirm): جۆرە درەختێکی بۆن خۆشە.

**ضرم**- ا.ع(زەریم- zerim): بێچووە هەڵۆ.

**ضـروب**- ا.ع(زوروب- zurûb): لێــدان، (بـۆ کۆ)، جۆر.

**ضروب**- ص.ع(زەروب- zerûb): لێدەر.

**ضــــــرور**-ص .ع(زەرور- zerûr): زەروور، پێویست.

**ضـــــــرورات**- ا.ع(زەرورات- zerûrat): پێداویستیان.

**ضــــــرورت**- ا.ع(زەرورەت- zerûret): پێداویستی، شتێ کە پێویستت پێی بێ.

**ضــروری**- ص.ع(زەروری- zerûrî): زەروری، پێویست.

**ضـروریه**- ص.ع(زەروریـیــە- zerûriye): هەر شتێ زەروری و پێویست بێ.

**ضروس**- ا.ع(زوروس- zurûs): ددانی هاڕەر، کاکیلە.

**ضروع**- ا.ع(زوروع-’zurû): گوان، گوانان.

**ضره**- ا.ع(زەرە- zere): پێـویسـتی، مـەمک، هەوێ.

**ضـــریب**- ا.ص.ع(زەریب- zerîb): لێـــدەر، دەستوەشێن، بە زەبر، هاوتا، جۆر، لێدراو.

**ضریبه**- ا.ع(زەریبە- zerîbe): سروشت، خوو، عـادەت، خەسـڵـەت، باج و خـەراج، لێـدراو بە شمشێر.

**ضریح**- ا.ع(زەریهـ- zerîh): گـۆڕ، قـەبر، ئەو گومەزەی بۆ گۆڕ دەکرێ، مەرقەد، مەزارگە، گلکۆ.

**ضـریر**- ص.ع(زەریر- zerîr): کـوێر، نابینا، لەڕولاواز، نەخۆش‌و لاواز.

**ضریره**- ص.ع(زەریرە- zerîre): کوێرە، نابینا (بۆ مێ) ژنی نەخۆش و لاواز.

**ضـــریع**- ص.ع(زەریع- zerî’): ژنی مـەمک گەورە، مەڕی گوان گەورە.

**ضریع**- ا.ع(زەریع- zerî’): پەردەیەکی ناسکی سەر ئێسقانە.

**ضـــــــــــریـع**- ا.ع(زەریــع- zerî’): گـیـایەکی بۆن ناخـۆشـە، دڕکی دار خـورمـا، داری وشک.

**ضریم**- ا.ع(زەریم- zerîm): سوتاو، ئاگر.

**ضـعـاف**- ص.ع(زیئـاف- ziaf): لاوازان، بێ توانا، لەڕو لاوازو سست.

**ضعف**- مص.ل.ع(زەئف- ze’f): سست بوون، بێ جورم، کەم نموود، بێ توانابوون.

**ضعف**- ص.ع(زیئف- zi’f): دوو چەنانە، دوو بەرانبەر، دوو هێندە.

**ضعفاء**- ص.ع(زوئەفا- zuefa): لاوازان، بێ جورمان، بێ توانایان، کەم نمودان.

**ضعیف**- ص.ع(زەئیف- zeîf): لاواز، سست، بێ توانا، بێ دەسەڵات، بێ جورم.

**ضـعـیف چزان**- ص.فـا (زەئیف چیـزان- zeîf çizan): لاواز کـــوژ، ئەوەی بێ تواناو لاوازان ئازار بدات.

**ضعـیـفـه**- ص.ع(زەئیـفـە- zeîfe): زەعـیـفـە، ئافرەتی سست و بێ دەسەڵات.

**ضـغـائن**- ا.ع(زەغـائین- zexain): کـەرب و کینە،

**ضغث**- ا.ع(زیغس- zixs): چەپکە گیای تەڕو وشک پێکەوە، ئاڵۆزکاو، کـاری تێکەڵ و پێکەڵ و نیوەچڵ.

**ضـــغط**- مص.م.ع(زەغت- zext): گـــوشین، لێدان، تەنگاوکردن، پاڵەپەستۆ، گوشار.

**ضـــغطه**- ا.ع(زوغـــتـــە- zuxte): دژواری‌و تەنگی و گوشـار، ڕەنجـو زەحـمـەت، مەشـەقـەت، ناچاری، ناچار کردن.

**ضـــغن**- مص.م.ع(زەغـــەن- zexen): رق هەڵگرتن لە کەسێک، کینە، رک کین.

**ضغن**- ا.ع(زیغن- zixn): رق، کینە، کەرب.

**ضغینه**- ا.ع(زەغـینە- zexîne): رق، کـینە، کەرب.

**ضفادع**- ا.ع(زەفـادیع- zefadi’): قـورباقـان، بۆقان.

**ضفدع**- ا.ع(زەفدەء- zefde’): بۆق، قورباقە.

**ضـفـیـر**- ا.ع(زەفـیـر- zefîr): رسـتی لە مـو بادراو، تەنگی کورتان، کەناری دەریا، چەپکەقژی هۆنراو، گێسووی هۆنراو..

**ضفیره**- ا.ع(زەفیرە- zefîre): پرچ، کەزی.

**ضل**- ا.ع(زەلل- zell): گومڕا.

**ضـلال**- مص.ل.ع(زەلال- zelal): گـوم بوون، گوم کردنی ڕێ، گومڕابوون.

**ضـــــلالت**- مـص.ل.ع(زەلالـەت-zelalet): گومڕابوون.

**ضلت**- ا.ع(زەللەت- zellet): ســەرســامی، سەرگەردانی، حەیرمان، داماوی.

**ضلـع**- ا.ع(زیـلء- zil’): لا، لایەکـــــــانی چوارگۆشە، پەراسوو.

**ضلل**- ا.ع(زەلەل- zelel): گـومـڕایی، ئاوێ کـە بەبن تاوێران یان درەختاندا بڕواتو تاو لێی نەدات.

**ضلوع**- ا.ع(زولوء- zulû’): لا، پەراسووان.

**ضلول**- ص.ع(زەلول- zelûl): گومڕا،

**ضلیع**- ص.ع(زەلیع- zelî’): پیـاوی کـەتەو بەهێز، پیاوێ کە پەراسووەکانی قایمو بەهێز بێ.

**ضليل**- ص.ع(زەلیل- zelîl): گومڕا.

**ضلیل**- ص.ع(زیللیل- zillîl): زۆر گومڕا.

**ضم**- مص.م.ع(زەمم- zemm): کۆکردنەوە، خڕکردنەوە، خڕکردنەوەی چەند شتێک لە یەک شوێندا، بۆر دانان بۆ وشە.

**ضمائر**- ع(زەمائیر- zemair): ویژدان، ناخ، باتین، راناو.

**ضمائم**- ص.ع(زەمائیم- zemaim): پاشکۆیان.

**ضماد**- ا.ع(زەماد- zemad): زامبەند، (پەڕۆیەک کە زامی پێ ببەستن)، مەرهەمێ لە برینان بنرێ، مەرهەمی سەر برین.

**ضمار**- ا.ع(زیمار- zimar): پەنهان، سامانی پەنهان، سامانێ کە لە دەست چوو بێ و ئومێدی گەڕانەوەی نەبێ، قەرزو بەڵێنێ کە پشتی پێ نەبەسترێ.

**ضمان**- مص.م(زەمان- zeman): زامن کردن، کەفیلی کردن، زەمانەت کردن.

**ضمانت**- مص.ل(زەمانەت-zemanet): دووچاربوون بە نەخۆشییەکی دایمی کە جار بە جار توندی بکاتو ببێتە مایەی کەوتنی نەخۆش لە جێگەدا، بوون بە کەفیل، زەمانەت کردنی کەسێک.

**ضمر**- ص.ع(زەمر- zemr): پیاوی خۆش ئەندامی ناو قەد باریک.

**ضمر**- ا.ع(زومور- zumur): داڵەگۆشتی، لاوازی.

**ضمره**- ص.ع(زەمرە- zemre): ژنی خۆش قیافەی ناوقەد باریک.

**ضمن**- ا.ع(زیمن- zimn): دەروون، ناوەوە، ناو، ناوی شتێک، میان، (لە میانی قسەدا).

**ضمن**- ص.ع(زەمین- zemin): نەخۆشی لە جێگەدا کەوتوو، زەمینگیر، ئاشق.

**ضمور**- مص.ع(زومور- zumûr): لەڕو داڵە گۆشت بوون، پووکانەوە.

**ضمه**- ا.ع(زەممە- zemme): بۆر، بۆری سەر حەرفان.

**ضمیر**- ا.ع(زەمیر- zemîr): زەمیر، ویژدان، ناخ، راناو: لکاو، جیا.

**ضمیم**- ص.ع(زەمیم- zemîm): هاوڕێ، پاشکۆ.

**ضمیمه**- ص.ع(زەمیمە- zemîme): هاوڕێ، پاشکۆ.

**ضمین**- ص.ع(زەمین- zemîn): زامن، کەفیل، نەخۆشی زەمینگیر.

**ضنائن**- ا.ع(زەنائین- zenain): شتی نایاب و ناوازەو گران بەها کە لەبەر دەگمەنی نەدرێ بە کەسی دی، شتی زۆر تایبەتو دەگمەن.

**ضنین**- ص.ع(زەنین- zenîn): بەغیل، چروک، رژد، ناکەس بەچە، هەتیوچە.

**ضوابط**- ا.ع(زەڤابیت- zevabit): یاساو ڕێسا، زەبتو ڕەبتان.

**ضواحک**- ا.ع(زەڤاهیک- zevahik): ددانێن پێشەوە کە لە دەمی پێکەنیندا دەردەکەون.

**ضواحی**- ا.ع(زەڤاهی- zevahî): ئاوەدانی دەوروبەری شار، بەرز، ئاشکراو دیار، خوویا.

**ضوارب**- ا.ع(زەڤاریب- zevarib): تاریکەشەو، شوێنی نزم و هەمواری چرە دارستان.

**ضواری**- ا.ص.ع(زەڤاری- zevarî): گیانلەبەرانی دڕندەی وەک: شێرو بەورو گورگ و...، هۆڤان.

**ضوء**- ا.ع(زەوء- zew’): نور، روناکی، رۆشنایی، روناهی.

**ضوضاء**- ا.ع(زەوزاء- zewza’): هەراو زەنا، هەراو هەنگامە، هات و هاوار، ژاوەژاو.

**ضومر**- ا.ع(زەومەر- zewmer): جۆرە گیایەکە، ڕێحانە.

**ضومران**- ا.ع(زەومەران- zewmeran): ڕێحانە، نەعنا.

**ضیهاء**- ص.ع(زەیهاء- zeyha’): ژنی نەزۆک، ژنێ کە مەمک و شیری نەبێ، دەشتی رووتەنی بێ گیا، قاقڕ، وشترالوک.

**ضیاء**- ا.ع(زیبا ء- ziya’): نور، ڕۆشنایی، روناهی.

**ضیاع**- مص.ل.ع(زەیا ء- zeya’): لەناوچوون، زایە بوون، فەوتان، گومبوون.

**ضیاع**- ا.ع(زیبا ء- ziya’): زەوی بە پیت و بەرەکەت.

**ضیاع**- ص.ع(زیبا ء- ziya’): زایەبوو، لەدەست چوو، لە ناوچوو، فەوتاو.

**ضیاغم**- ا.ع(زەیاغیم- zeyaxim): شێرێن دڕندە.

**ضیافت**- مص.ل.ع(زیبافەت-ziyafet): چوونە میوانی، میوانداری.

**ضیاگستر**- ص.فا(زیباگوستەر- ziyaguster): ڕۆشنایی بەخش، ڕۆشنایی دەر.

**ضیعات**- ا.ع(زەیئات- zeyat): زەوی‌و زاری کشتوکاڵی بەپیت‌و بەرەکەت.

**ضیعت**- ا.ع(زەیئەت- zeyet): زەوی‌و ئاوی کشتوکاڵی، زەوی بەپیت، پیشەی پیاو.

**ضیغم**- ا.ع(زەیغەم- zeyxem): شێر.

**ضیف**- ا.ع(زەیف- zeyf): میوان، میڤان.

**ضیق**- مص.ل.ع(زیغ- zix): تەنگ بوون، دەست نوقان، ڕەزیل بوون، بەغیلی، پیسکەیی.

**ضیق**- ص.ع(زەییغ- zeyyix): تەنگ، تەسک.

**ضیغت**- ا.ع(زەیەغەت- zeyexet): زەیەقەت، دەستکورتی، هەژاری، بێ نەوایی.

**ضیم**- ا.ع(زەیم- zeym): ستەم، زوڵم، جەفا.

**ضمیران**- ا.ع(زەیمەران- zeymeran): ڕێحانە.

**ضیوف**- ا.ع(زویوف- zuyûf): میوانان، میڤانان.

# ط

**ط- حر (تا- T):**
پیتی نۆزدەیەمی ئەلفبای فارسییە، کە بە (تا) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (٩)، ئەم پیتە تایبەتی زمانی عەرەبییەو لە چەند وشەیەکی فارسیشدا لەبری (ت) بەکار هاتگە.

**طائر-** ا.فا.ع(تائیر- tair): باڵندە، فڕندە، تەیر، مەل، پەلەوەر.

**طائره-** ا.فا.ع(تائیره- taire): تەیارە، فڕۆکە، باڵەفڕ.

**طائش-** ص.ع(تائیش- taiş): سوک و سەلیم، بێ ئەقڵ، سەخیف، سەرەڕۆ، ئەقڵ سوک، ملهوڕ.

**طائع-** ص.فا(تائیء- tai'): گوێڕایەڵ، موتیع.

**طائف-** ص.فا(تائیف- taif): تەوافکار، کەسێک بە دەوری شوێنێکدا بگەڕێ، شەوگەڕ، حەسحەس.

**طائفه-** ص.فا(تائیفە- taife): توافچی (بۆمێ)، تایەفە، تیرە، دەستە، کۆمەڵە خەڵکێک کە دابو نەریتو خووخدەو ئاکارو مەزەبو ئاینیان یەک بێ.

**طائفی-** ص.ن(تائیفی- taifî): خەڵکی تایف، (کە شارێکە لە حیجاز).

**طائل-** ا.ع(تائیل- tail): فەزڵ، فایدە، سوود، دەوڵەمەندی.

**طائله-** ا.ع(تائیلە- taile): توانا، سود، فەزڵ، کینە، دژمنایەتی.

**طائی-** ص.ن.ع(تائی- ta'i): سەر بە قەبیلەی تایی کە حاتەمی تایی لەوان بووە.

**طاب-** ص.ع(تاب- tab): پاک، خۆش، پاکیزە، حەڵاڵ.

**طاباق-** ا.ع(تاباغ- tabax): تابوگ، خشتی سورەوەکراو، کەرپووچ.

**طابخ-** ا.فا(تابیخ- tabix): ئاشچی، شیوکەر، تای توند.

**طابرانی-** ص.ن(تابیرانی- tabiranî): خەڵکی تابران (کە ئاواییەکی سەر بە توسی خوراسانە).

**طابع-** ا.فا(تابیء- tabi'): چاپکار، چاپچی، خوو، سروشت، تەبیعەت.

**طابع-** ا.ع(تابیء- tabi'): خەتم، موستیلە، مۆر، تەمغە، پول.

**طابق-** ا.ع(تابەغ- tabex): تاوە، کەرپوچی گەورە.

**طاجن-** ا.ع(تاجین- tacin): تاوە.

**طاحن-** ا.فا(تاهین- tahin): گای خەرمان کوت، ئاش.

**طاحنە**- ا.فا (تاهینە- tahine): ددان، کەڵبە.

**طاحون**- ا.ع(تاهون- tahûn): ئاش، ئاسیاو.

**طارف**- ا(تاریف- tarif): سـامـانی تازە بەدەست هاتوو.

**طارفە**- ا.ع(تاریفە- tarife): مالّی زۆر کە تازە بەدەست هێنرابێ.

**طارق**- ا.فا(تاریغ- tarix): ئەوەی بە شەو بڕوات، هەر شتێ بە شەو دەربکەوێ، دز، فالّچی، ئەستێرەی بەیانی.

**طارقە**- ا.فا.ع(تاریغە- tarixe): قەوماو، بەلا، کەسوکاری پیاو.

**طارم**- ا(تارەم- tarem): خێوەت، سەراپەردە، گومەز، خانووی دارین، تەیمان، قایەمیتو، ئاسمان.

**طارمی**- ا(تارەمی- taremî): تەیمان، موحەجەرەی بەردەم هەیوان یان دەوری باخچەو...

**طارونی**- ا.ع(تارونی- tarûnî): جۆرە جلێکی حەریرە.

**طاری**- ا.فا.ع(تاریئ- tarî'): ڕووداوێکی لە پڕ، شتێکی ناوەخت، ڕووداوێکی لەنکاو، کەسێک لە پڕ بێ یان پەیدا بێ.

**طاریە**- ا.فا.ع(تارییە- tarîye): بەلاو پێشهاتی لەپڕ.

**طاس**- ا(تاس- tas): تاس، کاسەی مسی.

**طاس**- ص(تاس- tas): سەری ڕووتاوە بە هۆی کەچەڵی یان شتێکی دی.

**طاس**- ا(تاس- tas): زاری نەردێن.

**طاسباز**- ص.فا(تاسباز- tasbaz): کەسێک زارێن بکات، قومارکردن بە زار، حیلەباز.

**طاس بین**- ص.فا(تاسبین- tasbîn): فالّگرەوە بە تاس.

**طاسک**- ا.(تاسەک- tasek): تاسی بچووک، لەرزانەی زێڕ یان زیو، زەنگۆڵەی زێڕ یان زیو کە لە ملی ئەسپ بکرێ، زاری نەردێن.

**طاس کباب**- ا.مر(تاس کەباب-tas kebab): تاس کەبابی، جۆرە خواردنێکە بە گۆشتو پەتاتەو پیازو بەهارات دروست دەکرێت.

**طاس لغـزنده**- ا.مـر(تاسی لەغـزەندە- tasi lexzende): تاسی لوس، تاسی مسین، کاسەی مس.

**طاع**- ص.ع(تاء- ta'): گوێڕایەڵ، ملکەچ.

**طاعـات**- ا.ع(تائات- ta'at): تاعـەت و عیبادەت، خواپەرستی.

**طاعت پیشە**- ص.مر(تاعەت پیشە- ta'et pîşe): ئەوەی تاعەتو عیبادەت بکا بە پیشەی خۆی.

**طاعت ور**- ص.مـر(تائەت ڤەر- ta'et ver): موتیع، گوێڕایەڵ، تاعەت پیشە.

**طاعم**- ص.فا(تائیم- ta'im): خواردە، خۆش خۆراک، حاڵ باش لە خوردو خۆراکدا.

**طاعن**- ا.فا.ع(تائین- ta'in): سەرزەنشتکار، تانەلێدەر، نێزەوەشێن.

**طاعون**- ا.ع(تائون- ta'ûn): نەخۆشییەکی خەتەرناک و کوشندەیە، تاعون، چاوە قووڵە.

**طاغوت**- ا.ع(تاغوت- taxût): بت، سەنەم، زاڵم، سەرکێش، هەر پەرستراوێکی غەیرەز یەزدان، تەعەداکار.

**طاغی**- ا.فا.ع(تاغی- taxî): زاڵم، یاخی، سەرکێش، ستەمکار.

**طاغیە**- ا.فا.ع(تاغییە- taxîye): یاخی (بۆ مێ)، زۆر زاڵم، گونەسەنە، کەودەن، لەخۆبایی، بێدادی، هەورە بروسکە.

**طافح**- ص.فا.ع(تافیە- tafih): پڕاوپڕ، کەیل، لێوڕێژ، مەستی مەست، مەستی بێ ئاگا.

**طافحە**- ص.فا.ع(تافیهە- tafihe): بڕوانە (طافح)، هەر شتێکی وشک.

**طاق**- ا(تاغ- tax): تاق، میچی بە کەوانە، (تاقی ئاسمان).

**طاق**- ص(تاغ- tax): تاک، یەک دانە، بێ وێنە.

**طاق**- ا.ع(تاغ- tax): جبە.

**طاق**- ا(تاغ- tax): داو، یەک تاڵی پەت،

چەپکێک قژ، چەپکێک ڕێحانە، دەستێک جل.

**طاق ابرو**- ا.مـر(تاغی ئەبرو- taxi ebrû): تاقی برۆ، کەوانی برۆ.

**طاق ازرق**- ا.مر(تاغی ئەزرەغ-taxi ezrex): ئاسمان، تاقی ئاسمان.

**طاقباز**- ا.مر (تاغباز- taxbaz): لەسەر گازی پشت، بە پشتا خەوتن، بە پشتا پاڵ کەوتن.

**طاقت**- ا.مص.ع(تاغـەت- taxet): تاقـەت، هێزوتوان، سەبرو حەوسەڵە.

**طاقت زدا**- ص.فـــا(تـاغـــەت زەدا- taxet zeda): تاقەت بەر.

**طاقت شکن**- ص.فا(تاغـەت شـیكەن- taxet şiken): تاقـەت بەر، تاقـەت پروكێن، تاقـەت شكێن.

**طاقت فـرسا**- ص.فـا(تاغـەت فـەرسا- taxet fersa): تاقـەت بەر، ئەوەی كـە تواناو تاقـەت ببات.

**طاقـچە**- ا(تاغـچە- taxçe): تاقی بچـووک لە دیواردا.

**طاقـدیس**- ا.ص(تاغـدیس- taxdîs): تاق ئاسا.

**طاق نصـرت**- ا.مـر(تاغی نوسـرەت- taxi-nusret): تاقی سـەركـەوتن، تاقـێكە كـە لە جەژنان یان لە پێشوازی پاشایاندا دادەنرێ.

**طاق نما**- ا.مـــر(تاغ نـەمـــا- taxnema): هەیوانی بچووكی بەردەم ئۆدە.

**طاق و طرم**- ا.مر(تاغ و تورم- taxû turm): فەروشكۆ، هێرش و كـشـانەوەو خۆنواندن، تاقاو تریق.

**طاقـە**- ا.ع(تاغـە- taxe): داو، تاڵ، هەودا، چەپكی ڕێحـانە، دەسـتـێک جل، یەک داوی پەتێک.

**طاقی**- ا(تاغی- taxî): جۆرە كڵاوێكە.

**طالب**- ا.فـــا(تالیب- talib): خـــوازیار، داواكار، قوتابی.

**طالبی**- ص.ن.ع(تالیـبی- talibî): سـاداتی نەوەی عـــەلی كـــوڕی ئەبی تالیب یان نەوەی جەعفەر و عەقیل-ی برای.

**طالبی**- ا(تـالیـــــبی- talibî): جـــۆرە گـوندۆرەیەكـە تۆكـڵـەكـەی زەردێكی كـوز كـوزە (حەوت مانگی).

**طالح**- ص.فـــا.ع(تالیـــه- talih): مـــرۆڤی بەدكردەوە، خراپ، تاوانكار، بەدكار، بەدعەمەل.

**طالسـان**- ا(تالیـســان- talisan): جـۆرە عەبایەكە، جبە.

**طالع**- ا.فـــا.ع(تالیء- tali’): تالح، بەخت، یەغباڵ، شانس، مانگی نوێ.

**طالع بین**- ص.فـــا.ع(تالیء بین- tali’ bîn): بەخت گرەوە، فاڵگرەوە، فاڵچی.

**طالع منـد**- ص.مـــر(تالیء مـــەند- tali’ mend): بەشانس، بە بەخت، شانسدار.

**طالع مـیمـون**- ص.مـر(تالیئی مەیمون- tali’i meymûn): بەختی چاک.

**طالق**- ص.ع(تالیغ- talix): ژنی تەڵاقدراو.

**طالیـقـون**- ا(تالیـغـون- talixûn): هەفت جۆش.

**طامــات**- ا.ع(تامات- tammat): ڕووداوی گـەورەو بەڵای قـورس، وێردو قـسـەی سـۆفـیـان، وڕاوەی هەندێ لە سۆفی و دەروێشـان، پەسـڵان، ڕۆژی قیامەت.

**طامح**- ص.ع(تامـــیـــه- tamih): ژنی سـەركـێش، ژنی چاو لەدەر، ژنی چاو لەوەڕێن، ژنی چاوباشقاڵ، بەرز.

**طامع**- ا.فـــا.ع(تامـیئ- tami’): تەمـاعكار، چاوچنۆک، حەسوود، بە تەماع.

**طامـعـە**- ا.فـــا.ع(تامـیئـە- tami’e): ژنی تەماعكار، چاوچنۆک، قرچۆک، ڕژد.

**طامور**- ا.ع(تامور- tamûr): تۆمار.

**طامە**- ا.ع(تامە- tamme): بەڵا، بەڵای هەرە گەورە، قیامەت، ڕۆژی پەسڵانێ.

**طاووس**- ا.ع(تاڤوس- tavûs): مەلێکە لە جۆری مریشک، بە پەڕە جوانەکانی بەناوبانگە، نێرەکەی کلکێکی درێژی چەتری ڕەنگاو ڕەنگی هەیە، پەڕەکانی لە هەوەڵی هاویندا دەوەرێو پاشان دەڕوێتەوە، مێیەکەی لە ساڵی سێیەمدا هێلکە دەکات، لە ساڵێکدا ٤- ٦ هێلکە دەکاتو نزیکەی یەک مانگ لەسەر هێلکەکانی دەکەوێو بێچووەکانی کە بوون بە سێ مانگ ئیدی نێرو مێیان دەردەکەوێ، لە سێ ساڵیدا بالق دەبنو ئامادە دەبن بۆ جووتبوون، نێرەکەی لە سێ ساڵیدا نەشونمای پەڕی کلکی تەواو دەبێ، ئەسڵی ئەم مەلە لە هندوستانو مالیزییە، لە سەدەکانی ناڤینەدا دەوڵەمەندانی ئەورووپا لە میوانداریەیە بەشکۆکانی خۆیاندا گۆشتی تاووسیان دادەنا، بەڵام گۆشتەکەی زۆر خۆشو بەتام نییە، تاووس پتر لەبەر جوانییەکەیو بۆ جوانی لە کۆشکو باخە تایبەتییەکاندا بەخێو دەکەنو نزیکەی ٣٠ ساڵ دەژی، هەندێ کەس ڕاگرتنی تاووس لە ماڵەوە بەشووم دەزانن، دەڵێن تاووس باعیسی وەدەرنانی ئادەم و حەوا لە بەهەشت بووە.

**طاووس پیکر**- ص.مر(تاڤووس پەیکەر- tavûs peyker): ئەندام جوان و ڕەنگین وەکو تاووس.

**طاووس خرام**- ص.مر(تاڤووس خورام- tavûs xuram): تاووس ڕەفتار.

**طاووس وار**- ق.ص(تاڤووس ڤار- tavûs var): تاووسانە، چوون تاوس، تاوس ئاسا.

**طاووسی**- ص.ن(تاڤووسی- tavûsî): تاوسی، سەوزی زێڕین، جۆرە جلێکی ڕەنگینە، ڕەنگین وەکو ڕەنگی پەڕی تاوس.

**طاووسی**- ا(تاڤووسی- tavûsî): دەوەنێکە لقی باریکی سەوز باوو گەڵای باریکو سادەو گوڵی زەردی بۆن خۆشی هەیە، لە گوڵی ئاقاقیا دەچێ.

**طاووسی**- ص.ن(تاڤووسی- tavûsî): طاهر- ص.ع(تاهیر- tahir): پاک، پاکژ.

**طاهره**- ص.ع(تاهیرە- tahire): پاکژ، ژنی پاک، ژنی پاکو بێ عەیب و عار.

**طایر**- ا.فا.ع(تایر- tayîr): تەیر، باڵندە، فڕندە.

**طایفه**- ا.ع(تایفە- tayîfe): تایفە، تیرە، دەستە.

**طب**- مص.م.ع(تیب- tib): چارەکردن، دەرمان کردن، مالیجەکردنی بەدەنو دەروون.

**طبابت**- ا.ع(تیبابەت- tibabet): پیشەی پزیشک، پزیشکی، دەرمانکردن و جۆری مالیجەی نەخۆشینی جۆراوجۆر.

**طباخ**- ص.ع(تەبباخ- tabax): ئاشچی، چێشتکەر.

**طباخت**- ا.ع(تیباخەت- tibaxet): ئاشچێتی، چێشتچێتی، پیشەی چێشتچی.

**طباخه**- ا.ع(توباخە- tubaxe): کەفو چەوری سەری مەنجەڵ.

**طباطبا**- ا(تەباتەبا- tebateba): نازناوی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە کە کوڕی حەزرەتی ئیمام حەسەن بووەو ساداتی تەباتەبائی دەچنەوە سەر ئەو.

**طباع**- ا.ع(تیباء- tiba’): سروشت، تەبیعەت، خوو.

**طباع**- ص.ع(تەبباء- tebba’): چاپکار، تەمغەچی، شمشێرساز، گۆزەگەر، خودان تەبیعەتی زیرەک.

**طباعت**- ا.ع(تیبائەت- tiba’et): پیشەی چاپکردن، هونەری چاپ، شمشێرسازی.

**طباق**- مص.م.ع(تیباغ- tibax): پێکگرتنی دوو شت، بەرانبەر، سنعەتێکی شیعرییە.

**طبال**- ص.ع(تەببال- tebbal): تەپڵژەن، دەهۆڵکوت.

**طبایع**- ا.ع(تەبایء- tebayî’): تەبیعەت، سروشت، خوو.

**طبایعی**- ص.ن.ع(تەبایئی- tebayî’î): جۆرە فەلسەفەیەک بوو کە تەبیعەتی بە خولقێنەری جیهان دەزانی.

**طبخ**- مص.م.ع(تەبخ- tebx): خواردن لێنان.

**طبـــرانی**- ص.ن.ع(تەبەرانی-teberanî): خەڵکی شاری تەبەریەی شام.

**طبـــرخـــون**- ا(تەبەرخـــون- teber xûn): عەنناب، سنجو، سرینچک، سورەبی.

**طبـرزد**- ا(تەبەر زەد- teber zed): قـەند یان نەباتی رەق، قەندی کولاو، جۆرە رووەکێکە.

**طبـــرزین**- ا.مـــر.ع(تەبەرزین-teberzîn): تەورزین.

**طبـــــرسی**- ص.ن.ع(تـەبەرسی-tebersî): خەڵکی تەبەرستان (مازندەران).

**طبــــــــری**- ص.ن.ع(تـەبـەری- teberî): تەبەرستانی.

**طبطاب**- ا.ع(تەبتاب- tebtab): قاشۆ.

**طبطبـــــه**- مص.ع(تەبتـــــەبە- tebtebe): تەپەتەپی پێ لە کـاتی غـارداندا، دەنگی سێلاو، شلّپو هوری پێکادانی شەپۆلان، دەنگی قامچی.

**طبع**- مص.م.ع(تەب‌ء- teb’): مـــۆرکـــردن، مۆرکردنی نووسراو، چاپکردن.

**طبع**- ا.ع(تەب‌ء- teb’): خوو، سروشت.

**طبع ازما**- ص.فا(تەبع ئازما- teb’ azma): شـاعـیـرێک کـە تەبعی خـۆی تاقی بکـاتەوە، شـاعـیـرێک کـە قـەریحـەو سـەلیـقـەی خـۆی بجەربێنێ.

**طبق**- ا.ع(تیبغ- tibx): بەرانبەر.

**طبق**- ا.ع(تەبەغ- tebex): تەبەق، قــــاپی چێشت خواردن یان میوە.

**طبقات**- ا.ع(تەبەغات- tebexat): چین، پلە.

**طبقچه**- ا.مر(تەبەغچە- tebexçe): قـاپی بچووک، تەبەقۆکە.

**طبـقـری**- ا(تەبقـەری- tebxerî): تەبەقێ کـە میوە یان شتی دی بکرێتە سەر بۆ فرۆشتن.

**طبق کش**- ص.فا(تەبەغ کەش- tebex keş): تەبەقکێش، کەسێک کـە مـیـوە لە تەبەق بکاتو بیخاتە سەر سەرو لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی بەرێ.

**طبــقــه**- ا.ع(تەبەغـــە- tebexe): پلە، چین، دەستە، نهۆم، چینەکانی زەوی.

**طبـقـه بندی**- ا.مص(تەبەغـە بەندی-tebexe bendî): ریزبەندی، چین بەندی.

**طبل**- ا.ع(تەبل- tebl): تەپل، دەهۆڵ.

**طبل خوار**- ص.فا(تەبل خار- tebl xar): زۆر خۆر، مفتەخۆر.

**طبـل زن**- ص.فـــا(تـەبل زەن- tebl zen): دەهولّکوت، دەهۆڵژەن.

**طبلک**- ا.ع(تەبلەک- teblek): تـەپلـــۆکـە، تەپڵی بچووک.

**طبل نواز**- ص.فـــا(تەبل نەڤـــاز- tebl ne-vaz): دەهۆڵژەن.

**طبله**- ا.ع(تەبلە- teble): تـەپڵی بچـــووک، سـەندوقـۆکـە، قـوتی یان شووشە کـە عـەتر فـرۆش بۆنی خۆشی تێ بکات.

**طبن**- ا.ع(توبن- tubn): تەنبـورە، تەمـوورە، عود.

**طبن**- مص.ل.ع(تەبەن- teben): زیرەک بوون، زیرەکی، دانایی.

**طبن**- ص.ع(تەبین- tebin): زیرەک، هوشـیـار، زانا.

**طبول**- ا.ع(توبوول- tubûl): دەهۆڵان.

**طبی**- ا.ع(توب‌ی- tubî): ســــەری گـــوانی چوارپێیان وەکو ماین و ماکەرو گیانلەبەرانی دڕندە.

**طبـــیب**- ا.ص.ع(تەبیب- tebib): پزیشـک، دکتۆر.

**طبـــیــبـــانه**- ق(تەبیــبـــانە- tebibane): پزیشکانە، وەکو پزیشکان.

**طبیبه**- ا.ص.ع(تەبیبـە- tebîbe): پزیشـکی ژن، دکتۆرە.

**طبـیـخ**- ص.ع(تەبیخ- tebîx): هەرشـتـێکی کوڵێنراو یان سورەوەکراو.

**طبیعت**- ا.ع(تەبیعەت- tebî’et): سروشت، تەبیعەت، میزاج، فیترەت.

**طبیعت شناس**- ص.فا (تەبیئەت شیناس- tebi’et şinas): تەبیعەتناس، پزیشکی زیرەک.

**طبیعی**- ص.ن.ع(تەبیعی- tebi’î): پسپۆر لە تەبیعەتدا، زاتی، فیتری، خۆڕسک.

**طبیعیون**- ص.ن.ع(تەبیئیون- tebi’îyûn): ئەوانەی تەبیعەتیان بە سەرچاوەی خەلق داناوە.

**طحال**- ا.ع(تەهال- tehal): سپڵ، فاتەڕەش.

**طحان**- ص.ع(تەهان- tehan): ئاشەوان، لووینە، ئاردفرۆش.

**طحانت**- ا.مص.ع(تیهانەت-tihanet): ئاشەوانی، لووینەیی، ئارد فرۆشی.

**طحاوی**- ص.ن.ع(تەهاڤی- tehavî): تەحاوی، خەڵکی تەحاوە (کە گوندێکە لە میسر).

**طحلب**- ا.ع(توهلەب- tuhleb): قەوزە، گێژ، گوو قورباقە، جلە شینەی سەر ئاو.

**طحن**- مص.م.ع(تەهن- tehn): هاڕین، هاڕینی گەنم یان دانەوێڵەی دی.

**طحین**- ا.ع(تەهین- tehîn): ئارد.

**طر**- ا.ع(تور- tur): لا، هەموو، گشت.

**طرائد**- ا.ع(تەرائید- tera’id): نێچیران،

**طرائف**- ا.ع(تەرائیف- tera’if): شتی تازەونوێ، شتی سوکو ناسکو گرانبەها، نوکتەو قسەی بە توێکڵ.

**طرائق**- ا.ع(تەرائیغ- teraix): ڕێگە، ڕێچکەو ڕێبازان.

**طرابیل**- ا.ع(تەرابیل- terabîl): منارە، بینای بەرز، بەردی گەورە، لوتکەی شاخان، نیشانەیەک کە لە دوورەوە بدینرێ، دێر.

**طرات**- ا.ع(تورات- turrat): پەرچەم، پەراوێز، ڕیشوی سەروپێچ.

**طراح**- ص.ع(تەڕاه- terrah): نیگارکێش، شێوەکار.

**طراد**- ا.ع(تیراد- tirad): کورتەرم، نێزەی کورت.

**طراد**- مص.م.ع(تیراد- tirad): هێرش کردنە سەر یەکدی، پەلاماردانی یەکدی، ڕاونانی یەکدی.

**طراد**- ص.ع(تەڕاد- terad): کەشتی جەنگی تیژڕەو، زۆر خێرا.

**طراده**- ص.ع(تەڕادە- terrade): کەشتی جەنگی تیژڕەو، عەلەم، ئاڵا، بەیداخ، ژنی بەدعەمەل.

**طرار**- ا.ع(تیرار- tirar): پەرچەم، پەراوێز، ڕیشوی شەدە.

**طرار**- ص.ع(تەڕار- terar): گیرفان بڕ، کیسەبڕ، دز، جەربەزە، تەڕدەست.

**طراز**- ا.ع(تیراز- tiraz): پەراوێزی جل، کارگەی حەریرچنی.

**طرازیدن**- مص.م(تەرازیدەن-terazîden): ڕازاندنەوە، ڕێکخستن.

**طرازنده**- ا.فا (تەرازەندە-terazende): ڕێکخەر، ڕازێنەرەوە.

**طرازیده**- ا.مف(تەرازیدە- terazîde): ڕازاوە، نووسراو.

**طراف**- ا.ع(تیراف- tiraf): چادری مشەما، چادری چەرم.

**طرافت**- مص.ل.ع(تەرافەت-terafet): تازەبوون، نوێ بوونەوە.

**طراق**- ا.ع(تیراغ- tirax): پارچەی ئاسن یان پۆڵا کە پان بکرێتەوەو کڵاو خود یان سپەری لێ دروست بکەن.

**طراق**- ا(تەراغ- terax): تراق، تاق، (دەنگ).

**طراقاطراق**- ا.مر(تەراغاتەراغ- teraxa terax): تراق تاق، تاق تراق، (دەنگ).

**طراوت**- مص.ل.ع(تەراڤەت- teravet): تەڕوتازەبوون، تەڕو تازەییو پاراوی.

**طرب**- مص.ل.ع(تەرەب- tereb): شادبوون، شادی و شادمانی.

**طرب اباد**- ا.مر(تەرەب ئاباد- tereb abad): شوێنی تەرەب و شادی، جێی بەزم و خۆشی.

**طرب ارا**- ص.فـا (تەرەب ئارا- tereb ara): گەرم کەری کۆڕی بەزم و شادی.

**طرب اشـیـان**- ا.مـر(تەرەب ئاشـیـان-tereb-aşyan): لانەی شادی و بەزم.

**طرب افـزا**- ص.فـا (تەرەب ئەفـزا- tereb efza): گەرمکەری شادی.

**طربال**- ا.ع(تیـربال- tirbal): منارە، بینای بەرز، تاوێری لوتکەی چیـا، عـەلەم یان نیشانەیەک لە دوورەوە بدینرێ، دێر.

**طرب انگیـز**- ص.فـا (تەرەب ئەنگیـز-tereb-engîz): بەزم وروژێن، ئەوەی ببێتە باعیـسی بەزم و شادی.

**طربخـانە**- ا.مـر(تەرەبخـانە-terebxane): شوێنی بەزم و شادی.

**طرب خیز**- ص.فا (تەرەب خیز- tereb xîz): شوێنێ کە شادی بینێ، شوێنی بەزم ئاوەر.

**طرب رود**- ا.مـر(تەرەب رود- tereb rûd): جۆرە ئامێرێکی ژێداری مۆسیقییە.

**طرب سرا**- ا.مر(تەرەب سەرا- tereb sera): بەزم خانە.

**طرب شکار**- ص.فـا (تەرەب شـیکار-tereb-şikar): ئەوەی ببێتە مایەی بەزمو شادی.

**طربگـاه**- ا.مـر(تەرەبگـاه- tereb gah): تەرەبگە، شوێنی عەیش و نۆش، جێی بەزم و شادی.

**طربناک**- ص.مـر(تەرەبناک-terebnak): شادمان، خۆشحاڵ، بە کەیفو بە دەماخ.

**طربنامـە**- ا.مـر(تەرەبنامـە-terebname): نامەیەک کە باسی کەیفو شادی بکات، نامەیەک کە خوێندنەوەی کەیف بەخش بێ.

**طربیل**- ا.ع(تیربیل- tirbîl): جەنجەڕ.

**طرح**- مـص.م.ع(تـەرە- terh): خـسـتن، دوورخـسـتنەوە، دەرکـردن، لەباربردنی پز، پێشنیازکردن، نەخشە، بابەت.

**طرح افکندن**- مـص.م(تەرە ئەفکەندەن- terh efkenden): نەخشەدانان، بناغەدان.

**طـرح بـنـدی**- ا.مـص(تـەرە بـەنـدی- terh bendî): نەخشەکێشی، ڕێکخستنی شەقامان.

**طرح ریختن**- مص.م(تەرە ریختـەن- terh rixten): نەخشەرشتن، بناغەدانان.

**طرح کـردن**- مص.م(تەرە کـەردەن- terh kerden): تـوڕدان، تـوڕدان، دەرکـردن، نەخشەرشتنی شتێ یان کارێک.

**طرح کش**- ص.فـا (تەرە کـەش- terh keş): وێنەکـێش، شـێـوەکـار، بەزیوو، بەسـتـەزمـان، زەبوون.

**طرخـان**- ا.ع(تورخـان- turxan): سـەرۆک، سەروەر.

**طرد**- مـص.ل.ع(تـەرد- terd): دەرکـردن، وەدەرنان، شاربە دەرکردن.

**طرر**- ا.ع(تورەر- turer): پەرچەمـان، ریشـوی شاشک، پەراوێزی جل.

**طرز**- ا.ع(تەرز- terz): تەرز، شـێـوەو شـێـواز، جۆر، ڕێچکە، ڕێسا.

**طرسـوسی**- ص.ن(تەرسـوسی- tersûsî): خـەڵکی تەرسـوس (کـە شـارێکە لە ئاسـیـای بچوک).

**طـرطـوسی**- ص.ن(تـەرەتـوسی-teretûsî): تەرەتوسی (ناوی شارێکە لە شام).

**طـرطـوشـی**- ص.ن(تـورتـوشـی- turtûşî): تورتوشی، خـەڵکی تورتوش (ناوی شـارێکە لە ئەسپانیا).

**طرف**- ا.ع(تـەرەف- teref): لا، سـەمـت، کەنار، کۆتایی.

**طرف**- ا.ع(تەرف- terf): چاو، گـۆشـەی چاو، قازانج و سوود، ڕوانین لە گۆشەی چاوەوە.

**طـرف**- ص.ع(تـیـرف- tirf): نەجـیـم زادە، ڕەسـەن، ئەسـڵزادە، وەجـاخـزادە، ئەسپی ڕەسەن.

**طرف**- ا.ص(تورەف- turef): قـسـەی خـۆش‌و تازە، نوکتە، حەنەک، نۆباو، تازە.

**طرف**- ا.ع(تورف- turf): خوێن کە دەزێتە ناو چاو، چاوتروکاندن.

**طرف**- ا.ع(تەرف- terf): داوێن، کۆتایی، گۆشەوکەنار، داوێنی کراس، کەمەربەند.

**طرفاء**- ا.ع(تەرفاء- terfa'): دارگەز.

**طرفدار**- ص.فا(تەرەفدار- terefdar): لایەنگر، پەنا، پارێزەر.

**طرفگاه**- ا.مر(تەرف گاه- terf gah): دنیا، جیهان، گێتی.

**طرفگیر**- ص.فا(تەرەفگیر- teref gîr): لایەنگر، پارێزەرو پەنا، پشتو پەنا، گۆشەگیر.

**طرفه**- ا.ع(تەرفە- terfe): پەڵە خوێنێ کە دەزێتە ناو چاو، چاوترکاندن.

**طرفه**- ا.ع(تەرفە- terfe): ئەستێرەیەکە لە شێوەی شێردا.

**طرفه**- ا.ص.ع(تورفە- turfe): هەرشتێکی نوێو باش، نۆباو، حەنەک، نوکتە.

**طرفین**- ا.ع(تەرەفەین- terefeyîn): دوولا، دوو کەنار.

**طرق**- ا.ع(توروغ- turux): رێگایان.

**طرق**- مص.م.ع(تەرغ- terx): لێدان، لێدان بە کوتەک، لێدانی دەرگا، فاڵگرتنەوە بەبەرد، میزکردنی وڵاخ بە پێوەو لە ناو ئاودا.

**طرقاق**- اا(تورغاغ- turxax): پاسدار، چاودێر، پاسەوان.

**طرلان**- ا.ت(تەرلان- terlan): شاباز، جوانی دلڕفێن، تەرلان، جوان چاکی دلڕفێن.

**طرماح**- ص.ع(تیریماه- tirimmah): پیاوی گەورە رەچەڵەکو مەنشوورو ناودار، پیاوی دووربین.

**طرنب**- اا(تورونب- turunb): پەلامارو هەڵاتن و خۆنواندن.

**طروب**- ص.ع(تەروب- terûb): پیاوی بەزمگێرو شادیهێن.

**طروق**- مص.م.ع(توروغ- turûx): هەڵاتنی ئەستێرە، لە دەرگادان، لێدان.

**طروق**- ص.ع(تەرووغ- terûx): رێبوار، رێوان.

**طره**- ا.ع(تورە- turre): نێوچەوان، پەرچەم، ریشوی شاشک، پەراوێز، پاڵدمی جل.

**طرەبازی**- ا.مص(تورەبازی-turrebazî): گەمەیەکی منداڵانە، شێروخەت.

**طری**- ص.ع(تەری- terî): تەرو تازە، بە دەماغ، پاراو.

**طریان**- ا.ع(تیریان- tirîyan): خوان، سفرە، خوانچە، ئامان، ئامانی نان خواردن.

**طریح**- ص.ع(تەریه- terîh): کەوتوو، ترۆکراو.

**طریخ**- ا.ع(تەریخ- terîx): جۆرە ماسییەکی بچووکە سوێر دەکرێ، ماسی ساردین.

**طرید**- ص.ع(تەرید- terîd): نێچیر، دەرکراو، راونراو، هەڵاتوو، ئەوەی لە دوای کەسێکی دی لە دایک ببێ، رۆژی درێژ.

**طریدان**- ا.ع(تەریدان- terîdan): شەوو رۆژ.

**طریده**- ص.ع(تەریدە- terîde): نێچیری راونراو، وشتر یان مەڕی دزراوی ئاوەکی.

**طریر**- ص.ع(تەریر- terîr): کوڕێ تازە خەتی دابێ.

**طریف**- ص.ع(تەریف- terîf): غەریب، دەگمەن، سەیر، هەر شتێکی تازە.

**طریفه**- ص.ع(تەریفە- terîfe): حەنەک، نوکتە، هەر شتێکی غەریبو دەگمەن، قسەی چاک و تۆکلدار.

**طریق**- ا.ع(تەریغ- terîx): رێگە.

**طریقت**- ا.ع(تەریغەت- terîxet): رێبازی ئەهلی سۆفیگەری، تەریقەت.

**طریقه**- ا.ع(تەریغە- terîxe): رەوت و رێباز، حاڵەت، مەزەب.

**طزر**- اا(تەزەر- tezer): تەلار، قەسر، کۆشک، ماڵی زستانە، زستانە هەوار.

**طس**- ا.ع(تەسس- tess): تەشت.

**طساس**- ص.ع(تەسساس- tessas): تەشتساز، تەشتفرۆش.

**طست**- ا.ع(تەست- test): تەشت.

**طسق**- ا.ع(تەسغ- tesx): جۆرە خەراجێکە لە کۆنا لەسەر هەر برە زەوییەکی کشتوکاڵی وەردەگیرا.

**طسوج**- ا(تەسوج- tesûc): جۆرە پارەیەک بووە.

**طشت**- ا(تەشت- teşt): تەشت.

**طعام**- ا.ع(تەئام- te'am): خواردەمەنی، خۆراک.

**طعان**- مص.م.ع(تیئان- ti'an): نیزە لە یەکدی دان، نێزەدان لە یەکتری.

**طعان**- ص.ع(تەئئان- te'an): سەرزەنشتکار، نێزەئەنداز، عەیبگر، تانەلێدەر.

**طعم**- ا.ع(تەئم- te'm): تام، چێژ.

**طعم**- ا.ع(تونەم- tu'em): چەشە، خواردەمەنی، رزقو رۆزی.

**طعمه**- ا.ع(تونمە- tu'me): چەشە، خۆراک، رزق و رۆزی.

**طعن**- مص.م.ع(تەئن- te'n): تانەلێدان، عەیب لێ دۆزینەوە، سەرزەنشت کردن، لۆمەکردن.

**طعن آمیز**- ص.مر(تەئن ئامیز- te'n amîz): تانە ئامێز، لۆمە ئامێز، گازاندە ئامێز.

**طعن کردن**- مص.م(تەئن کەردەن- te'n kerden): تانەلێدان، لۆمەکردن، ئاژنکردن.

**طعنه**- ا.مص.ع(تەئنە- te'ne): جێگەی نێزە لە بەدەندا، سەرکۆنەکردن، یەک لێدانی نێزە، تانەو تەشەر، ئاژن.

**طعنه‌زدن**- مص.م(تەئنە زەدەن- te'ne zeden): سەرکۆنەکردن، ئاژنکردن، تانەلێدان، لۆمەکردن، لێدان.

**طعوم**- ا.ع(تونوم- tu'ûm): تام و چێژ.

**طغات**- ا.فا(توغات- tuxat): زاڵمان، ستەمکاران، گەردنکێشان، سەرکێشان، لەخەت دەرچوون.

**طغام**- ص.ع(تەغام- texam): ناکەس بەچە، سپلە و هەتیوچە، خوێڕی.

**طغامه**- ص.ع(تەغامە- texame): گەوج، گەلحۆ، خوێڕی.

**طغان**- ا.ت(توغان- tuxan): تەڕلان، شاباز.

**طغراء**- ا.ع(توغراء- tuxra'): توغرا، جۆرە ئیمزاو مۆرێکە جاران لەلایەن حوکمڕانانو سوڵتانو پاشایانەوە بەکار دەهات.

**طغرائی**- ص.ع(توغرائی- tuxra'î): توغرانووس، (مۆرو ئیمزا هەڵکەن).

**طغرانویس**- ص.فا(توغرانیڤیس- tuxranivîs): مامورێ کە لە هونەری دروست نووسینی خەتی کەوانەیی توغرادا وەستابووەو بەرپرسی ئەو ئیشەبووە..

**طغرل**- ا.ت(توغریل- tuxril): باڵندەیەکە لە جۆری بازو شەهین، تەڕلان، ناوی چەند پاشایەکی سەلجوقی بووە.

**طغیان**- مص.ل.ع(توغیان- tuxyan): سەرکێشی کردن، یاخی بوون، لە رادەدەرچوون، هەستانی ئاوی دەریا، یان رووبار، گەردن کێشی.

**طف**- ا.ع(تەفف- teff): لا، کەنار، قەراغ، شوێنی بەرز، زەوی بەرز.

**طفال**- ا.ع(توفال- tufal): قوڕو سیانی وشکەوەبوو، چلپاو، تلپە.

**طفال**- ص.ع(تیفال- tifal): نەرم و ناسک، ناسک و نازدار.

**طفاوه**- ا.ع(تەفاڤە- tefave): پوش و پەڵاش، کەفاوی سەر مەنجەڵ، کەفی سەر ئاو، خەرمانە.

**طفره**- ا.ع(تەفرە- tefre): بازرەقە.

**طفل**- ا.ع(تیفل- tifl): منداڵ، بێچو، نەوزاد، زارۆک.

**طفل**- ص.ع(تەفل- tefl): نەرم و ناسک، ناسکو نازدار.

**طفل**- ا.ع(تەفـــەل- tefel): باران، تاریکی، بولێڵی ئێوارێ.

**طفلک**- ا(تیـفلەک- tiflek): منداڵی بچووک، بۆ خـــۆشـــەویستـــی و بەزەییش بەکـــاردێ، بەستەزمان!.

**طفولت**- مص.ل.ع(توفـولەت- tufûlet): نەرم و ناسک بوون، منداڵیەتی.

**طفـولیت**- ا.ع(توفـولیـیـەت- tufûlîyet): منداڵێتی.

**طفیل**- ا.ص.ع(توفـەیل- tufeyl): مـیـوانی ناوەخت، میمڵ.

**طفـــیلی**- ص.ن.ع(توفـــەیلی- tufeylî): مـــشـــەخـــۆر، پارازیت، هەر روەکـــێک یان گیانلەبەرێک لەسەر روەک یان گیانلەبەریکی دی بژی، سەرباری خەڵکی دی.

**طق**- ا.ع(تەغ- tex): دەنگی پێکادانی دوو شتی رەق، تەق.

**طقطقـه**- مص.ع(تەغــتــەغـە- textexe): تەقەتەقکردن، دەنگی سمی وڵاخ.

**طل**- ا.ع(تەلل- tell): نەرمـــەبارانی کـــەم، شەونم، نمەباران.

**طل**- ص.ع(تەلل- tell): پیـرەمـێـرد، شـتی جوان.

**طلا**- ا(تیلا- tila): زێرو، تەڵا.

**طلاء**- ا.ع(تیـلا ء-'tila): قـیـر، دەرمـانێ لە شوێنێ بدرێ، شەراب.

**طلاب**- ا.ع(توللاب- tullab): خـــوازیاران، قوتابییان.

**طـــلاق**- مـــص.ل.ع(تـــەلاغ- telax): جـــیـــابوونەوەی ژن و مـــێـــرد لێکدی، دەست لێکبەردان، تەڵاق.

**طلاقت**- مص.ل.ع(تەلاغـــەت-telaxet): فـەسـاحـەت، رووکـرانەوە، زمـان رەوان بوون، رەوانزمانی.

**طلاقنامـه**- ا.مـر(تەڵاغنامـە-telaxname): تەڵاقنامـە، ئەو کـاغـەزەی جـۆری تەڵاقی تیـا تۆماردەکرێ.

**طلاکار**- ا.ص(تیـلاکـار- tilakar): کەسێ کە کاری زێڕ بکات، زێڕکار، زێڕ کفت، تەڵاکفت.

**طلاکردن**- مص.م(تیلاکەردەن-tila kerden): چەورکردن، تێ هەڵسوون، پێداماڵین.

**طلاکـوب**- ص.فـا (تیـلاکـوب- tilakûb): تەڵاکار.

**طلال**- ا.ع(تیـلال- tilal): نمەباران، شـەونم، ئاونگ، خوناڤ.

**طلاوت**- ا.مص.ع(تیـــلاڤـــەت-tilavet): شادمانی، خۆشی، چاکی.

**طلایع**- ا.ع(تەلای ء- 'telayî): پێـشـەنگان، پێشڕەوانی لەشکر، سەرقافڵە.

**طلایه**- ا(تەلایە- telaye): پێشەنگانی سوپا، دەستـە سەربازێک کە لە پێـشـەوە بنێـردرێن تا تاقیبی وەزع و حاڵی دژمن بکات، سەر قـافڵە، پێشڕەو.

**طلایه**- ا.ع(تولایە- tulaye): دەرمـــانێ لە لەش بماڵرێ، هەرشتێ لە شتێ هەڵبسورێ.

**طلایەدار**- ص.فـــا (تەلایەدار-telayedar): فەرماندەی پێشڕەوان، دیدەوان، سەر قـافڵەچی، سەرۆکی جڵەودارانی سوپا.

**طـلـب**- مـص.م.ع(تـەلـەب- teleb): ویـسـتن، داواکردن، قەرز.

**طـلب**- ا.ص.ع(تیـلـب- tilb): داواکـــــار، خوازبێنیکەر، خوازیار، داخواز.

**طلب**- ا.ع(تەلەب- teleb): داواکار.

**طلب**- ا.ع(توللەب- tulleb): داواکـــاران، خوازیاران.

**طلب**- ا.ع(تەلوب- telub): خـــوازەلۆک، داواکار.

**طلب**- ا.ع(تولب- tulb): گروپ، دەستـەیەک، کـــۆمـــەڵەیەک، فـــەوجـــێـک لە لەشکرێک، جەماعەتێک.

**طلبـاء**- ا.ع(تولەبا ء-'tuleba): داواکـاران، خوازەلۆکان، سووربوون لەسەر داواکردن.

**طلبكار**- ص.فـــا (تەلەبكار-telebkar): كەسێک كە داوای قەرزی خۆی بكاتەوە، داواكار، خوازیار، داخواز.

**طلبه**- ا.ع(تەلەبە- telebe): قوتابی، فەقێ، زانستخواز، فێرخواز.

**طلبيدن**- مص. (تەلەبیدەن-telebîden): داواكردن، خواستن.

**طلبنده**- ا.فـــا (تەلەبەندە-telebende): داواكار، خوازیار، داخواز.

**طلبيده**- ا.مف(تەلەبیدە- telebîde): خوازراو، ویستراو.

**طلح**- ا.ع(تەلح- telh): شكۆفەی خورما.

**طلحه**- ا.ع(تەلهە- telhe): جۆرە درەختێكە.

**طلسم**- اا(تیلیسم- tilism): تەلیسم، جادوو، دوعای جادووگەر، گەردن بەندی زێری لەسەر نووسراو.

**طلع**- ا.ع(تەلء- tel'): شكۆفە، شكۆفەی خورما، شوێنی بەرز، ئەندازە و بڕ، دیدگا.

**طلعت**- ا.ع(تەلئەت- tel'et): دیدار، بینین.

**طلق**- ا.ع(تەلغ- telx): جۆرە كانزایەكە، ئاسنجاو.

**طلق**- ص.ع(تیلغ- tilx): حەلاڵ، ڕەوا، تایبەت، شتێ كە كەس لەگەڵتدا شەریک نەبێ.

**طلق**- ا.ع(تەلغ- telx): ژانی منداڵبوون.

**طلق**- ص.ع(تەلیغ- telix): ئازاد، ڕەها، ڕووخۆش، دەم بە پێكەنین، زمان ڕەوان.

**طلقاء**- ص.ا.ع(تولەغاء- tulexa'): ئازادان، ڕەهایان، زمان پاراو، پاراو زمان، زمان زان.

**طم**- ا.ع(تیمم- timm): ئاو، دەریا، ژمارەی زۆر، سەیر، عەجیب، ئەسپی چاک.

**طماطم**- ا.ع(تەماتیم- tematim): تەماتە، باینجانی سور.

**طماع**- ص.ع(تەمما- temma'): تەماعكار، چاوچنۆک، ڕژد، پیسكە، بە تەماع.

**طمانينه**- مص.ل.ع(تومەئنینە- tume'nîne): دڵنیابوون، ئارام گرتن، خاترجەم بوون، ئەرخایەن بوون، ئاسوودەبوون.

**طمث**- مص.م.ع(تەمس- tems): بێ بن كردن، بێ نوێژبوونی ژن، دڕینی پەردەی كچێنی، كونكردن.

**طمس**- مص.م.ل.ع (تەمس- tems): لەناوبردن، شاردنەوەو تەپس كردن.

**طمطام**- ا.ع(تەمتام- temtam): ناوەندی دەریا، ناوەڕاستی دەریا.

**طمطراق**- اا(تومتوراغ- tum turax): هێرش و پەلامار و پاشەكشە، شان و شەوكەت، خۆنواندن، دەبدەبە، شكۆ، جەلال.

**طمع**- مص.ل.ع(تەمەء-'teme): تەماعكاربوون، چاوچنۆک بوون، ئومێدو ئارەزوو.

**طمع**- ص.ع(تەمیء- 'temi): تەماعكار، چاوبرسی، چاوچنۆک.

**طمعاء**- ا.ع(تومەئاء- 'tume'a): تەماعكاران، چاوچنۆكان، ڕژدان.

**طمع برداشتن**- مص.ل(تەمەء بەرداشتەن- teme' ber daşten): وازهێنان لە تەماعكاری، ئومێدبڕبوون، تەرككردنی بەغیلی.

**طمع بردن**- مص.ل(تەمەء بوردەن- teme' burden): تەماحكردن.

**طمع بريدن**- مص.ل(تەمەء بوریدەن- teme' buriden): ئومێدبڕبوون، تەرک كردنی تەماع.

**طمع بستن**- مص.ل(تەمەء بەستەن- teme' besten): تەماح كردن.

**طمع داشتن**- مص.ل(تەمەء داشتەن- teme' daşten): بەتەمابوون، تەماعكردن، چاوچنۆک بوون.

**طمعكار**- ص.فا (تەمەئكار- teme' kar): تەماحكار، تەماعكار، ڕژد، چاوچوو، چاوچنۆک.

**طمع كردن**- مص.ل(تەمەء كەردەن- teme' kerden): تەماح كردن.

**طمع گسستن**- مص.ل(تەمە ء گوسەستەن- teme’ gusesten): ئومێد بڕبوون، دەستبەرداربوونی تەماح.

**طميس**-ص. ع(تەمیس- temîs): کوێرە، کوێر، نابینا.

**طميم**- مص.ل.ع(تەمیم- temîm): نەرمە رۆيين، نەرمە غاردان، ئەسپی رەهوان، جۆرە قوماشێکی نایابە.

**طناب**- ا(تەناب- tenab): تەناف، پەت، کندر، رست، گوریس.

**طناب باز**- ص.فا(تەناب باز- tenab baz): تەنافباز، پەتباز، بەندباز، پاڵەوان بازی و بەسەر پەتی رایەڵکراوا رۆيیشتن و هونەر نوێنی.

**طناب خور**- ا.مر(تەناب خور-tanabxûr): قوڵی (بۆ بیر دەگوترێ).

**طنابير**- ا.ع(تەنابیر- tenabîr): تەمبور.

**طناجير**- ا.ع(تەناجیر- tenacîr): پاتیلە، پاتێڵ.

**طناز**- ص.ع(تەنناز- tennaz): بەنازو عیشوە، بەفیزو دەعیە.

**طنافس**- ا.ع(تەنافیس- tenafis): رایەخ، حەسیر، فەرش، قاڵی، مافوور.

**طنان**- ص.ع(تەننان- tennan): بناڤ و دەنگ، ناودار، مەنشور.

**طنب**- ا.ع(تونب- tunb): پەت، گوریسی درێژ، پەتی بەستنی خێوەتو سەراپەردان، دەماری لەش، رەگی درەخت.

**طنبار**- ا.ع(تینبار- tinbar): تەمورە.

**طنبور**- ا.ع(تونبوور- tunbûr): تەنبور، ئامێرێکی مۆسیقایە لە سێ تار دەچێت.

**طنبوری**- ص.ن(تونبووری- tunbûrî): تەنبورژەن.

**طنبی**- ا(تەنەبی- tenebî): تەلار، هۆدەی گەورە.

**طنجير**- ا.ع(تینجیر- tincîr): پاتێڵ، پاتیلە.

**طنزكردن**- مص.م(تەنز کەردەن- tenz kerden): تەوس پێ کردن، گاڵتە پێکردن، نازکردنو خۆنواندن.

**طنطنه**- مص.م.ع(تەنتەنە- tentene): تەنتەنە، سەنسەنە، بزەم بزەم، دەنگی تارو تەبور.

**طنفسه**- ا.ع(تەنفەسە- tenfese): دۆشەک، رایەخ، حەسیر، فەرش، قاڵی، مافور.

**طنين**- مص.ل.ع(تەنین- tenîn): ویزەویزی مێشو مەگەسان، دەنگی زەنگو ناقوسان، وژە وژی ناو گوێ.

**طنين انداز**- ص.فا(تەنین ئەنداز- tenîn endaz): ئەوەی وژە وژ دروست بکات.

**طوائف**- ص.فا.ع(تەڤائیف- teva’if): جماعەت، گروپ، دەستە، تایفە، تیرە.

**طوائل**- ا.ع(تەڤائیل- teva’il): دەوڵەمەندی، کینە، دژمنی.

**طوابع**- ا.فا.ع(تەڤابیء- tevabi’): سروشت، چاپکار، مۆر، پول، هەر شتێ نیشانەیەکی پێ لێبدرێ، خەتم، موستیلە.

**طوابق**- ا.ع(تەڤابیغ- tevabix): تاوە، کەرپوچی گەورە.

**طواحن**- ا.ع(تەڤاهین- tevahin): کەڵبە، ددانی هارەر.

**طواحين**- ا.ع(تەڤاهین- tevahîn): ئاش، ئاسیاوان.

**طوارف**- ا.ع(تەڤاریف- tevarif): ماڵی تازە وەدەست هاتوو، سەروەت و سامانی لەپرو زۆر.

**طوارق**- ا.ع(تەڤاریغ- tevarix): قەوماو، بەڵا.

**طواشي**- ص.ع(تەڤاشی- tevaşî): خەسیو، گوندەرهێنراو، خواجە سەرا.

**طواغی**- ا.ع(تەڤاغی- tevaxî): یاخی و سەرکێشان.

**طواغيت**- ا.ع(تەڤاغیت- tevaxît): زاڵمان، ستەمکاران، سەنەم و بتان.

**طواف**- مص.ل.ع(تەڤاف- tevaf): تەواف، سورانەوە بە دەوری شتێکدا، تواف کردنی کەعبە.

**طواف**- ص.ع(تەڤڤاف- tevvaf): کەسێک تەواف زۆر بکات، بەقاڵی گەڕۆک.

**طوال**- ص.ع(تیڤال- tival): درێژان.

**طوال**- ص.ع(تەڤڤال- tevval): زۆر درێژ.

**طوالع**- ص.ا.ع(تەڤالیء- tevali’): مانگی نوێ، دەرکەوتن و هەڵاتنی ئەستێرە، بەخت، یەغباڵ، چارەنووس.

**طوالق**- ص.ا.ع(تەڤالیغ- tevalix): تەڵاقدراوان.

**طوامیر**- ا.ع(تەڤامیر- tevamîr): تۆمار، نامە، دەفتەر، نامەی درێژ.

**طواویس**- ا.ع(تەڤاڤیس- tevavîs): تاووسان.

**طوبی**- ص.ع(توبا- tûba): پاکتر، چاکتر.

**طوبی**- ا.ع(توبا- tûba): شادی، خێرو خۆشی، خۆش بە حاڵت، بەهەشت، ناوی درەختێکە لە بەهەشت، خنی لەخۆت.

**طود**- ا.ع(تەود- tewd): کێو، کێوی مەزن، چیای گەورە.

**طور**- ا.ع(تەور- tewr): حاڵ، ئەندازە، جۆر، رادە.

**طور**- ا.ع(تور- tûr): کێو، کێوێکە لە نیمچە دورگەی سینا کە حەزرەتی موسا دەچووە سەری بۆ موناجاتو کێوی تورو کێوی موساو کێوی سیناو توری سینین-شی پێ دەڵێن.

**طوسک**- ا(تووسەک- tûsek): جۆرە رووەکێکی دڕکدارە.

**طوسی**- ص.ن(تووسی- tûsî): خەڵکی توس(کە شارێکی کۆنی خۆراسانەو لە ئاژاوەی مەغۆلاندا وێران بوو، و گۆڕەکەی فیردەوسی لەوێندەرە.

**طوسی**- ا(تووسی- tûsî): رەنگی خۆڵەمێشی، کەوەیی، سەوزی سپیواژ، جۆرە شاڵێکە.

**طوطی**- ا.(تووتی- tûtî): تووتی، یەکێکە لەو باڵندانەی کە دەتوانێ هەندێ وشە فێر بێ و بیلێتەوە.

**طوطیک**- ا(توتی یەک- tûtî yek): تووتی بچکۆلە.

**طوطی وار**- ق.ص(توتی ڤار- tûtî var): تووتیانە، تووتی ئاسا.

**طوع**- مص.ل.ع(تەوء- tew’): گوێڕایەڵ بوون، بە گوێ کردن، بە ئارەزووی خۆت، ئارەزوومەندانە، بە حەزو ویستی خۆ.

**طوع**- ص.ع(تەوء- tew’): گوێڕایەڵ.

**طوف**- مص.ل.ع(تەوف- tewf): تواف کردن، سوڕانەوە بە دەوری شتێکدا، تواف کردنی کابە.

**طوفان**- مص.ل(تەڤەفان- tevefan): تواف کردن، سوڕانەوە بە دەوری شتێکدا.

**توفان**- ا.ع(توفان- tufan): تۆفان، بارانی زۆر، لافاوێ کە شوێنێکی زۆر غەرق بکات.

**طوفان خیز**- ص.فا(توفان خیز- tûfan xîz): شوێنێ کە تۆفانی لێ هەستێ.

**طوفان رسیده**- ص.مف(توفان رەسیدە- tûfan resîde): کەسێک یان شتێک کە تۆفان لێی دابێ.

**طوفان زا**- ص.فا(توفان زا- tûfan za): ئەوەی ببێتە باعیسی تۆفان.

**طوق**- ا.ع(تەوغ- tewx): تەوق، ئاڵقەی لە ئاسن، گەوەی دەوری ملو گەردن، گەردن بەند، چەمەرە، بازنە.

**طوقه**- ا(تەوغە- tewxe): ئەڵقەئاسا، تەوق ئاسا، گەوە.

**طول**- مص.ل.ع(تول- tûl): درێژبوون، درێژی.

**طول**- ا.ع(تەول- tewl): توانا، دەوڵەمەندی، بەرزی، فراوانی.

**طولانی**- ص.ع(تولانی- tûlanî): درێژ، دوورو درێژ.

**طول دادن**- مص .م(تول دادەن- tûl daden): تول پێدان، درێژەپێدان، دواخستن.

**طول کشیدن**- مص.ل(تول کەشیدەن- tûl keşîden): درێژەکێشان.

**طولی**- ص.ع(تولا- tûla): درێژتر.

**طولیاب**- ا.مر(تول یاب- tûlyab): دام و دەزگایەک بووە بۆ دیاریکردنی سەنت و بەرزی ئەستێران، درێژی پێو.

**طومار**- ا.ع(تومار- tûmar): تۆمار، نامەی درێژ، دەفتەر.

**طوی**- ا.ع(تەڤا- teva): کوندەی ئاو، برسێتی.

**طوی**- ا.ع(تیڤا- tiva): شتی دوولایی، شتی دووانیو تێک ئالاو.

**طوی**- ا.ع(تەڤی- tevî): سەعاتێک لە شەو، پشتەوارەیەک.

**طویت**- ا.ع(تەڤییەت- tevîyet): نییەت، بیر، دەروون، راز و باتین، نهێنی، ئەندێشە و هزرو خەیاڵ.

**طویس**- ا.ع(توڤەیس- tûveys): تاووسۆکە، تاووسی بچووک.

**طویل**- ص.ع(تەڤیل- tevîl): درێژ، بەرز.

**طویله**- ص.ع(تەڤیلە- tevîle): ژنی درێژ، داوی گەردن بەند، گوریسێ ک چوار پایانی پێ بەستریتەوە، تەویلە، ئاخوڕ.

**طه**- ا.ع(تاها- taha): ناوی سوورەتی بیستەمی قورئانە کە ١٣٥ ئایەتەو لە مەککە هاتۆتە خوارێ.

**طهارت**- مص.ل.ع(تەهارەت-teharet): پاکبوونەوە، تارات گرتن، دەستنوێژ شتن، غوسڵ دەرکردن، پاکی.

**طهر**- مص.ل.ع(توهر- tuhr): پاک بوونەوە، پاکبوونەوەی ژن لە حەیز، ماوەی پاکی ژن، ماوەی نێوان دوو حەیز.

**طهره**- ا.مص.ع(توهرە- tuhre): پاکی، خاوێنی، تەمیزی.

**طهور**- مص.م(تەهور- tehûr): پاک کردنەوە، تەهارەت کردن، هەر شتێ بێ بە باعیسی پاکیو خاوێنی (وەکو ئاو).

**طهیر**- ص.ع(تەهیر- tehîr): پاک، خاوێن.

**طی**- مص.م.ع(تەی- tey): نامەنووسین، پێچانەوە، شاردنەوەی کارێک، رێ کردن، لەمیانە، تەی کردن، گەڕان.

**طی**- ا.خ.ع(تەی- teyî): ناوی تیرەیەکی عەرەبە کە حاتەمی تایی لەوان بووە.

**طیار**- ص.ع(تەییار- teyyar): تەیار، چوست و چالاک، تیژڕەو، فڕۆکەوان.

**طیار**- ا.ع(تەییار- teyyar): زمانەی تەرازوو، جۆرە کەشتییەکی تیژڕەوە.

**طیارات**- ا.ع(تەییارات- teyyarat): فڕۆکە، جۆرە دەرامەت و باجێک بووە لە سەردەمی ئیلخانیانی مەغۆلدا لە خەڵکی وەرگیراوە، وەک: ئەو موڵک و ماڵەی میرات گری نەبووە، ماڵێ لە بەرتیلخۆر گیراوە، یان لە کەسانێ کە ماڵی پاشایان دزیوە، وەرگیراوە.

**طیاره**- ا.ص.ع(تەییارە- teyyare): فڕۆکە، کەشتی تیژڕەو.

**طیاش**- ص.ع(تەییاش- teyyaş): پیاوی ئەقڵ سوک، حولحولی، سەرەڕۆ، ملهوڕ.

**طیاف**- ا.ع(تییاف- tiyaf): تاریک و روونی شەو، مۆتەکە.

**طیالیس**- ا.ع(تەیالیس- teyalîs): جۆرە جلێکە، عەبا، تەیلەسان.

**طیان**- ا.ص.ع(تەییان- teyyan): گڵکار، گەچکار، کەسێک کە کاری قوڕکاری و گەچکاری بێ.

**طیب**- م.ل.ع(تیب- tîb): حەلاڵ بوون، رەوابوون، پاک بوون، بەتام بوون، بۆن خۆشبوون.

**طیب**- ص.ع(تەییب- teyyib): پاک و خاوێن، باش، حەلاڵ، رەوا.

**طیبات**- ص.ع(تەییبات- teyyîbat): پاک و خاوێنان، حەلاڵو رەوا، قسەی چاکو خۆش.

**طیبت**- مص.ل.ع(تیبەت- tibet): بەتام بوون، خۆش بوون، حەلاڵ بوون، بۆن خۆش بوون.

**طیبه**- ص.ع(تەییبە- teyyîbe): پاکو خاوێن، حەلاڵ و رەوا، قسەی باش و خۆش.

**طيت**- ا.ع(تيـيـەت- tiyet): زەمـيـر، دڵ و دەروون، باتين، نييەت و نياز، پێويستی.

**طير**- مص.ل.ع(تەير- teyr): فڕين، هەڵفڕين.

**طير**- ا.ع(تەير- teyr): باڵندە، فڕندە.

**طيـران**- مص.ل.ع(تەيەران-teyeran): فـڕين، بازدان، هەڵفڕين.

**طيـره**- ا.ع(تەيرە- teyre): پەشم و غـەزەب، سووكی، ئەقڵ سووكی.

**طيره**- ا.ع(تيرە- tîre): هەر شتێ فاڵی خراپی پێ بگيرێتەوە، دڵتەنگ، شەرمەزار، ناڕەحەتی، بێقەراری.

**طيـش**- مـص.ل.ع(تـەيش- teyş): بێ ئـەقڵ بوون، سووك بوون، پەشم و غەزەب.

**طيطوى**- ا.ع(تيتەڤا- titeva): جۆرە مەلێكی دەرياييە.

**طيف**- مص.ل.ع(تەيف- teyf): تاپۆ، هاتنی تاپۆ و تارمـايی لە خـەودا، شـەبەح، خـەياڵاتی بوون، شەبەنگ.

**طيف**- ا.ع(تەيف- teyf): شـێـتی، غـەزەب، وەسوەسەو خەياڵات، شەبەنگ.

**طيف سنج**- ا.مر(تەيف سەنج- teyf senc): شەبەنگ پێو.

**طيف نما**- ا.مـر(تەيف نەمـا- teyf nema): شەبەنگ نما، شەبەنگ نوێن.

**طيـفـور**- ا.ع(تەيفـور- teyfûr): تەيروتو، باڵندە، پەرندە.

**طيلس**- ا.ع(تەيلەس- teyles): جبـە، عـەبا، جۆرە شانێلێكە بە شاندا دەدرێ.

**طيلسـان**- ا.ع(تەيلەسـان- teylesan): جبـە، عەبا، جۆرە شانێلێكە بەشاندا دەدرێ.

**طين**- ا.ع(تين- tîn): گڵ، قوڕ.

**طينت**- ا.ع(تينەت- tînet): تـەبيـعـەت، خيلقەت، سروشت، خوو، نيهاد.

**طيور**- ا.ع(تويور- tuy ûr): باڵندان.

**طيـهـوج**- ا(تەيهـوج- teyhûc): سـۆسكە، سوێسكە، سوێسك.

# ظ

**ظ- حر** (ظ-z):
پیتی بیستەمی ئەلفبای فارسییە، کە بە (ظا) دەخوێنرێتەوە، بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (٩٠٠) ئەم پیتە تایبەتە بە زمانی عەرەبیو لە زمانی فارسیدا نییە.

**ظافر-** ا.فا.ع(زافیر- zafir): زەفەرمەند، سەرکەوتوو.

**ظالم-** ا.فا.ع(زالیم- zalim): زاڵم، زۆردار، ستەمکار، جەفاکار.

**ظالمانه-** ق.ص(زالیمانه-zalimane): زاڵمانە، ستەمکارانە.

**ظاهر-** ص.ع(زاهیر- zahir): دیار، ئاشکرا، خویا.

**ظاهرپرست-** ص.فا(زاهیرپەرەست-zahir perest):رواڵەتپەروەر، کەسێک کە رواڵەتی دیاری مەبەست بێ و گوێ بەناخ و دەروون و باتین نەدا، رواڵەتباز.

**ظاهرساز-** ص.فا(زاهیرساز- zahir saz): ریاکار، ئەوەی دیوی دەرەوە نیشان بدات و خەڵکی هەڵخەڵەتێنێ.

**ظاهره-** ص.ع(زاهیره- zahire): دیاردە.

**ظئر-** ا.ع(زیئر- zi'r): دایەن، ئەو ژنەی شیر دەدا بە منداڵی خەڵکی.

**ظباء-** ا.ع(زیباء- ziba'): ئاسک، ئاسکان، مامز.

**ظبی-** ا.ع(زەبی- zebî): ئاسک، مامز، کەژاڵ.

**ظبیات-** ا.ع(زەبەیات- zebeyat): ئاسکان، مامزان.

**ظبیه-** ا.ع(زەبیە- zebye): ئاسکە.

**ظرائف-** ص.(زەرائیف- zeraif): زیرەکان، حەنەکچیان، شیرین زمانان، سوعبەتچی، خۆش تەبیعەت، ناسک و جوان، زاناو دانا.

**ظراف-** ص.ع(زیراف- ziraf): زیرەک، دانا.

**ظراف-** ص.ع(زوراف- zuraf): زیرەک، زانا.

**ظرافت-** مص.ل.ع(زەرافەت-zerafet): زیرەک بوون، کارامەبوون، خۆش میزاج، جوانی و قۆزی، خۆش تەبیعەت.

**ظرباء-** ا.ع(زیرباء- zirba'): رسک، جرجەکوێرە، راسو.

**ظرف-** ا.ع(زەرف- zerf): هەر شتێک کە شتی تێ بکرێ، پاکەت، زەرف، قاپ.

**ظرف-** ص.ع(زوروف- zuruf): زیرەک، خۆش میزاج، شیرین زمان، حەنەکچی، جوان و قۆز، زەریف، بەدارو بارو خۆش هەیکەل.

**ظرفاء**- ص.ع(زورەفا ء- zurefa’): زەریفان.

**ظرفیت**- مص(زەرفییەت- zerfiyet): گرتن، ئامادەگی، توانا، قابلییەت.

**ظروف**- ص.ع(زوروف- zurûf): زەریفان.

**ظروف**- ا.ع(زوروف- zurûf): ئامـان، زەرفی زەمان و شوێن، ئاوەڵفرمانی کات و شوێن.

**ظریف**- ص.ع(زەریف- zerîf): زیرەک، خـۆش تەبیعەت، قۆزو زەریف، زمان شیرین.

**ظریفـه**- ص.ع(زەریفـە- zerîfe): خـشکۆک، زەریفـو جوان، ژیرو زیرەک، خۆشتەبیعەت.

**ظعـــائن**- ا.ع(زەئائین- ze’ain): کـــەژاوە، کەژاوان.

**ظعن**- مص.ل.ع(زەئن- ze’n): رۆیيشتن، کۆچ کردن.

**ظعن**- ا.ع(زوئن- zu’n): کەژاوە.

**ظعینه**- ا.ع(زەئینە- zeîne): کەژاوە.

**ظفر**- مص.ل.ع(زەفـەر- zefer): سـەرکـەوتن، بەمراز گەیيشتن.

**ظفـــر**- ا.ع(زوفـــر- zufr): نینۆک، ناخـــون، نوخان، نویخان.

**ظفـره**- ا.ع(زەفـەرە- zefere): زیادەگـۆشـتی گۆشەی چاو کە بەرە بەرە دەبێتە هۆی نابینایی.

**ظفـیـر**- ص.ع(زەفـیـر- zefîr): زەفـەرمـەند، هەمیشە سەرکەوتوو.

**ظل**- ا.ع(زیلل- zill): سایە، سێبەر، سایک، پەنا.

**ظلال**- ا.ع(زیلال- zilal): سێبەران، پەنایان.

**ظلال**- ا.ع(زەلال- zelal): ئەوەی سـێـبـەر لە کەسێک یان شتێک بکات، سایەدار.

**ظلام**- ا.ع(زەلام- zelam): تاریکی، بولێـلی ئێواریێ.

**ظلام**- ا.ع(زیلام- zilam): زوڵم، ستەم.

**ظلام**- ص.ع(زەللام- zellam): پڕ زوڵم، زۆر ستەمکار.

**ظلام**- ا.ع(زوللام- zullam): زاڵـمـــــان، ستەمکاران.

**ظلامه**- ا.ع(زولامـە- zulame): ئەوەی بەزۆر لە کەسێک وەربگیرێ.

**ظلف**- ا.ع(زیلف- zilf): سم، ســمی شــەقی وەک سمی مەڕو بزنو مانگاو ئاسک..

**ظلف**- ا.ع(زیلـف- zilf): هەژاری، ئـاتـاجـی، دەستکورتی، دژواری مەعیشەت.

**ظلل**- ا.ع(زولەل- zulel): سێبەران.

**ظلم**- مص.ل(زولم- zulm): زوڵم کردن، ستەم کردن، بێدادیکردن.

**ظلم**- ا.ع(زولەم- zulem): تاریکی.

**ظلماء**- ا.ص(زەلما ء- zelma’): تاریکی، زۆر تاریک.

**ظلمــــات**- ا.ص.ع(زولومـــات-zulumat): زوڵومات، تاریکستان، پێشینان پێیان وابوو کە زوڵومــــات، ئەو ســـەری زەوییـــەو لەوێندەر ســـەرچاوەیەک هەیە هەر کـــەس لە ئاوی ئەو سەرچاوەیە بخـواتەوە نەمری وەدەست دێنێ؛ بۆیە بەو ســەرچاوەیە دەگــوترا ئاوی حـەیات. دەڵێن ئەسکەندەر بە پیـری ئاوی حـەیاتەوە چوو، بەڵام پێی نەگـەیيو خـدر پێـغـەمـبـەر لە ئاوی ئەو سەرچاوەیەی نۆشیو ژیانی نەمری بەدەست هێنا، جوگرافـیـانووسـانی کـۆن بە جەمسـەری باکووریان دەگـوت زوڵومـات چونکە مـاوەی شـەش مـانگ لەوێندەر هەر تاریکە.

**ظلمانی**- ص.ن(زولمانی- zulmanî): تاریک. زۆر تاریک.

**ظلم پیشه**- ص.مر(زوڵم پیشە- zulm pîşe): زۆردار، زوڵمکار، ستەمکار.

**ظلمت**- ا.ع(زولمەت- zulmet): تاریکی.

**ظلمت فـزا**- ص.فـا(زوڵـمـەت فـەزا-zulmet-feza): زیادکەری تاریکی.

**ظلمـــتکده**- ا.مـــر(زولمەت کـــەدە- zulmet kede): تاریکی خانە، دنیا.

**ظلمـه**- ا.ع(زەلەمـە- zeleme): سـتـمکاران، زۆرداران، جەفاکاران.

**ظلوف**- ا.ع(زولوف- zulût): سم، سمانی دوو شەق.

**ظلول**- ا.ع(زولول- zulûl): سایە، سێبەران.

**ظلـوم**- ص.ع(زەلـوم- zelûm): پـڕ زوڵـم، ستەمکار، زۆردار.

**ظله**- ا.ع(زوللە- zulle): سێبەردار، سابات.

**ظليف**- ص.ع(زەلیف- zelîf): زەلیل، زەبوون، کاری سەختو دژوار.

**ظليل**- ص.ع(زەلیل- zelîl): سـێـبـەردار، سایەدار.

**ظليله**- ص.ع(زەلیلە- zelîle): مێرگی پڕ دارو درەخت.

**ظليم**- ص.ع(زەڵیم- zelîm): مـەزڵـوم. ستەمدیدە.

**ظليم**- ا.ع(زەلیم- zelîm): وشترمری نێرە.

ظليمه- ا.ع(زەلیمە- zelîme): شتێ بەزۆر لە کەسێک سەنرابێ.

**ظماء**- مص.م(زەماء- zema'): تینوو بوون، تینوێتی.

**ظن**- مص.ل.ع(زەنن- zenn): گـومـان کـردن، تۆمەتبارکردن.

**ظنائن**- ا.ع(زەنائن- zenain): تۆمـەت، کەمێک لە شتێک.

**ظنان**- ص.ع(زەننان- zennan): بەدگـومـان، لاواز کە نەکرێ پشتی پێ ببەسترێ.

**ظنن**- ا.ع(زینەن- zinen): تۆمەت، کەم لە زۆر.

**ظنون**- ا.ع(زونون- zunûn): گومانان.

**ظنه**- ا.ع(زیننە- zinne): تۆمەت، کەمێک لە شتێک.

**ظنين**- ص.ع(زەنین- zenîn): گـومـان لێکراو، تۆمەتبارکراو.

**ظواهر**- ع(زەڤـاهیـر- zevahir): ئاشکرا، دیاردە.

**ظهائر**- ا.ع(زەهائیر- zehair): پشـتـیـوانان، نیوەڕۆ.

**ظهار**- مص.ل.ع(زیهـار- zihar): پشـتـگرتنی یەکـدی، پشـتـیـوانی کـردن لە یەکـدی، تەڵاقی بێـزاری، ئەوەیە کە پیاو بە ژنەکەی بڵێ تۆ وەکـو دایکمی، بەمـەش لە پیـاوەکـە حـەرام دەبێ تا کەفارە نەدات، ئەو ژنە حەرامە لەو پیاوە.

**ظهار**- ا(زوهار- zuhar): پەڕی مـریشـک کـە لە باڵ جیا نەبووبێتەوە.

**ظهارت**- مص.ع(زەهارەت-zeharet): پشت ئەستوور بوون.

**ظهاره**- ا.ع(زیهـارە- zihare): ڕووی جل، پێچەوانەی ئەستەر.

**ظهر**- ا.ع(زوهر- zuhr): نیوەڕۆ، نیڤرۆ.

**ظهر**- ا.ع(زەهر- zehr): پشت.

**ظهرنويسى**- ا.مص(زەهرنیـڤـیـسـی- zehr nivîsî): نووسینی پشتی چەک یان قەواڵە.

**ظهور**- ا.ع(زوهور- zuhûr): پشتان.

**ظهـــــور**- مـص.ل.ع(زوهـور- zuhûr): ئاشکرابوون، بە دیارکەوتن، خویابوون.

**ظهير**- ص.ع(زەهیـر- zehîr): یارو یاوەر، پشت و پشتیوان، پشت ئەستوور.

**ظهيره**- ص.ع(زەهیرە- zehîre): پشتیوان.

**ظهيره**- ا.ع(زەهیرە- zehîre): نیوەڕۆ.

**ظيان**- ا.ع(زەییـان- zeyyan): هەنگوین، یاسەمینی کێوی، یاسەمەنی زەرد.

# ع

ع- **حر** (ع- e, a, i, u):
پیتی بیستو یەکەمی ئەلفبای فارسییە کە بە (عەین) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (٧٠) ئەم پیتە تایبەتە بە زمانی عەرەبیو لە زمانی فارسیدا نییە.

**عائیب**- ص.ع(ئائیب- aib): عەیبگیر، عەیبدار

**عائث**-ا (ئائیس- a'is): شێر.

**عائد**- ا.فا (ئائید- aid): گەڕاوە، کەسێک کەعیادەتو سەردانی نەخۆش بکات، دەرامەت، سود.

**عائدات**- ا.فا (ئائیدات- aidat): دەرامەتان، سەردەرانی نەخۆش، چاکیو میرەبانیو عەتا و بەخشش و مەنفەعەت.

**عائده**- ا.فا.ع(ئائیدە- a'ide): سەردەری نەخۆش، چاکی و میرەبانی.

**عائذ**- ا.فا.ع(ئائیز- aiz): پەنا بۆ هێنان، پەناهێنەر.

**عائذه**- ا.فا.ع(ئائیزە- aize): پەناهێنەر، بێچووی تازە لە دایکبوو، (ئاسکو ماینو وشتر).

**عائش**- ا.فا.ع(ئائیش- aiş): ژیاو، خۆشگوزەرانو حاڵ.

**عائق**- ا.فا (ئائیغ- aix): کۆسپ، بەرهەڵست.

**عائل**- ص.ع(ئائیل- ail): موهتاج، دەروێش، فەقیر، قەلەندەر، دەستکورت.

**عائله**- ا.ع(ئائیلە- aile): خانەوادە، خێزان، عیال، ماڵ و منداڵ.

**عابث**- ا.فا.ع(ئابیس- abis): بیهودەکار، کەسێک کاری بێهودە بکات.

**عابد**- ا.فا.ع(ئابید- abid):
خواپەرست، عیبادەتکار.

**عابدانه**- ق(ئابیدانە- abidane):
خواپەرستانە، وەکو خوا پەرستان، خواپەرست ئاسا.

**عابد فریب**- ص.فا (ئابید فریب- abid frîb):
عابید خەڵەتێن، زۆر جوانو دڵڕفێن کە خوا پەرست لە رێ دەربکات.

**عابده**- ا.فا (ئابیدە- abide): ژنی خواپەرست، ئافرەتی خواپەرست.

**عابر**- ا.فا.ع(ئابیر- abir): راگوزار، رێبوار، رێوان.

**عابره**- ا.فا.ع(ئابیرە- abire): ئافرەتی رەوتەنی، رێبوار، خانمی رێبوار.

**عابس**- ص.ع(ئابیس- abis): عەبووس، گرژو مۆن.

**عـــــاتق**- ص.ع(ئاتيغ- atix): ئازاد، لە كۆيلايەتى خەلەسيو، شەرابى كۆنە، شەرابى چاك.

**عاتق**- ا.ع(ئاتيغ- atix): نێوان شان و مل، قەلاندۆش، قەلاندۆشكان.

**عاتقه**- ا.ع(ئاتيغە- atixe): كەوانى كۆنەى سوورخن.

**عـاتك**- ص.ع(ئاتيک- atik): جـوان چاک، جوان خاس، دلاوا بەخشندە، شەرابى خاليسە.

**عـاتكه**- ا.ص.ع(ئاتيكە- atike): كـەوانى سوورباو، كەوانێک لە كۆنيدا سوور هەلگەڕابێ، ژنى بۆنخۆش.

**عاج**- ا.ع(ئاج- ac): ئێسكى ددانى فيل.

**عاجز**- ص.ع(ئاجيز- aciz): بێ توانا، پير، نوقستان، ماندوو، نەخۆش، كوێر، نابينا.

**عـاجز امـدن**- مص.ل(ئاجيز ئامەدەن- aciz ameden): بێ توانا بوون، نەخـۆش كـەوتن، ماندوو بوون، بێتاقەت بوون.

**عـاجـزانه**- ق.ص(ئاجيـزانە- acizane): لاوازانە، بێتاقەتانە، زەبوونانە.

**عـاجزمـاندن**- مص.ل(ئاجيـز مـاندەن- aciz manden): مـاندووبوون، لاواز بوون، زەبوون بوون.

**عاجز نواز**- ص.فا(ئاجيز نەڤاز-aciz nevaz): خەستەلاوێن، تيمـاركەرى زەبوونان، لاوێنەرى پەككەوتووان، خەمخۆرى لاوازو بێ تواناكان.

**عاجزوار**- ق(ئاجيزڤار- aciz var): زەبوونانە، زەبوون ئاسا.

**عـاجل**- ا.فا.ع(ئاجيل- acil): خێـرا، لەز، پەلە، پەلەكار، چالاک، زوو، گورج.

**عـاجله**- ا.فا.ع(ئاجيلە- acile): ناپايەدار، فـانى، ئەم دنيـايە، ژيانى نا پايەدار، عـومـرى فانى.

**عـادت**- ا.ع(ئادەت- adet): خووخدە، داب و نەريت، خوو، رێ و رەسمان، ئاكارو خدە.

**عـادت زنانه**- ا.مـر(ئادەتى زەنانە- adeti zenane): عـادەتى مـانگانەى ژنان، حـەيز، بێ نوێژبوونى ژنان.

**عـــادت دادن**- مص.م(ئادەت دادەن- adet daden): فێركردن، راهێنان، خو پێ گرتن.

**عـادت داشتن**- مص.ل(ئادەت داشتـەن- adet daşten: خوو گرتن، راهاتن.

**عـادت شـدن**- مص.ل(ئادەت شـودەن- adet şuden): عـادە بوون، بێ نوێژبوون، بە باوبوون، بە عادەت بوون.

**عـادت كـردن**- مص.ل(ئادەت كـەردەن- adet kerden): راهاتـن، خـوو پێـوەگـرتن، راهاتن لەسەر شتێ يان كارێ.

**عادت گرفتن**- مص.ل(ئادەت گيـريفتەن- adet giriften): خوو پێ گرتن، راهاتن.

**عـادل**- ا.فـا.ع(ئاديل- adil): دادگـەر، راست، دروست، دادپەروەر.

**عـــــادلانه**- ق.ص(ئاديلانـە- adilane): دادپەروەرانە.

**عادله**- ا.فا(ئاديلە- adile): دادپەروەر.

**عـــادى**- ا.فــا.ع(ئادى- adî): دژمن، دەست درێژكار، ستەمكار، دز، شێر، جەردە.

**عـــادى**- ص.ن.ع(ئادى- adî): دابو نەريتى باو، ئاسايى، سانای.

**عـادى**- ص.ن.ع(ئادى- adî): قـەومى عـاد-ى كورى نوح.

**عـاديات**- ص.ن.ع(ئادييـات- adiyat): بەلاو نـاخـــــۆشى، دژمنـايەتىو شـــــەڕ، دوورى، دەستدرێژكارى، زێدەگاڤى.

**عـــاديه**- ا.ص.ع(ئادييـــە- adîye): دوورى، توندى و تووڕەيى.

**عـــاديه**- ا.ص(ئادييـــە- adîye): ئەسپ يان وشترى رەهوان، گرووپى ئامادەو تەيار بۆ شەڕ.

**عــاذر**- ا.فــا.ع(ئازير- azir): عــوزرخــواز، تەوازۆخواز.

**عــاذر**- ا.ع(ئازير- azir): جـێى زام و برين،

شوێنبرین، گوێ ئادەمی.

**عاذر**- ا.خ(ئازەر- azer): ناوی پیاوێکە دەڵێن بەبێ ئیمانی مردووەو حەزرەتی عیسا پاش چل رۆژ زیندوویی کردۆتەوەو ئیمانی هێناوە.

**عـاذل**- ا.فـا.ع(ئازیل- azil): لۆمـەکـەر، سەرزەنشتکەر، بە گلەیی.

**عاذلە**- ا.فا.ع(ئازیلە- azile): ژنی بە گلەیی.

**عار**- ا.ع(ئار- ar): عەیبو نەنگ، ریسوایی، شەرمەزاری، فەزیحەت.

**عـاربە**- ص.ع(ئاریبـە- aribe): عـارەبی رەسەن.

**عـارض**- ا.فـا.ع(ئاریز- ariz): پێشـهـات، ئەوەی کە پێش بێو زوو بروات، عەرزکار، تەختی دەمـوچاو، چارە، روخسـار، روو، شکاتکار، رووداو، قەوماو.

**عـارض شـدن**- مص.ل(ئاریز شـودەن- ariz şuden): روودان، سکاڵاکردن، دادخوازی کردن.

**عـارضـە**- ا.فـا.ع(ئاریزە- arize): شـتێ کـە پێش بێ، پێشهـات، رووداو، قەوماو، نەخۆشی، بەڵا، رووداوی چاوەڕوان نەکراو، پێویستی.

**عـارضی**- ص.ع(ئاریزی- arizî): نا پایەدار، رەوتەنی.

**عـارضی**- ا.مص(ئاریزی- arizî): نواندنی لەشکر، لەشکر نووسی.

**عـارضین**- ا.ع(ئاریزەین- arizeyn): هەردوو رووی دەمـوچاو، هەردوولای چارە، هەردوو لای رووخسار.

**عارف**- ا.فا.ع(ئاریف- arif): دانا، بەسەبرو حەوسەڵە، خواناس، حەکیمی رەبانی، سۆفی، دەڵێن عارف کەسێکە بۆیە خوا دەپەرستێ چونکە شایستەی عیبادەتە، نەک بە ئومێدی پاداشت یان لەترسی سزا.

**عـارفـانە**- ق.ص(ئاریفـانە- arifane): عارفانە، بەشێوەی عارفان.

**عارفە**- ا.فا.ع(عاریفە- arife): ئافرەتی پشوو درێژو بە سەبر، ناسراو، بەخشش، چاکە، کردەوەی چاک.

**عـاری**- ص.ع(ئاری- arî): رووت، بێ جل و بەرگ.

**عـاریە**- ص.ع(ئاریـیـە- arîye): رووت (بۆمێ).

**عـاریە**- ا.ع(ئارییـە- arîye): بە ئەمـانەت، شتێ بە ئەمانەت وەربگیرێو پاشان بدرێتەوە.

**عـاریت سـرا**- ا.مـر(ئارییـەت سـەرا- arîyet sera): دنیای فانی،

**عاریتی**- ص.ن(ئارییەتی- ariyetî): ئیرەتی، ئەمانەتی، ئەوەی پایەدار نەبێ وەکو عومر، شتێ بە ئەمانەت وەربگیرێ.

**عـازر**- ا.خ(ئازەر- azer): ناوی پیـاوێکە دەڵێن بەبێ ئیـمـانی مـردووەو پاش چل رۆژ حەزرەتی عیـسا زیندووی کـردۆتەوەو ئەوجا ئیمانی هێناوە.

**عـازف**- ا.فـا(ئازیف- azif): ژەنەر، نەواژەن، سازژەن، گۆرانی بێژ.

**عـازم**- ا.فـا.ع(ئازیم- azim): کـەسێک کـە عەزمی کارێک بکات، بە نیاز.

**عـاس**- ص.ع(عـاس- ass): حـەسـحـەس، شەوگەڕ، پاسەوان.

**عـاشـر**- ا.فـا.ع(ئاشـیـر- aşir): دە یەگ گـر، دەیەم، دەیەمین.

**عـاشـرە**- ا.فـا.ع(ئاشـیـرە- aşire): دەیەم، (بۆمێ)، بەشی قومار.

**عاشق**- ا.فا.ع(ئاشیغ- aşix): ئاشق، شەیدا، دڵدار.

**عـاشـقـانە**- ق.ص.ع(ئاشـیـغـانە- aşixane): ئاشقانە، ئاشق ئاسا، وەکو ئاشقان.

**عـاشـقـبـا**- ا.مـر(ئاشـیـغـبـا- aşixba): ترشک، مەرگەیەک کە سرکە یان ئاوی لیمۆی تێ کرابێ.

**عـاشق بارە**- ص.مـر(ئاشـیغ بارە- aşix bare): مـاشـوقێ کـە ئاشـقی خـۆی زۆر خـۆش بوێ، ئاشقپەرست، ئاشقباز.

**عاشق پیشه**- ص.مر(ئاشیغ پیشه- aşix pîşe): ئاشق پیشه، کەسێ کە ئاشقێنی کردبێ بە پیشە.

**عاشق کش**- ص.فا(ئاشیغ کوش- aşix kuş): ئاشق کوژ، دڵدارکوژ، ماشقەیەک کە زوڵم لە ئاشقی خۆی بکات.

**عاشق کشی**- ا.مص(ئاشیغ کوشی- aşix kuşî): ئاشق کوژی، کاری ئاشق کوشتن.

**عاشق نواز**- ص.فا(ئاشیغ نەڤاز- aşix nevaz): ئاشق لاوێن، مەعشوقێ کە ئاشقی خۆی بلاوێنێ و لەگەڵیا بە لوتف بێ، ئاشقپەروەر.

**عاشق وش**- ص.مر(ئاشیغ ڤەش- aşix veş): ئاشقانە، ئاشق ئاسا.

**عاشقه**- ا.فا.ع(ئاشیغە- aşixe): ئافرەتی ئاشق.

**عاشوراء**- ا.ع(ئاشوراء- aşûra'): رۆژی دەیەمی مانگی عاشورا، ئەو رۆژەی حەزرەتی حوسەینی کوڕی عەلی تێدا شەهید بوو لە کەربەلا.

**عاشوروا**- ا.مر(ئاشورڤا- aşûrva): ئەو شۆربایەی لە رۆژی دەی مانگی محەرەما دەکرێ بە نەزر، هەریسە.

**عاصر**- ا.فا.ع(ئاسیر- asir): کەسێک کە ترێ یان میوەی دی بگوشێتو ئاوەکەی بگرێ.

**عاصره**- ا.فا.ع(ئاسیرە- asire): گووشەر، ئاوگری میوە (بە گوشین).

**عاصف**- ص.ع(ئاسیف- asif): خوار، چەماوە، کەچ، توند، بای توندو تووش، باهۆز.

**عاصفه**- ص.ع(ئاسیفە- asife): رەشەبا، باهۆز، گەرداو، بای توندو تووش.

**عاصم**- ا.فا.ع(ئاسیم- asim): پارێزەر، کەسێ لە هەڵەو خزین بتگێرێتەوە.

**عاصمه**- ا.فا.ع(ئاسیمە- asime): پایتەختی وڵات.

**عاصی**- ا.فا.ع(ئاسی- asî): یاخی، سەرکێش، گوناحکار.

**عاصیه**- ا.فا.ع(ئاسییە- asîye): ژنی یاخی، سەرکێش، گوناحکار.

**عاضد**- ا.فا.ع(ئازید- azid): یارمەتیدەر، پشتیوان.

**عاطر**- ص.ع(ئاتیر- atir): بۆن خۆش، عەتر دۆست، کەسێک بەردەوام عەتر لە خۆی بدات.

**عاطف**- ا.فا.ع(ئاتیف- atif): وەرچەرخێنەر، میهرەبان، سۆزدار.

**عاطفه**- ا.فا.ع(ئاتیفە- atife): سۆزو بەزەیی، پەیوەندی خزمایەتیو کەسایەتی.

**عاطل**- ص.ع(ئاتیل- atil): بێکار، بێ شت، بیهودە، بێ کاروبار، ژنی بێ ملوانکە.

**عاطله**- ص.ع(ئاتیلە- atile): ژنی بێ زێڕو زیوو خشڵ.

**عافی**- ا.فا.ع(ئافی- afî): عەفووکار، چاوپۆشیکار لە گوناه، لێبوردە.

**عافیت**- ا.مص.ع(ئافییەت- afiyet): تەندروستی، سەلامەتی، ساغی، رزگاری، خواناسی.

**عافیت خواه**- ص.فا(ئافییەت خاه- afiyet xah): سەلامەتی خواز، عافیەتخواز.

**عافیت خواهی**- ا.مص(ئافییەت خاهی- afiyet xahî): عافیەتخوازی، سەلامەتخوازی.

**عاق**- ا.فا.ع(ئاغ- ax): سەرکێش، داک و باب رەنجێن، کەسێک کە داکو بابی برەنجێنێ و بەدرەفتارییان دەگەڵ بکات، بە گوێنەکەری باب و داک.

**عاقب**- ا.فا.ع(ئاغیب- axib): جێگری کەسێکی دی.

**عاقبت**- ا.ع(ئاغیبەت- axibet): ئاقیبەت، ئەنجام، ئاکام.

**عاقبت اندیش**- ص.فا(ئاغیبەت اندیش- axibet endîş): دوور ئەندێش، دووربین، ئاخربین، ئەوەی بیر لەئەنجامی کاران بکاتەوە.

**عاقبت بخير**- ص.مر(ئاغيبەت بيخەير- axibet bi xeyr): ئاخرخێر، ئەوەی ئەنجامی کار یان ژیانی باش بێ.

**عاقبت نگر**- ص.فا(ئاغيبەت نيگەر- axibet niger): ئاقيبەت ئەندێش، ئاخربین، ئەوەی بروانێتە ئەنجامی کار.

**عاقبت نگری**- ا.مص(ئاغيبەت نيگەری- axibet nigerî): ئاقیبەت روانی، ئاخربینی، ئاقیبەت ئەندێشی.

**عاقد**- ا.فا.ع(ئاغيد- axid): گرێدەر، پەیمان بەستن، جێ بەجێکاری مارە برینی بەسیغە، پەیمان بەستن.

**عاقر**- ص.ع(ئاغير- axir): نەزۆک، ژنی نەزۆک، قسر، ئەستێور.

**عاقرقرخا**- ا(ئاغير غەرخا- axir xerxa): جۆرە گیایەکە.

**عاقل**- ص.ع(ئاغيل- axil): ئاقڵ، بە ئاوەز، دانا و هوشیار و زیرەک، ئاۆزدار.

**عاقلانه**- ق.مر(ئاغيلانە- axilane): ئاقلانە، ژیرانە، زیرەکانە.

**عاقل فريب**- ص.فا(ئاغيل فەريب- axil ferîb): ئاقڵ خەڵەتێن.

**عاقله**- ص.ع(ئاغيلە- axile): ژنی ئاقڵو زانا، خوێن بەها.

**عاقول**- ا.ع(ئاغول-- axûl): پێچ و دەورانی روبار، دەشتێ کاکی بەکاکی کە رێی تێدا دەرنەکرێ، کاری نادیارو تێکەڵو پێکەڵ، وشترالوک.

**عاكف**- ا.فا.ع(ئاكيف- akif): گۆشەگیر، خەڵوەنشین، لە جیهانی عیرفاندا بە کەسێک دەگوترێ دەستبەرداری دنیابێو هەر خەریکی خواپەرستی بێ.

**عالم**- ا.فا.ع(ئاليم- alim): زانا، دانا.

**عالم**- ا.ع(ئالەم- alem): جیهان، دنیا، گیتی، رۆژگار.

**عالم ارا**- ص.فا(ئالەم ئارا- alem ara): عالەم ئارا، ئارایشتگەری جیهان.

**عالم اشوب**- ص.فا(ئالەم ئاشوب- alem aşûb): عالەم شێوێن، ئەوەی خەڵکی شەیدای جوانی خۆی بکات.

**عالم افروز**- ص.فا(ئالەم ئەفروز- alem efrûz): رۆشنکەری جیهان.

**عالم امر**- ا.مر(ئالەمی ئەمر- alemi emr): جیهانی فریشتە.

**عالم امكان**- ا.مر(ئالەمی ئیمکان- alemi imkan): ئەوەی غەیرەز زاتی خوایە.

**عالم بالا**- ا.مر(ئالەمی بالا- alemi bala): ئاسمان.

**عالم برزخ**- ا.مر(ئالەمی بەرزەخ- alemi berzex): شوێنی روحان لە کاتی مردنەوە تا قیامەت.

**عالم جان**- ا.مر(ئالەمی جان- alemi can): دنیای روحان، دنیا، ئەم دنیا، عالم.

**عالم جبروت**- ا.مر(ئالەمی جەبەرووت- alemi ceberût): دنیای قودرەت و عەزەمەتی یەزدان.

**عالم جسماني**- ا.مر(ئالەمی جسمانی- alemi cismanî): جیهانی جسمانی، دنیای تەبیعەتو مادە.

**عالم حس**- ا.مر(ئالەمی هیس- alemi his): جیهانی هەست.

**عالم خاك**- ا.مر(ئالەمی خاک- alemi xak): دنیا، جەسەدی ئادەمی.

**عالم خلق**- ا.مر(ئالەمی خەلغ- alemi xelx): بوونەوەران و زیندەوەران، عالەمی جسمانی.

**عالم ديگر**- ا.مر(ئالەمی دیگەر- alemi diger): ئەو دنیا، قیامەت، پەسلان، رۆژی پەسلانێ.

**عـــالم ذوق**- ا.مـــر(ئالەمی زەوغ- alemi zewx): دنیای شادمانی و خۆشی.

**عـالم سفلی**- ا.مـر(ئالەمی سوفلی- alemi suflî): ئەم دنیا، زەوی.

**عـالم شهادت**- ا.مر(ئالەمی شەهادەت- alemi şehadet): ئەم دنیـــایەی کـــە لەبەر چاوەو هەستی پێدەکرێ، جیهانی ماددیات.

**عـالم صـغیر**- ا.مر(عالەمی سەغیر- alemi sexir): دنیای بچووک، مرۆڤ، بەدەنی مرۆڤ کە دنیایەکی بچووکە.

**عـــالم علوی**- ا.مـــر(ئالەمی ئولڤی- alemi ’ulvî): جیهانی بالا، ئاسمان.

**عـالم غـیب**- ا.مـر(ئالەمی غـەیب- alemi xeyb): جیـهانی پێوار، ئەو دنیـا، قیـامـەت، پەسلان.

**عـالم قـدس**- ا.مـر(ئالەمی غـودس- alemi xuds): عالەمی خوایی، دنیای خوایی.

**عـالم کـبیـر**- ا.مـر(ئالەمی کـەبیـر- alemi kebîr): گەردوون، هەموو دنیا.

**عـالم لاهوت**- ا.مـر(ئالەمی لاهووت- alemi lahût): دنیای خواوەندی، جیهانی سەرمەدی.

**عـالم مـعنی**- ا.مـر(ئالەمی مـەئنا- alemi me’na): هەر شـتـێک پەیوەست بێ بە مـاناو حەقیقەتەوە.

**عـالم ملک**- ا.مـر(ئالەمی مـولک- alemi mulk): دنیای بوون، ئەم دنیایە.

**عالم ملکوت**- ا.مر(ئالەمی مەلەکووت- alemi melekût): عالەمی جەبەرووت.

**عـالم ناسوت**- ا.مر(ئالەمی ناسووت- alemi nasût): دنیـای مـاددیات، دنیـای سـروشـتیو مەتریالی، دنیای فانی، ئەم دنیا.

**عـالمیـان**- ا.ع(ئالەمـیـیـان- alemîyan): جیهانیان، هەموو خەڵکی جیهان.

**عـالمین**- ا.ع(ئالەمین- alemîn): جیـهـانان، گێتییان.

**عـالی**- ص.ع(ئالی- alî): بلند، بەرز، گەورە، بەقەدر، هێژا، یەکێکە لە ناوەکانی یەزدان.

**عـالیـات**- ص.ا.ع(ئالیـیـات- alîyat): بەرزو بلندو پیرۆز.

**عـــالی اوازه**- ص.مـــر(ئالی ئاڤـــازە- alî avaze): خوشخـوان، دەنگخۆش، گۆرانی بێژ، ناودار، بەنامێ، مەنشورو بناڤ و دەنگ.

**عـالی تبـار**- ص.مر(ئالی تەبار- alî tebar): وەچاخزادە، نەجیمزادە، خانەدان.

**عـالیـجـاه**- ص.مـر(ئالی جـاهـ- alî cah): پایەبەرز، شکۆدار.

**عالی جناب**- ص.مر(ئالی جەناب- alî cenab): دەرگـای بەرز، وشـەی رێزە بە کـەسـانی خـودان پلەو پایەی بەرز دەگوترێ.

**عالی رتبه**- ص.مر(ئالی روتبە- alî rutbe): فەرماندەییێن پلەبەرز.

**عالی شاخ**- ص.مر(ئالی شاخ- alî şax): لقی بەرز، درەختێک کە لقی بەرزبێ.

**عـالی شـان**- ص.مـر(ئالی شـان- alî şan): پایەبەرز، خـــاوەن شـــانو شکۆ، (لەقـــەبی پاشایانە).

**عـالی قـدر**- ص.مـر(ئالی غـەدر- alî xedr): قەدرگران، بەقەدرو حورمەت، پایەبەرز.

**عالی گهر**- ص.مر(ئالی گوهەر- alî gûher): پاک نەژاد، رەسەن رەچەڵەک، شەریف نەژاد.

**عـــالی مـرتبـه**- ص.مـــر(ئالی مـــەرتەبە- alî mertebe): پایە بەرز.

**عـــالی مـقـام**- ص.مـــر(ئالی مـەغـام- alî mexam): پایەبەرز.

**عـالی مـقـدار**- ص.مـر(ئالی مـیـغـدار- alî mixdar): قەدرگران، گەورە، مەزن، هێژا.

**عـــالی نـسب**- مص.مـــر(ئالی نەسـەب- alî neseb): وەچاخزادە، رەسەنو پاکنەژاد.

**عالیه**- ص.ع(ئالییە- alîye): بەرز، بڵند.

**عـــالی همت**- ص.مــر(ئالی هیـــمـت- alî himmet): جوامێر، بەخشندە، بەهیمەت.

**عام**- ا.فا.ع(ئامم- amm): گشتی، هەمووان، هەمەگیر، عەوام، رەش و رووت و نەخوێندەوار.

**عام**- ا.ع(ئام- am): ساڵ.

**عامد**- ا.فا.ع(ئامـید- amid): بە ئانقەست، مەبەستدار.

**عامر**- ا.فا.ع(ئامیر- amir): ئاوەدان کەرەوە، دانشتووی خانوو، ئاوەدانی، ئاوایی.

**عـــامـــره**- ا.فـــا.ع(ئامــیـــرە- amire): ئاوەدانکەرەوە، ئاوەدانو بەرقەرار.

**عـامـری**- ص.ن(ئامــیـری- amirî): سـەر بە تیرەی بەنی عامر(کەتیرەیەکی عەرەبە).

**عامل**- ا.فا.ع(ئامیل- amil): کرێکار، پاڵە، والی، فەرمانڕەوا.

**عـامله**- ا.فـا.ع(ئامـیلە- amile): کـرێکار، پاڵە.

**عامه**- ا.فا.ع(ئاممە- amme): گشت، هەموو خەڵکی، عەوامی خەڵک.

**عـامه پسند**- ص.مف(ئاممە پەسـەند- amme pesend): پەسندی هەمـووان، هەمـە پەسـەند، شتێ لەلایەن هەموو خەڵکییەوە پەسند بێ.

**عـــامی**- ص.ن(ئامــیـی- ammî): عـــەوامی خەڵکی، نەخوێنەوارو رەشۆکی، ئۆمی.

**عـــامی**- ص.ع(ئامـــیـی- ammî): نابینا، کەسێک کە رێی خۆی نەزانێ.

**عـامــیـان**- ا(ئامــیـان- amîyan): عـەوامی خەڵکی، خەڵکی رەشۆکیو نەخوێنەوار.

**عامیانه**- ق.ص(ئامیانە- amîyane): وەکو عەوامان، ئۆمیانە.

**عـــانات**- ا.ع(ئانات- anat): مـــاکـــەر، رەوەکەرەکێوی، تووکەبەر، بەر.

**عـانـد**- ا.فا.ع(ئانیـد- anid): سـەرسـەخت، شـەڕانی، کـەچرەو، کـەسـێک لە رێی راست لابدات.

**عانه**- ا.ع(ئانە- ane): ماکەر، تووکەبەر، بەر.

**عـانی**- ص.ع(ئانی- anî): یەخـسـیـر، بەندی، ملکەچ، زەلیلو زەبوون.

**عـانیـیه**- ص.ع(ئانیـیـە- anîye): یەخـسـیـرو بەندیو گیرۆدە.

**عاهات**- ا.ع(ئاهات- ahat): خەوش و عـەیب، بەڵاو نارەحـەتی، دژواری و سـەخـتـیو تەنگانە، فەسادکار.

**عـاهر**- ص.ع(ئاهیـر- ahir): زیناکـار، داوێن پیس.

**عـاهل**- ص.ع(ئاهیل- ahil): ژنی بێ مـێـرد، پاشای گەورە، شاهانشا.

**عـایق**- ا.فـا(ئایغ- ayîx): تەگـەرە، کـۆسپ، بەرهەڵست، مادەی نەگەیەنەر.

**عباء**- ا.ع(ئەبا ء- eba’): عەبا.

**عـــبـــاب**- مـص.ع(ئەبـاب- ebab): ئـاو خواردنەوە.

**عبـاب**- ا.ع(ئوباب- ubab): لافـاوی گـەورە، شەپۆلی دەریا، پێل.

**عباد**- ا.ع(ئیباد- ibad): کۆیلە، بەندە.

**عباد**- ا.ع(ئوبباد-ubbad ): عـیـبـادەتکاران، خواپەرستان.

**عــبـادت**- مص.م.ع(ئیـبــادەت- ibadet): تاعەتکردن، خواپەرستن، ملکەچ کردن.

**عـبـادتخـانه**- ا.مـر(ئیـبـادەتخـانە- ibadet xane): پەرستگە، شوێنی تاعەت.

**عبادتکار**- ص.مر(ئیبادەتکار- ibadetkar): خوا پەرست، عیبادەتکار.

**عبادتگاه**- ا.مر(ئیبادەتگاه- ibadetgah): پەرســتگە، شـــوێنی خـــواپەرســتی، شـــوێنی عیبادەت.

**عـبـادت نما**- ص.فـا(ئیـبـادەت نومـا- ibadet numa): خواپەرستی ریاکـار، کەسـێک هەر بۆ ناو عیبادەت بکاتو خۆی پێوە بابدا.

**عـبـادید**- ا.ع(ئەبادید- ebadîd): دەسـتـەو تاقمی پەرتەوازە، ڕێگای دوور.

**عـبـار**- ص.ع(ئەببـار- ebbar): لێکدەرەوەی خەون، ڕاڤەکەری خەون.

**عبار**- ص.ع(ئەببار- ebbar): ڕێبوار، ڕێوان.

**عـبـارت**- مص.م.ع(ئیـبـارەت- ibaret): لێکدانەوەی قسـە یان خەون، دەربڕین، شێـوازی دەربڕین.

**عـبـارت ارا**- ص.فـا(ئیـبـارەت ئارا- ibaret ara): بە توانا لە دەربڕیندا، کـەسـێـک کـە بە جوانی مەبەستی خۆی دەربڕێ.

**عبارت پرداز**- ص.فا(ئیبارەت پەرداز- ibaret perdaz): عیبارەت ئارا.

**عـبـاس**- ص.ع(ئەببـاس- ebbas): ڕووگـرژ، شێری بێشە.

**عـبـاسی**- ا(ئەباسی- ebaaî): دراوێکی باوی سەردەمی شا عەباسی گەورە بووە.

**عبث**- مص.ع(ئەبەس- ebes): کاری بێهوودە، بێهوودەیی.

**عبد**- ا.ع(ئەبد- ebd): بەندە، کـۆیلە، غـولام، بەندەی خوا، مرۆڤ بە گشتی.

**عـبـدل**- ا.ع(ئەبدەل- ebdel): کـۆیلە، بەندە، بەنی.

**عبده**- ص.ع(ئەبەدە- ebede): خواپەرسـتـان، عیبادەتکاران.

**عبر**- ا.ع(ئیبەر- iber): پەندو دەرسان.

**عـبـرانی**- ص.ن.ع(ئیـبـرانی- ibranî): عیبرانی، جولەکە، زمانی جولەکە.

**عبرانیون**- ص.ع(ئیبرانیون- ibranîyûn): عیبرانیان.

**عبرانیه**- ا.ع(ئیبرانییە- ibranîye): زمانی عیبری، زمانی جولەکە.

**عبرت**- ا.ع(ئیبرەت- ibret): پەند و دەرس، عیبرەت وەرگرتن لە خەڵکییەوە.

**عبرت امیز**- ص.مف(ئیبرەت ئامیز- ibret amîz): پەند ئامـیـز، بە پەندو دەرس تێکەڵ، ئەوەی ببێتە مایەی پەندو دەرس.

**عبرت انگیز**- ص.فا(ئیبرەت ئەنگیز- ibret engîz): مایەی پەند.

**عبرت بین**- ص.فا(ئیبرەت بین- ibret bîn): پەندگـیـر، کـەسێک بە دیتنی شـتێ عـیـبـرەت وەربگرێ.

**عـبـرت پذیر**- ص.فـا(ئیـبـرەت پەزیر- ibret pezîr): پەندگیر.

**عبرت گرفتن**- مص.ل(ئیبرەت گیریفتەن- ibret giriften): پەند وەرگرتن لە خەڵکییەوە.

**عـبـرت نما**- ص.فـا(ئیـبـرەت نەمـا- ibret nema): ئەوەی کە مایەی عیبرەت بێ، ئەوەی مایەی سەرسامی بێ، پەند نەما.

**عبره**- ا.ع(ئەبرە- ebre): فـرمێسـک، ڕوندک، ئەسرین، خەمی بێ گریان.

**عـبـره**- ا.مص.ع(ئەبرە- eber): پەڕینەوە، تێپەڕ بوون لە شوێنێکەوە.

**عبره**- ا.ع(ئیبرە- ibre): خەراج، باج.

**عـبـری**- ص.ن(ئیـبـری- ibrîy): عـیـبـری، یەهوودی.

**عبس**- مص.ل.ع(ئەبس- ebs): ڕووگـرژ کـردن، مۆن کردن.

**عبس**- ا.ع(ئەبس- ebs): جۆرە ڕووەکێکە.

**عبقر**- ا.ع(ئەبغەر- ebxer): ناوی دۆڵێکە کە عەرەبەکان پێیان وابوو جن و پەری زۆری تیایە.

**عـبـقـره**- مص.ع(ئەبغـەرە- ebxere): درەوشـانەوە، بریقـەدانەوەی شـتـێکی وەکـو تراویلکە.

**عـبـقـری**- ص.ن.ع(ئەبغـەری- ebxerî): سەرۆک، سـەروەر، سەرداری قـەوم، هەر شـتێکی چاکو دەگـمـەن، فـەرشی حـەریر،، جلو بەرگی فاخیر.

**عـبـقریه**- ص.ن.ع(ئەبغـەرییـە- ebxerîye): هەمان مانای عەبقەری هەیە (بۆ مێ).

**عبل**- ا.ع(ئەبەل- ebel): هەر گەلایەکی لوولی باریک وەکو گەلای دارگەز.

**عبـــودت**- مص.ع(ئوبوودەت- ubûdet): عەبدایەتی کردن، عیبادەتکردنی خوا، خواپەرستن.

**عبـــوديت**- مص.جع(ئوبوودییەت- ubûdîyyet): خواپەرستن، گوێڕایەڵی، ملکەچی، بەندایەتی کردن.

**عبور**- مص.ل.ع(ئوبوور- ubûr): ڕەت بوون، تێپەڕبوون، پەڕینەوە.

**عبور**- ا.ع(ئەبوور- ebûr): دوو خوشک، دوو ئەستێرەی سیوەیل.

**عبوس**- مص.ل.ع(ئوبووس- ubûs): مۆن بوون، ڕووگرژکردن، چارە بەیەکادان.

**عبوس**- ص.ع(ئەبوس- ebûs): زۆر ڕووگرژ، تووڕەو ترۆ، مۆن.

**عبهر**- ص.ع(ئەبهەر- ebher): گۆشتن، قەڵەو، خۆش هەیکەل.

**عبهر**- ا.ع(ئەبهەر- ebher): نێرگیز، یاسەمین.

**عبيد**- ا.ع(ئەبید- ebîd): بەندە و کۆیلان.

**عبيد**- ا.ع(ئوبەید- ubeyd): عەبدی بچووک، عەبدۆکە، بەندەی بچووک.

**عبير**- ا.ع(ئەبیر- ebîr): عەبیر، بۆنی خۆش، بۆنی خۆشی پێکهاتوو لە مسک و گوڵاو و سەندەڵ و زافەران.

**عبيراگين**- ص.مر(ئەبیرئاگین- abîr agîn): عەبیر ئامێز، تێکەڵ بەعەبیر.

**عبير الا**- ص.مر(ئەبیر ئالا- ebîr ala): ئاوێتە بە عەبیر.

**عبير اميز**- ص.مر(ئەبیر ئامیز- ebîr amîz): ئاوێتە بە عەبیر.

**عبير سرشت**- ص.مر(ئەبیر سیریشت- ebîr sirişt): ئاوێتە بە عەبیر.

**عبيرفشان**- مص.فا(ئەبیر فیشان- ebîr fişan): عەبیر پرژێن.

**عتائق**- ص.ع(ئەتائیغ- etaix): کۆنینان، دێرینان.

**عتاب**- مص.ل.ع(ئیتاب- itab): گلەیی کرن، تووڕەبوون، سەرزەنشت کردن.

**عتابى**- ص.ن.ع(ئەتتابی- ettabî): جۆرە کوتاڵێکە لە کۆنا لە گەڕەکی عەتابییەی بەغدا دروستکراوەو ئیدی ئەو ناوەی وەرگرتووە.

**عتاد**- مص.ع(ئەتاد- etad): ئامادەبوون، ئامادەیی، حازربوون.

**عتاد**- ا.ع(ئەتاد- etad): ئەوزارو کەرەستەی جەنگ، عەتاد.

**عتاق**- مص.ل.ع(ئەتاغ- etax): ئازادبوونی بەنە، ڕزگاربوونی بەندە لە تەوقی کۆیلایەتی.

**عتاق**- ا.ص.ع(ئوتاغ- utax): شەرابی کۆنی گەڕاوەی نایاب.

**عتاهيه**- ا.ص(ئەتاهییە- etahîte): ئەقڵ سووک، بێ ئەقڵ، گومرای بێ ئاوەز.

**عتبات**- ا.ع(ئەتەبات- etebat): مەرقەدو مەزارە پیرۆزەکان.

**عتبه**- ا.ع(ئەتەبە- etebe): دەرگا، ئاستانە، سەردەرانە.

**عترت**- ا.ع(ئیترەت- itret): زوڕیەت، نەوەو نەتیرە،ماڵبات، عەشرەت.

**عتق**- مص.ل.ع(ئیتغ- itx): ئازادبوون، ڕزگاربوونی بەندە لە تەوقی کۆیلایەتی، شەرەفو گەورەییو نەجابەتو ئازادی.

**عتقاء**- ا.ع(ئوتەغاء- 'utexa): هەڵبژاردەی هەر شتێک، ئەسپی ڕەسەن، شەرابی کۆنو خاڵیسەو نایاب.

**عتل**- ص.ع(ئوتوول- utûl): زۆرخۆر، سەرکێش، توندە تەبیعەت، ستەمکار، موزیر.

**عتم**- ا.ع(ئوتوم- utum): زەیتونی کێوی.

**عتو**- مص.ع(ئوتوف- utuv): زوڵم کردن، نەهەقی کردن، فیزکردن.

**عـتـه**- مص.ل.ع(ئەتەھ- eteh): کـەم ئەقڵ بوون، حەسوودی و چاوچنۆکی، سەرگەردان بوون.

**عتیب**- ا.ع(ئیتیب- itîb): عیتاب، گلەیی، زیزی، سەرزەنشت، لۆمە، تۆران.

**عـتـیـد**- ص.ع(ئەتیـد- etîd): حـازرو ئامـادە، بەکەڵەش، زەلام.

**عـتـیـدە**- ا.مص.ع(ئەتیـدە- etîde): پاکەت یان سەندوقچەی بۆن و هەمـوو ئەوزارێکی ئارایشت.

**عـتـیـرە**- ا.ع(ئەتیـرە- etîre): مـەڕێکە کـە عـەرەبەکـان لە سـەردەمی جاهلییـەتدا لە مـانگی ڕەجـەبدا بۆ بتـەکـانی خـۆیان سـەر دەبڕی، مـەڕی قوربانی.

**عـتـیق**- ص.ع(ئەتیخ- etîx): کـۆنینە، دێرینە، نایابو دەگمەن، بەندەی ئازادکراو.

**عـتـیـقـە**- ص.ع(ئەتیـخـە- etîxe): کۆنـینە (بۆ مێ).

**عـشـار**- مص.ل.ع(ئیـسـار- isar): نوچدان، نسکۆ، خزین، سەرەسمدان.

**عـثـار**- ا.ع(ئیسـار- isar): کـۆسپ، تەگـەرە، شەڕ، بەڵا، تالوکە.

**عـثـر**- مص.ل.ع(ئەسر- esr): نوچدان، نسکۆ، خزین، ڕەتبردن.

**عـثـرات**- ا.ع(ئەسـەرات- eserat): نوچدانان، خزینان.

**عـثـرت**- ا.مص.ع(ئەسـرەت- esret): خـزین، نوچدان، نسکۆ، جەنگ، هەڵەو سەهوان.

**عـثـمـان**- ا.ع(ئوسـمـان- usman): بێچـووە سوێسکە، مار، تولەمار، ناوی پیاوانە.

**عـثـور**- مص.ع(ئوسـوور- suûr): دۆزینەوە، بەدەست هێنانی شـتـێک، زانینی کـارێک یان نهێنییەک.

**عـثـور**- ص.ع(ئەسـوور- esûr): کـەسـێک زۆر بخزێ، یان زۆر ساتمەبکات.

**عـجـائب**- ص.ا.ع(ئەجـائیب- ecaib): شـتـێن سەیر.

**عـجـائز**- ا.ص.ع(ئەجائیـز- ecaiz): پیـرەژن، پیرەمێردان.

**عـجـاب**- ص.ع(ئوجـاب- ucab): هەر شـتـێ مایەی سەرسامی بێ.

**عجاج**- ا.ع(ئەجاج- ecac): گەردوبا، تۆزوبا، تەپو دووکەڵ.

**عـجـاج**- ص.ع(ئەجـاج- ecac): گـەلـحـۆ، کەودەن، هەتیوچە.

**عـجـاج**- ص.ع(ئەجـجـاج- accac): دەم بە هاوار، بەناوبانگ.

**عـجـال**- ا.ع(ئیـجـال- ical): پێـچکە، تایە، چەرخ.

**عجالە**- ا.ع(ئیـجالە- icale): عەجەلە، پەلە، کـارێ کـە بە پەلە بکرێ، خـواردنێ کـە بە پەلە بۆ میوان ئامادە بکرێ.

**عـجـالە**- ف(ئەجـالەتەن- ecaleten): جـارێ، ئێستا، هەر ئێستا.

**عـجـان**- ا.ع(ئیـجـان- ican): کـەفـەڵ، سـمت، گەردن، ژێرچەناگە.

**عـجـان**- ص.ع(ئەجـجـان- eccan): گـەوج، هەویرشێل.

**عـجب**- ا.مص.ع(ئوجب- ucb): خـۆپەسندی، ڕوح زلی، عوجب زلی، بەخۆنازین.

**عـــجـب**- مـص.ل.ع(ئەجـــەب- eceb): سەرسوڕمان، حەپەسان.

**عـجـز**- مص.ل.ع(ئەجـز- ecz): ناتـوانایی، ماندووبوون.

**عـجـز**- ا.ع(ئەجـوز- ecûz): پاشکۆ، پاشـەڵ، سمت، نیوەی دووەمی بەیتە شیعر.

**عجزە**- ص.ع(ئەجەزە- eceze): کەنفت، پیرو پەککەوتوان، لاوازو بێ توانایان.

**عجل**- ا.ع(ئیجل- icl): گۆلک، گوێرەکە.

**عـجـل**- ا.ع(ئەجـەل- ecel): پێـچکە، چەرخی ئاو، تایە.

**عـجـلان**- ص.ع(ئەجـلان- eclan): تیـژڕەو، خێرا، بلەز.

**عجله**- مص.ل.ع(ئەجەلە- ecele): پەلەکردن، لەزکردن.

**عجله**- ا.ع(ئیجلە- icle): گوێرەکەی مێ، هێزەی ڕۆن، تۆیشەبەرە، چەرخی ئاو.

**عجله**- ا.ع(ئەجەلە- ecele): پێچکەی عارەبانە، چەرخ و دۆلابی ئاو.

**عجله**- ا.ع(ئوجلە- ucle): خواردنێ بەپەلە ئامادە بکرێ.

**عجم**- ا.ع(ئەجەم- ecem): غەیرە عەرەب، نا عەرەب، وڵاتی ئێران.

**عجم**- ص.ع(ئوجم- ucm): لاڵ، کەسێک کە زمان بگرێ، زمانگیر، زمانخوار.

**عجم**- ا.ع(ئەجم- ecm): بنەوانی کلک، کلێنچک.

**عجماء**- ص.ع(ئەجماء- ecma'): ژنی زمانگیر، حەیواناتی بەستەزمان.

**عجماوات**- ص.ع(ئەجماڤات- ecmavat): چوار پێیانی بێ زمان.

**عجمت**- مص.ع(ئوجمەت- ucmet): زمانگرتن.

**عجمی**- ص.ن.ع(ئەجەمی- ecemî): ناعارەب، کەسێک نەتوانێ مەبەستی خۆی دەربڕێ، نابەڵەدو گێلوغافڵ.

**عجن**- مص.م.ع(ئەجن- ecn): هەویر شێلان.

**عجوز**- مص.ل.ع(ئوجووز- ucûz): پیربوون، پەککەوتن.

**عجوز**- ص.ع(ئەجووز- ecûz): پیرەژن، پیرەمێرد.

**عجول**- ص.ع(ئەجوول- ecûl): پەلەکەر، کەسێک کارێک بە پەلە ئەنجام بدات، پەلەکار، لەزکار.

**عجول**- ا.ع(ئوجوول- ucûl): گوێرەکان.

**عجولانه**- ق.ص(ئەجولانە- ecûlane): عەجولانە، بەپەلەو خێرایی.

**عجیب**- ص.ع(ئەجیب- ecîb): عەجیب، سەیر، سەرسوڕهێنەر.

**عجیبه**- ص.ع(ئەجیبە- ecîbe): سەیرو عەجیب.

**عجیج**- مص.ع(ئەجیج- ecîc): بانگ کردن.

**عجین**- ا.ع(ئەجین- ecîn): هەویر، شێلراو.

**عد**- مص.م.ع(ئەدد- edd ): ژماردن.

**عدات**- ص.ع(ئودات- udat): دژمنان، نەیاران، ناحەزان.

**عداد**- ا.ع(ئیداد- idad): هاوتا، هاوشان، حەریف، هاوڕک، ریز.

**عدالت**- مص.ل.ع(ئەدالەت- edalet): دادوەربوون، عەدالەت.

**عدالت پیشه**- ص.مر(ئەدالەت پیشە- edalet pîşe): دادپیشە، دادوەر.

**عدالتخانه**- ا.مر(ئەدالەتخانە- edalet xane): عەدالەتخانە، دادگا.

**عدالت گستر**- ص.فا(ئەدالەت گوستەر- edalet guster): دادوەر، دادپەروەر.

**عداوت**- مص.ع(ئەداڤەت- edavet): دژمنایەتی، نەیاری.

**عدت**- ا.ع(ئودەت- uddet): پێداویستی ژیان، کەرەستەو چەکو تەقەمەنی شەڕ.

**عدد**- ا.ع(ئەدەد- eded): ژمارە.

**عددی**- ص.ن.ع(ئەدەدی- ededîy): ژمارەیی، شتێ بە ژمارە بفرۆشرێت.

**عدس**- ا.ع(ئەدەس- edes): نیسک.

**عدسک**- ا(ئەدەسەک- edesek): جۆرە گیایەکە.

**عدسه**- ا.ع(ئەدەسە- edese): هاوێنە، عەدەسە.

**عدسی**- ا(ئەدەسی- edesî): بەشێکی چاوە کە لە پشتی بیلبیلەی چاوەوەیە.

**عدسی**- ا.ع(ئەدەسی- edesî): شۆربای نیسک، نیسکەوا.

**عدل**- مص.ل.ع(ئەدل- edl): دادکردن، هەقدان.

**عــــدل**- ص.ع(ئەدل- edl): راست و دروستو بەرانبەر، هاوتا، چوون یەک، کەسێک کەشایەتی قەبوڵ بێ.

**عــدل**- ا.ع(ئیــدل- idl): هاوتا، بەرانبــەر لە سەنگو کێشدا، تایەکی بار.

**عــدلاء**- ص.ع(ئودەلاء- 'udela): هاوتایان، بەرانبەران.

**عــدل گــســتــر**- ص.فــا(ئەدل گــوســتــەر- edl guster): دادپەروەر.

**عــدله**- ص.ع(ئەدەلە- edele): کەسانێک کە شایستــەی شایەتی دان بن لە حوزوری قــازیدا، کەسانێک بە شایەت قەبوڵ بکرێن.

**عـــدلیـــه**- ا.ع(ئەدلیــــیــــە- edliyye): عەدالەتخانە، دادگە.

**عــدم**- مص.ع(ئەدەم- edem): نەبوون، نابوت بوون، نەهلیزم.

**عــدن**- مص.ل.ع(ئەدن- edn): ئاکنجی بوون لە شوێنێکدا، بەهەشتی عەدن، مانەوەی یەکجارەکی لە شوێنێکدا.

**عـــــدو**- ا.ص.ع(ئـەدوڤ- eduvv): دژمـن، نەیار.

**عـــــدوان**- مص. ل.ع(ئودڤــــان- udvan): دژمنایەتی کردن، زوڵم کردن لە کەسێک.

**عـــــدوبند**-ص.فــــا(ئەدوڤ بـەند- eduvv bend): دژمنگیر، کەسێک دژمن یەخسیر بکاو بیگرێ.

**عــدول**- مص.ل.ع(ئودوول- udûl): گـەڕانەوە، وازهێنان، چاوپۆشین.

**عــدول**- ص.ع(ئودوول- udûl): کـەســانێک شایەتیان قەبوڵ بێ، هەق دەرەوان.

**عدومال**- ص.فا(ئەدوومال- edûmal): دژمن بەزێن، دژمن شکێن، دژمن شێل.

**عـــــدوی**- ا.ع(ئەدڤــــا- edva): تەنینەوە، سیرایەتکردنی نەخۆشی، زێدەگاڤی.

**عــده**- ا.ع(ئیــدده- idde): رۆژانی بێ نوێژی ژن، ئەو مــاوەیەی کــە ژنی مــێــرد مــردوو یان تەڵاقــدراو نابێ شووی تیــا بکاتەوە، ژمــارەیەک خەڵکی.

**عـــــدید**- ا.ص.ع(ئەدیـد- edîd): چەنـدین، ژمارەیەک، ژمێردراو، بەش.

**عـــــدیده**- ا.ص.ع(ئـەدیـدە- edîde): زۆر، چەندین، ژمێردراو.

**عدیل**- ص.ع(ئەدیل- edîl): هاوتا، بەرانبەر.

**عــدیم**- ص.ع(ئەدیم- edîm): نابوت، نـایاب، نەماو.

**عـــــــذاب**- ا.عــ(ئـەزاب- ezab): ئـازار، ئەشکەنجە، عەزاب، ئەزیەت.

**عذاب**- ص.ع(ئیزاب- izab): سازگار، خۆشو بەلەزەت.

**عــذار**- ا.ع(ئیـزار- izar): روخســار، ردێن کـە تازە هاتبێ، جی رەشـــــمــــەی ولاخ بەســــەرو کەللەیەوە.

**عــذاری**- ا.ع(ئەزارا- ezara): پاکیــزە، کیــژ، دوێت، کەنشک.

**عــذب**- ص.ع(ئەزب- ezb): سـازگـار، خۆش، شیرین، بەلەزەت.

**عـــــذب**- ا.ع(ئـەزەب- ezeb): لـق و پۆپـی درەخت، بەنی تەرازوو.

**عــذر**- مص.ل.ع(ئوزر- uzr): تەوازۆ خــواستن، عــوزرخــواستن، خـۆشـبـوون لە کــەســێک غــوزر هێنانەوە، بیانوو، بەهانە.

**عـــذراء**- ص.م(ئەزراء- 'ezra): گــــەوهەری نەسمراو، کچ، پاکیزە، دوێت.

**عـــذر اوردن**- مص.ل(ئوزر ئاڤــــەردەن- uzr averden): عوزر هێنانەوە، داوای بووردن.

**عذر پذیر**- ص. فا(عـوزر پەزیر- uzr pezîr): عوزر پەزێر، ئەوەی عوزرو بیانووان قەبوڵ بکات.

**عــذر خــواستن**- مص.ل(ئوزر خـاســتــەن- uzr xasten): عوزر خواستن، داواکردنی بەخشین.

**عــذر خــواه**- ص.فــا(ئوزرخــاه- uzr xah): بەهانەخــواز، کــەســێک عــوزر بێنێــتــەوەو داوای لێبووردن بکات.

**عذرخواهی**- ا.مص(ئوزر خاهی- uzrxahî): عوزرخوازی.

**عذر داشتن**- مص.ل(ئوزر داشتەن- uzr daşten): بیانوو هەبوون، بێ نوێژبوون(بۆ ژن).

**عذرنیوش**- ص.فا(ئوزر نەیوش- uzr neyuş): عوزر پەزیر، کەسێک کە عوزر قەبوڵ بکات.

**عذره**- ا.مص.ع(ئوزرە- uzre): بەکارەت، کچێنی.

**عذره**- ا.ع(ئوزرە- uzre): پەرچەم، کاکۆڵ.

**عذره**- ا.ع(ئەزیرە- ezire): گو، دەرگا.

**عذق**- ا.ع(ئیزغ- izx): لقی درەخت کە وردە لقی هەبێ، هێشوو، بۆڵ، هێشووی خورما، یان ترێ.

**عذوبت**- مص.ل(ئوزوبەت- uzûbet): زوڵاڵ و سازگار، (بۆ شەراب یان ئاو)، خۆش و بەلەزەت.

**عرابی**- ا(ئەرابی- erabî): عارەبی بیابان نشین.

**عراجین**- ا.ع(ئەراجین- eracîn): بنجی بۆڵی خورما، لقی هێشووی خورما.

**عراده**- ا.ع(ئەرادە- erade): جۆرە تۆپێکی کۆنە بۆ هاویشتنی بەرد لە جەنگدا بەکار هاتووە، مەنجەنیق.

**عرار**- ا.ع(ئەرار- erar): نێرگزی کێوی.

**عرارت**- ا.مص.ع(ئەرارەت- eraret): بەدخوویی، سەختی، گەورەیی.

**عراضه**- ا.ع(ئورازە- uraze): دیاریی، دەست و دیاری.

**عراف**- ص.ع(ئەراف- eraf): لێزان، فاڵچی، جادووگەر، سیحرباز، غەیب زان، ئەستێرەناس.

**عرافت**- مص.ل.ع(ئەرافەت- erafet): لێزانی، دانابوون، بوون بە بەرێوەبەرو خودان کار، کەوتنە تەگبیری کاری خەڵکی، دەم سپێتی.

**عرافت**- ا.مص.ع(ئیرافەت- irafet): لێزانی، فاڵچێتی، غەیبزانی، دکتۆری، ئەستێرەناسی.

**عراق**- ا.غ(ئیراغ- irax): کەناری رووبار یان دەریا.

**عراقیب**- ا.ع(ئەراغیب- eraxîb): دەماری سەرووی پاژنە، رێگەی پێچاو پێچی ناهەمواری ناو شاخان، یان کەناری رووباران، فێڵ، نێرەنگ، درۆزنو بێ وەعدو بەڵێن.

**عرامت**- مص.ع(ئەرامەت- eramet): گەندەڵ بوون، لەناوچوون.

**عرانین**- ا.ع(ئەرانین- eranîn): بێشە، نیزار، لانەی شێرو کەمتیارو گورگان.

**عرایس**- ا.ع(ئەرایس- erayîs): بووکان.

**عرایض**- ا.ع(ئەرایز- erayîz): سکاڵا، عەریزە، عەرزو حاڵ.

**عرایک**- ا.ع(ئەرایک- erayîk): نەفس، تەبیعەت، سرووشت، خوو.

**عرب**- ا.ع(ئەرەب- ereb): عارەب.

**عربات**- ا.ع(ئەرەبات- erebat): عارەبانە، گاری، گالیسکە.

**عربانه**- ا.ع(ئەرەبانە- erebane): عەرەبانە، گالیسکە.

**عربده**- ا.مص.ع(ئەربەدە- erbede): بەدخوویی، بەد رەفتاری، بەد مەستی، شەڕەنگێزی نەعرەتەو هاوار.

**عربده‌جو**- ص.فا(ئەربەدەجو- erebede cû): شەڕانی، ئاژاوەچی، بەدمەست، فێڵباز.

**عربده‌جویی**- ا.مص(ئەربەدە جویی- erbede cûyî): بەدمەستی، ئاژاوەچێتی، شەڕخوازی، فێڵبازی.

**عربون**- ا.ع(ئەرەبوون- erebûn): بێعانە، پێشەکی سەودا.

**عربه**- ا.ع(ئەرەبە- erebe): عەرەبانە، گالیسکە، گاریە.

**عربی**- ص.ن.ع(ئەرەبی- erebî): عەرەب، لە قەومی عەرەب، زمانی عارەوی.

**عربیه**- ص.ن.ع(ئەرەبییە- erebîyye): زمانو کەلتووری عەرەب.

**عــرج**- مص.ل.ع(ئەرەج- erec): لەنگبــوون، لەنگین، شەلین.

**عرج**- ص.ع(ئورج- urc): لەنگ، شەل.

**عـرجاء**- ص.ع(ئەرجاء- ’erca): ژنی لەنگ، مێینەی شەل.

**عرجاء**- ا.ع(ئەرجاء- ’erca): کەمتیار.

**عـرجان**- ص.ع(ئورجـان- urecan): لەنگان، شەلان.

**عرجون**- ا.ع(ئورجوون- urcûn): لقی هێشووە خورما.

**عـرس**- ا.ع(ئیـرس- irs): هاوسـەر (ژن بێ یان پیاو).

**عــرس** ا.ع(ئورس- urs): زەمــاوەند، داوەت‌و شاهیان، گۆڤەند، سوبیر.

**عــرش**- ا.ع(ئەرش- erş): عــەرش، تەخت، خێوەت، سابات، میچ، سابیتە، قەسر.

**عرشە**- ا.ع(ئیـرشە- ireşe): زەمینەی سەربانی کەشتی.

**عــرصــات**- ا.ع(ئەرەســات- eresat): رۆژی قیامەت‌و سارای مەحشەر، گۆڕەپان.

**عرصە**- ا.ع(ئەرسە- erse): مەیدان، حەوشە، مەیدانی بەردەم ئەپارتمان.

**عـــرض**- مص.ع(ئەرز- erz): ئاشکراکـــردن، خستنەڕوو، نیشاندان.

**عــرض حــال**- ا.مــر(ئەرزی هال- erzi hal): عەرزوحاڵ، سکالانامە.

**عرض**- ا.ع(ئەرز- erz): پان، پانی.

**عـرض**- ا.ع(ئیـرز- irz): نەفس، خـود، بەدەن، جەستە، نامووس‌و ئابڕو، رەگ‌و رەچەڵەکێک کە مرۆڤ شانازی پێوە بکات.

**عرض**- ا.ع(ئەرز- erz): کالا، کەلوپەل.

**عــرض**- ا.ع(ئەرەز- erez): کـالا، کـەلوپەل، نیشانەکانی نەخۆشی، شتی کاتی‌و ناپایەدار.

**عرض**- ا.ع(ئورز- urz): ملەی کێـو، ناوەندەی دەریا، لا، رۆخ، کەنار.

**عـرضگاه**- ا.مر(ئەرزگاه- erzgah): مـەیدانی عــەرەزاتی لەشکریــان، شــوێنی نمایش کــردنی شتێک، مەیدانی دیتن و سەرژمێرکردنی سوپاییان.

**عرضە**- ا.ع(ئورزە- urze): هیـممت، لیـاقەت، غیرەت، توانا.

**عرضە**- ا.ع(ئەرزە- erze): نمایش، نیشاندان.

**عرعر**- اا(ئەرئەر- erer): زەڕەی نێرەکەر، سەرین.

**عرعر**- ا.ع(ئەرئەر- erer): درەختی عەرعەر.

**عـرف**- ا.ع(ئورف- urf): چاکی و جوامـێـری، داب و نەریت، خووخدە.

**عـرف**- ا.ع(ئورف- urf): پۆپنەی کـەڵەشـێـر، شەپۆڵی دەریا، پێل، شوێنی بەرز، یاڵی ئەسپ.

**عرف**- ا.ع(ئەرف- erf): بۆن، بۆنی خۆش.

**عــرفــاء**- ا.ع(ئورەفــاء- ’urefa): پیــاوانی عارف، سۆفیان، زانایان.

**عــرفــات**- ا.ع(ئەرەفــات- erefat): شــوێنی حاجیان لە نزیکی مەکە.

**عرفان**- مص.ع(ئیرفان- irfan): ناسینی خوا، خواناسی.

**عرفج**- ا.ع(ئەرفەج- erfec): جۆرە رووەکێکە.

**عـرفـە**- ا.ع(ئەرەفـە- erefe): ناوی کـێـوێکە نزیکی مـەکە، حاجییان لە رۆژی مـانگی قوربانـدا لەوێندەر دەوەستن.

**عـرق**- ا.ع(ئەرەغ- erex): جـواناو، عـارەقـەی لەش، عەرەقی خواردنەوە، مەی، خۆ.

**عرق**- ا.ع(ئیرغ- irx): رەگ و ریشە.

**عرق جوش**- ا.مر(ئەرەغ جووش- erex cûş): گەرمەژنە.

**عــرقــچین**- ا.مــر(ئەرەق چین- erex çîn): عەرەق چن، کلاو.

**عـرق خـور**- ص.فـا(ئەرەغ خـور- erex xûr): عارەقخۆر، مەی خۆرەوە.

**عـرق سـوز**- ا.مـر(ئەرەغ سـووز- erex sûz): ســوتانەوەی پێـــســتی لەش لە ئەنجـــامی عەرقکردنەوەی زۆر.

**عـرقگیـر**- ص.فـا (ئەرەغ گـیـر- erex gîr): ئەوەی ئاوی مـیـوەو رووەکـان بگرێ، فـانیلەی ژێرەوە.

**عـرق مـدنی**- ا.مـر (ئیـرغی مـەدەنی- irexî medenî): جـۆرە کـرمـێکە لە لەشـدا پەیدا دەبێ.

**عـرقناک**- ص.مـر (ئەرەغناک- erexnak): ئارەقاوی.

**عرقوب**- ا.ع (ئورغوب- urxûb): دەمارێکی ئەسـتـورە لە سەرووی پاژنەوە، رێگەی پێچاوپێچ لەناو شاخ یان کەناری رووبار، فـروفـێڵ، پیـاوی درۆزنی بێ وەعدو بەڵێن.

**عرقیه**- ا.ع (ئەرەغییە- erexîye): ئارەقچن، کڵاوی ژێر مێزەر یان عەمامە.

**عرم**- ا.ع (ئەریم- erim): بارانی توند، بەنداو، لافاوێکی گەورە بوو کە نزیکەی سەدەی دووەمی پێش زایین لە نزیکی شـاری سـەبا ء هەسـتـاو بەنداوی مـەئرەبی رووخـانو بووە مـایەی لەناوچوونی دەوڵەتی سەبا ء.

**عـــــرم**- ا.ع (ئەرەم- erem): رەشی تێکەڵ بەسپی، جێزی گەنم، خەرمانی سور.

**عـرم**- ا.ع (ئەرەم- erem): گـۆشت و چەوری بنی مەنجەڵ.

**عـرن**- ا.ع (ئەرەن- eren): گـوشـتی کـولاو، نەخۆشییەکە لە پاییـنی دەست و پاشووی چارەوێ دەدا.

**عرنین**- ا.ع (ئیرنین- irnîn): کەپوو، ئێسکی درشتی کەپوو، سەرەتای هەر شتێک، گەورەو دەم سپی قەوم.

**عـــــروبت**- مص.ع (ئورووبەت- urûbet): عەرەبایەتی، قسەکردن بە عەرەبی.

**عروبه**- ا.ع (ئەرووبە- erûbe): رۆژی هەینی.

**عـــــروبیت**- مـص.ع (ئورووبیـــــــــەت- urûbîyyet): عەرەبایەتی، قسەکردن بە زمانی عەرەبی.

**عـروج**- مص.ع (ئورووج- urûc): سـەرکـەوتن، بەرزبوونەوە، چوونەبەرزی.

**عـــــروج**- مـص.ع (ئورووج- urûc): لەنـگین، شەلین.

**عروس**- ا.ص (ئەرووس- erûs): بووک، نارین.

**عـروسـانه**- ق.ص (ئەرووسـانە- erûsane): بووک ئاسا.

**عـروس پس پرده**- ا.مـر (ئەروسی پەس پەردە- erûsi pes perde): جۆرە رووەکێکە.

**عـروس دەریایی**- ا.مر (ئەرووس دەریایی- erûs deryayî): جـۆرە گـیـانلەبەرێکە لە قـرژاڵ دەچێتو بۆ گۆشتەکەی راو دەکرێ.

**عـروسک**- ا. (ئەرووسـەک- erûsek): جـۆرە مەنجەنیـقێکی بچـوکە لە کۆنا بەرد یان ئاگریان پێ دەهاویشتە سەر دژمن.

**عـروسک**- ا. (ئەرووسـەک- erûsek): بووکـە شووشە، بووکەڵە، وەلکان.

**عروض**- ا.ع (ئەرووز- erûz): کێشی هۆنراوە، عەروز، گۆشە، رێگەی ناو شاخان.

**عروض**- ا.ع (ئورووز- urûz): کالا، کەلوپەل.

**عـروضی**- ص.ع (ئەرووزی- erûzî): عـەروز زان، شارەزا لە زانستی عەروز.

**عروف**- ص.ع (ئەرووف- erûf): زۆر زانا.

**عروق**- ا.ع (ئورووغ- urû¨x): دەمار، رەگان.

**عـروق شـعـریه**- ا.مر (ئورووغ شەئرییە- urûx şe'rîye): باریکە دەمـار، وردە دەمـار، دەزوولە رەگ.

**عـروه**- ا.ع (ئورڤـە- urve): دەسک، دەسکی مەسینە،ماڵی گرانبەها، ئەوەی جێی متمانەبێ.

**عـری**- ا.ع (ئەرا- ara): لا، کـەنار، مـەیدان، دەرگا.

**عـــری**- ا.ع (ئەرا- era): سـەرمـا، هەرەتی سەرما، جەرگەی سەرما، جەوەرە، تەشخەڵە.

**عری**- ا.ع (ئەری- erîy): بای سارد.

**عریان**- ص.ع (ئوریان- uryan): رووت.

**عریس**- ا.ص (ئەریس- erîs): زاوا، زاڤا.

**عریس**- ا.ع(ئیریس- irîs): شوێنی شێر، لانەی شێر، جێی خەوی شێر.

**عریش**- ا.ع(ئەریش- erîş): کەپر، خێوەت، داربەست، قایەمێو.

**عریشە**- ا.ع(ئەریشە- erîşe): کەژاوە.

**عریض**- ص.ع(ئەریز- erîz): پان.

**عریضە**- ص.ع(ئەریزە- erîze): سکاڵا، عەرزو حاڵ.

**عریف**- ص.ع(ئەریف- erîf): دانا، شارەزا، دەم سپی قەوم.

**عریکە**- ا.ع(ئەریکە- erîke): نەفس، خود، تەبیعەت، سروشت، خوو.

**عریم**- ا.ع(ئەریم- erîm): دژواری و بەڵا، ناخۆشی و تەنگانە.

**عرین**- ا.ع(ئەرین- erîn): بێشە، چڕە دارستان، لانەی شێر و گورگ و کەمتیار.

**عز**- مص.ل.ع(ئیز- izz): سەربەرز بوون، گەورەیی، ڕێزداری.

**عزاء**- مص.ل.ع(ئەزاء- eza’): سەبرکردن، سەبرو تەحەمول لە ماتەمو ئەو مسیبەتانەی دێنە پێشێ، تازیە، پرسە، ماتەم.

**عزائم**- ا.ع(ئەزائیم- ezaim): وێرد و دوعایەک کە لەسەر نەخۆش بخوێنرێ بە مەبەستی چاک بوونەوە، ویست و عەزمی نەگۆڕ.

**عزاب**- ص.ع(ئوززاب- uzzab): ڕەبەن، پیاوی بێ ژن، پیاو یان ئافرەتی بێ کەس و تەنیا.

**عزاخانە**- ا.مر(ئەزاخانە- ezaxane): پرسەخانە، شوێنێ کە پرسەی لێ دابنرێ.

**عزادار**- ص.مر(ئەزادار- ezadar): تازیەبار، پرسەدار.

**عزاداری**- ا.مص(ئەزاداری- ezadarî): تازیەباری، پرسەداری.

**عزاز**- ص.ع(ئیزاز- izaz): عەزیزان، ڕێزداران، هێژایان.

**عزازیل**- ا.ع(ئەزازیل- ezazîl): وشەیەکی عیبرییە بە مانای عەزیزی خوا دێت، لەقەبی ئیبلیسە بەر لە ترۆکردنی، ئەم ناوە لە ئەدەبیاتی فارسیدا بە مانای شەیتان ماوەتەوە.

**عزال**- ا.ع(ئیزال- izal): سستی، خاوی، لاوازی.

**عزب**- ص.ع(ئەزەب- ezeb): عازەب، خرت.

**عزب خانە**- ا.مر(ئەزەبخانە- ezebxane): ماڵێک چەند عازەبی تێدابێ.

**عزب دەفتەر**- ا.مر(ئەزەب دەفتەر- ezeb defter): کەسێک لە دەفتەرو نووسینگەی حیساباتدا کارێکی تایبەتی نەبێ.

**عزت**- مص.ل.ع(ئیززەت- izzet): سەربەرزبوون، ڕێزداربوون، عیزەتو سەربەرزی.

**عزرائیل**- ا.ع(ئیزرائیل- izraîl): عزرائیل، فریشتەی مەرگ.

**عزل**- مص.ع(ئەزل- ezl): کەنارخستن، یەک لاکردنەوە، جیاکردنەوە، لەسەر کار لادان.

**عزلت**- ا.مص.ع(ئوزلەت- uzlet): دوورەپەرێزی، گۆشەنشینی، کونجگری.

**عزلت گزیدن**- مص.ل(ئوزلەت گوزیدەن- uzlet guzîden): هەڵبژاردنی گۆشەگیری، دوورە پەرێزی.

**عزم**- مص.ع(ئەزم- ezm): عەزم، ویستن، عەزمکردن، سوور بوون لەسەر کارێک.

**عزوبت**- مص.ل.ع(ئوزوبەت- uzûbet): ڕەبەنی، عازەبایەتی، بێ ژن بوون، بێ مێرد بوون، تەنیا بوون.

**عزی**- ا.ص.ع(ئوززا- uzza): ژنی بەڕێزو سەربەرز، ناوی بتێکی تیرەی قورەیش بووە بەر لە پەیدا بوونی ئیسلام.

**عزیز**- ص.ع(ئەزیز- ezîz): هێژا، بەڕێز، بەقەدر، قورسو گران، ئازیز.

**عزیمت**- مص.ل.ع(ئەزیمەت- ezîmet): سوور بوون لەسەر کارێک، ویستن، ڕۆیشتن بەرەو مەبەستێک.

**عزیمە**- ا.ع(ئەزیمە- ezîme): دوعاو وێردێک

لەسەر نەخۆش بخوێنرێ بە مەبەستی چاکبوونەوە، ویستی پایەدارو نەگۆڕ.

**عساكر**- ا.ع(ئەساکیر- esakîr): لەشکران، سوپاییان.

**عسجد**- ا.ع(ئەسجەد- esced): زێڕ، گەوهەرێن مینا: یاقووت و مرواری و....

**عسر**- مص.ل.ع(ئوسر- usr): دژواربوون، ئاستەنگو ناخۆشیو تەنگانە.

**عسرت**- ا.مص.ع(ئوسرەت- usret): دژواری، تەنگانە، دەستکورتی، بێ نەوایی.

**عسس**- ا.ع(ئەسس- eses): شەوگەڕ، حەسحەس، پاسەوانی شەو.

**عسطوس**- ا.ع(ئەسەتووس- esetûs): ناوی درەختێکە لە حەیزەران دەچێت، سەرۆکی نەسرانیان.

**عسكر**- ا.ع(ئەسکەر- esker): لەشکر، سوپا، سەرباز.

**عسكري**- ص.ن(ئەسکەری- eskerî): لەشکری، سوپایی.

**عسكري**- ص.ن(ئەسکەری- eskerî): خەڵکی عەسکەر (شارێکی کۆنی خوزستانە).

**عسل**- ا.ع(ئەسەل- esel): هەنگوین.

**عسلي**- ص.ن.ع(ئەسەلی- eselî): هەنگوینی، زەردباو، زەرد وەکو هەنگوین.

**عسير**- ص.ع(ئەسیر- esîr): سەخت، زەحمەت، دژوار، ئاستەنگ.

**عش**- ا.ع(ئوشش- uşş): هێلانە، هێلین.

**عشا**- ا.مص.ع(ئەشا- eşa): شەوکوێری.

**عشاء**- ا.ع(ئیشاء- işa’): عیشا، هەوەڵی شەو.

**عشاء**- ا.ع(ئەشاء- eşa’): شام، شیو، خواردنی ئێوارێ.

**عشائر**- ا.ع(ئەشائیر- eşair): عەشرەتان، هۆزوتیرە، خێڵ، عێل.

**عشار**- ا.ص.ع(ئەششار- eşşar): دەیەکگیر.

**عشاق**- ا.ع(ئوششاغ- uşşax): ئاشقان، شەیدایان، یەکێکە لە ١٢ مەقامەکەی مۆسیقای ئێرانی.

**عشاوت**- ا.مص.ع(ئەشاڤەت- eşavet): شەوکوێری.

**عشب**- ا.ع(ئوشب- uşb): گیا، گیای تەڕ.

**عشبه**- ا.ع(ئوشبە- uşbe): یەک گیا.

**عشر**- ا.ع(ئەشر- eşr): دە، ژمارە (١٠).

**عشر**- ا.ع(ئوشر- uşr): دەیەک.

**عشرات**- ا.ع(ئەشەرات- eşerat): دەیان.

**عشرت**- ا.مص.ع(ئیشرەت- işret): دۆستی، تێکەڵاوی، رابواردن.

**عشرتخانه**- ا.مر(ئیشرەتخانە- işretxane): شوێنی عەیشو نۆش، جێی رابواردن.

**عشرون**- ا.ع(ئیشرون- işrûn): بیست، ژمارە(٢٠).

**عشره**- ا.ع(ئەشەرە- eşere): دە، ژمارە دە.

**عشرين**- ا.ع(ئیشرین- işrîn): بیست، ژمارە بیست.

**عشق**- مص.ل.ع(ئیشغ- işx): خۆشویستن، دڵداری کردن، ئاشقێنی، ئەڤینی، ئەڤینداری.

**عشق افرين**-ص .فا(ئیشغ ئافەرین- işx aferîn): ئەوەی بە جوانی خۆی ئەشق دروست بکات، ئەوەی بە جوانی خەڵکی عاشقی خۆی بکات.

**عشقباز**- ص.فا(ئیشغ باز- işxbaz): ئاشقێنی، ئەشقبازی، ئاشق پیشە.

**عشق ورزيدن**- مص.ل(ئیشغ ڤەرزیدەن- işx verzîden): ئەشقبازی کردن، ئاشقێنی کردن، دڵداری کردن.

**عشقه**- ا.ع(ئەشەغە- eşexe): لاولاو.

**عشماء**- ص.ع(ئەشماء- eşma’): دوو رەنگی تێکەڵ، زەوی پڕ تۆزو خۆڵ، درەختێک کە لە تۆزو خۆڵدا وشک بووبێ.

**عشواء**- ص.ع(ئەشڤاء- eşva'): شەوکوێر، مێچکە وشترێک کە بەردەم خۆی نەبینێ، تاریکی، جۆرە خورمایەکە.

**عشور**- ا.ع(ئوشوور- uşûr): دەیان.

**عشوە**- ا.ع(ئەشڤە- eşve): تاریکی، چواریەکی هەوەڵی شەو، شیو، شام.

**عشوە**- ا.ع(ئیشڤە- işve): کاری نادیار، نازو عیشوە.

**عشوەگر**- ص.فا(ئیشڤەگەر- işveger): بەنازو عیشوەکار.

**عشی**- ا.ع(ئەشی- eşîy): عیشا، ئێوارە، هەوەڵی شەو.

**عشیر**- ا.ع(ئەشیر- eşîr): دەیەک.

**عشیر**- ا.ع(ئەشیر- eşîr): تیرە، کەسوکار، قەومو قیلە.

**عشیرە**- ا.ع(ئەشیرە- eşîre): عەشیرەت، قەومو قیلە، کەسوکار.

**عشیق**- ص.ع(ئەشیغ- eşîx): عاشق، دڵدار.

**عص**- ا.ع(ئەسا- esa): دار عاسا، داردەست.

**عصائب**- ا.ع(ئەسائیب- esaîb): کۆمەڵە خەڵکێک، عەمامە، مێزەر.

**عصابە**- ا.ع(ئیسابە- isabe): گروپێک، دەستەیەک، مێزەر، شاشک، عەمامە.

**عصات**- ا.فا.ع(ئوسات- usat): یاخیان، سەرکێشان، گوناحکاران.

**عصار**- ا.ع(ئیسار- isar): باهۆز، سەردەم.

**عصار**- ا.ع(ئوسار- usar): شیلە.

**عصار**- ص.ع(ئەسسار- essar): کەسێک کە شیلەی شتێک بگرێ.

**عصارە**- ا.ع(ئوسارە- usare): شیلە، خۆشاو، ئاوی میوە.

**عصاعص**- ا.ع(ئەسائیس- esais): کلێنچکە، کۆتایی بربڕەی پشت، دوا مۆرەغە.

**عصافیر**- ا.ع(ئەسافیر- esafîr): پاساری و چۆلەکان و چێشکەیان.

**عصام**- ا.ع(ئیسام- isam): دەسک، دەسکی گۆزە یان دۆلکە، قولف.

**عصب**- ا.ع(ئەسەب- eseb): ڕەگ، دەماری ئەعساب.

**عصب**- مص.ع(ئەسب- esb): بەستن و توندکردن، پێچان و بادان، مێزەر، شاشک، عەمامە.

**عصب**- ا.ع(ئوسەب- useb): دەستە، گەلە، پۆل.

**عصبە**- ا.ع(ئەسەبە- esebe): خزم و خوێش، خزمی باوک.

**عصبە**- ا.ع(ئەسەبە- esebe): لاولاو.

**عصبی**- ص.ع(ئەسەبی- esebîy): پشتیوانی کردن لە کەسێک یان شتێک.

**عصبی**- ص.ن.ع(ئەسەبی- esebî): تووڕەو توندەتەبیعەت.

**عصبیت**- ا.ع(ئەسەبییەت- esebîyyet): پەرۆشیو پابەندی لە ڕادەبەدەر بۆ شتێک یان کەسێک یان نەتەوەیەک.

**عصر**- ا.ع(ئەسر- esr): عەسر، دوا نیوەڕۆ تا ئێوارێ، ڕۆژگار، سەردەم.

**عصر**- مص.ع(ئەسر- esr): گوشین، گوشینی شتێک بۆ گرتنی ئاوەکەی یان شیلەکەی.

**عصرانە**- ا.ع(ئەسرانە- esrane): عەسرەخواردن.

**عصعص**- ا.ع(ئوس ئوس- 'us'us'): کلێنچکە، دوا مۆرەغەی پشت.

**عصفر**- ا.ع(ئوسفور- usfur): جۆرە گوڵێکە.

**عصفور**- ا.ع(ئوسفور- usfûr): تەیری بچووکتر لە کۆتر، چۆلەکە، پاساری، چێشکە.

**عصمت**- ا.مص.ع(ئیسمەت- ismet): داوێن پاکی، خۆ پارێزی لە گوناح و خەتا.

**عصور**- ا.ع(ئوسور- usûr): سەردەم و ڕۆژگاران، دەورو زەمانان.

**عصی**- ص.ع(ئەسیی- esîy): عاسی، یاخی.

**عصی**- ا.ع(ئوسی- usî): دار دەستان.

**عصیان**- ا.مص.ع(ئیسیان- isyan): یاخی بوون، سەرپێچی .

**عصیان گر**- ص.فا (ئیسیان گەر- isyan ger): یاخی، سەرپێچیکار، سەرکێشی کەر، گوناحکار.

**عصیب**- ا.ع(ئەسیب- esîb): باسترمە.

**عصیده**- ا.ع(ئەسیدە- esîde): جۆرە شیرینییەکە، کاهی.

**عصیر**- ا.ع(ئەسیر-esîr):شیلە، خۆشاوی میوە.

**عصیره**- ا.ع(ئەسیرە- esîre): شیلە، ئاوی میوە.

**عضاد**- ا.ع(ئیزاد- izad): بازوبەند، داسولکە.

**عضاده**- ا.ع(ئیزادە- izade): یاریدەدەر، قەراخی رێگە، لاشیپانەی دەرگا، گۆنیا .

**عضاه**- ا.ع(ئیزاهـ- izah): درەختی گەورەی دڕکدار.

**عضد**- ا.ع(ئەزود- ezud): بازوو، لەسەری شانەوە تا ئانیشک، یارو یاوەر.

**عضد**- ص.ع(ئەزد- ezd): یارمەتی دان، هاوکاریکردن، یارویاوەرو هاوکار.

**عضلات**- ا.ع(ئەزەلات- ezelat): ماسولکە.

**عضله**- ا.ع(ئەزەلە- ezele): ماسولکەکان.

**عضو**- ا.ع(ئوزڤ- uzv): ئەندام، ئەندامی لەش یان ئەندامی کۆمەڵ.

**عطاء**- ا.مص.ع(ئەتاء- eta’): بەخشش.

**عطابخش**- ص.فا (ئەتا بەخش- etabexş): بەخشندە، سەخی، دڵاوا، دەستکراوە.

**عطار**- ص.ع(ئەتتار- ettar): عەتر فرۆش، کەسێک کە دەرمانو شتێن بۆن خۆش بفرۆشێت.

**عطارد**- ا.ع(ئوتارید- utarîd): بچوکترین و نزیکترین ئەستێرەیە لە خۆر، لە ماوەی ٨٨ رۆژدا جارێک بە دەوری خۆرداو جارێک بە دەوری خۆیدا دەسورێتەوە.

**عطاس**- مص.ل.ع(ئوتاس- utas): پژمین، کژین.

**عطاش**- ص.ع(ئیتاش- itaş): تینووان.

**عطاش**- ا.ع(ئوتاش- utaş): نەخۆشی تینوێتی، دەم وشک بوون.

**عطاف**- ا.ع(ئیتاف- itaf): ئامرازی پەیوەندی، میهرو مەحەبەت.

**عطاف**- ا.ع(ئیتاف- itaf): شمشێر، عەبا، پەشتەماڵ.

**عطالت**- مص.ل.ع(ئەتالەت- etalet): بێکاربوون، بێکاری ، دەستبەتاڵی.

**عطایا**- ا.ع(ئەتایا- etaya): دیاریو بەخشش.

**عطب**- مص.ل.ع(ئەتەب- eteb): تورەبوون لە کەسێک، لە ناوچوون، شکان، پەککەفتن.

**عطب**- ا.ع(ئوتوب- utub): پەموو، لۆکە.

**عطر**- ا.ع(ئیتر- itr): عەتر، بۆنی خۆش.

**عطراگین**- ص.مر(ئیتر ئاگین- itr agîn): ئاوێتە بە عەتر، عەتر ئامێز.

**عطر امیز**- ص.مف(ئیتر ئامیز- itr amîz): بۆن خۆش، ئاوێتە بە عەتر.

**عطر بیز**- ص.فا (ئیتر بیز- itr bîz): عەتر پژێن.

**عطرپاش**- ص.فا (ئیتر پاش- itr paş): عەتر پژێن، گوڵاو پژێن.

**عطردان**- ا.مر(ئیتر دان- itr dan): عەتردان، گوڵاودان.

**عطرسا**- ص.فا (ئیترسا- itrsa): بۆن خۆش.

**عطسه**- ا.ع(ئەتەسە- etese): پژمە.

**عطش**- مص.ل.ع(ئەتەش- eteş): تینووبوون، تینوێتی.

**عطشان**- ص.ع(ئەتشان- etşan): تینوو.

**عطشانه**- ص.ع(ئەتشانە-etşane): ژنی تینوو.

**عطف**- مص.ل.ع(ئەتف- etf): داشکان بەلای شتێکدا، ئامرازی پەیوەندی، میهرو سۆز.

**عطف**- ا.ع(ئیــتف- itf ): لا ، قــەراخ، رەخ، کەنار.

**عطفه**- ا.ع(ئەتفە- etfe ): میرووی ئەفسون، میروویەکە ژنان پیاوانی پێ ئەفسون دەکەن.

**عطفه**- ا.ع(ئیتفە- itfe ): دارێک کە لقی ترێی پێدا هەڵواسرێ.

**عطل**- مص.ل.ع(ئەتەل- etel ): بێ خشڵمانی ژن، لات بوونی پیاو.

**عطل**- ص.ع(ئوتول- utul ): پیاوی بێ ماڵ و حاڵ، ژنی بێ خشڵ.

**عطلت**- ا.مص.ع(ئوتلەت- utlet ): بێکاری.

**عطن**- ا.ع(ئەتەن- eten ): پەچەوشتر، ئاغەڵی پەزان، لە نزیکی ئاو.

**عطور**- ا.ع(ئوتور- utûr ): عەتران، بۆنان.

**عطوف**- مص.ل.ع(ئوتوف- utûf ): ســۆزداری کردن، مایل بوون بەلای شتێکدا.

**عطوف**- ص.ع(ئەتوف- etûf ): میــهرەبان، بە بەزەییو چاکەکار.

**عطوفت**- ا.مص(ئوتوفــــــەت- utûfet ): میرەبانیو مەحەبەت.

**عطیات**- ا.ع(ئەتییــات- etîyat ): دیاری و بەخشیشان.

**عطیف**- ص.ع(ئەتیف- etîf ): نەرمــــە ژنی گوێڕایەڵ.

**عطیفه**- ا.ع(ئەتییفە- etîyfe ): کەوان.

**عطیه**- ا.ع(ئەتییە- etîye ): بەخشش، دیاری.

**عظائم**- ص.ع(ئەزائیم- ezaim ): کــــاری گرینگ، پیشهاتی زۆر ئەستەم و ناخۆش.

**عظات**- ا.ع(ئیزات- izat ): پەند و وەعز.

**عظام**- ص.ع(ئــووزام- uzzam ): مـــــەزن، گەورە.

**عظام**- ص.ع(ئیزام- izam ): مەزنان.

**عظام**- ا.ع(ئیزام- izam ): ئێسقان، سوقان.

**عظت**- ا.ع(ئیــزەت- izet ): پەند، ئامۆژگــاری، وەعزو ئامۆژگاری وەعزدایەر.

**عظم**- مص.ل.ع(ئیــزەم- izem ): گــەورەبوون، گران قەدری، گەورەیی، مەزناتی.

**عظم**- ا.ع(ئەزم- ezm ): ئێســقــان، ئێــسک، سوقان.

**عظماء**- ص.ع(ئوزەما ء- uzema’ ): مەزنان، گەورەپیاوان.

**عظمت**- ا.مص.ع(ئەزەمـــــەت- ezemet ): گەورەیی، مەزنایەتی.

**عظمی**- ص.ع(ئوزمــا- uzma ): گــەورەتر، مەزنتر، هەرە گەورە.

**عظیم**- ص.ع(ئەزیم- ezîm ): گــەورە، مــەزن، مەزناهی،

**عظیــمــه**- ص.ع(ئەزیمە- ezîme ): کــاری گرنگ، پیشهاتی زۆر ناخۆشو ئەستەم.

**عفاء**- مص.ل.ع(ئەفا ء- efa’ ): لەناوچوون، خاک، باران، نەمانو سەرگوم بوون.

**عفاء**- مص.ل.ع(ئیفا ء- ifa’ ): چاک کردنەوەی نەخۆشی.

**عــفــائف**- ص.ع(ئەفــائیف- efaif ): ژنی خواناسو داوێن پاک.

**عفات**- ا.فا.ع(ئوفات- ufat ): عەفوکەران، چاوپۆشی کار لە هەڵەو خەتاو گوناح، میـوانان، خوازیارانی رزق و رۆزی.

**عفار**- ا.ع(ئەفار- efar ): نانی وشک، نانی بێ پێخۆر، دەستەچیلە.

**عفاریت**- ا.ع(ئەفــاریت- efarît ): دڵڕەش، ئینکار، بوونەوەری دزێوو بەدو سامناک.

**عــفــاف**- مص.ل.ع(ئەفــاف- efaf ): دوورکەوتنەوە لە حەرام، داوێن پاکی، پارێزکردن لە خراپە، خواناسین.

**عفاف**- ا.ع(ئیفاف- ifaf ): دەوا، دەرمان.

**عفت**- مص.ل.ع(ئیـفـفەت- iffet ): پارێزکردن لە خـراپە، دوورکـەوتنەوە لە حـەرام، خـواناسین، تەرککردنی هەوەسبازیو شاوەترانی.

**عفج**- مص.ع(ئەفج- efc ): لێدان، لێدان بەدار یان شتی دی، گانکردن، قوونە گان.

**عفج**- ا.ع(ئەفەج- efec): ڕیخۆڵە.

**عفریت**- ا.ع(ئیفریت- ifrît): دێو، غول، ئەهریمەن، دڵڕەش.

**عفص**- ص.ع(ئەفیس- efis): تاڵ، تورت، تفت.

**عفص**- ا.ع(ئەفس- efs): داری مازوو.

**عفن**- مص.ع(ئەفەن- efen): بۆگەنبوون، خراپبوون، بۆن تێکەڕان.

**عفن**- ص.ع(ئەفین- efin): گەنیو، بۆگەن بوو.

**عفو**- مص.م.ع(ئەفڤ- efv): بەخشین، لێبووردن، چاوپۆشین لە گوناحی کەسێک.

**عفوپیشه**- ص.مر(ئەفڤ پیشە-efvpîşe): عەفوکار، بەخشەر.

**عفوصت**- ا.مص(ئوفووسەت- ufûset): تفت و تاڵ.

**عفونت**- مص.ع(ئوفوونەت- ufûnet): گەنین، چڵککردن، بۆگەنبوون.

**عفونی**- ص.ن(ئوفونی- ufûnî): چڵک کردن و بۆگەن بوون.

**عفیف**- ص.ع(ئەفیف- efîf): پاک، خواناس، پارێزکاری لە کاری خراپەو حەرام، داوێن پاکی.

**عفیفه**- ص.ع(ئەفیفە- efîfe): ژنی خواناسو داوێن پاک.

**عقاء**- ا.ع(ئیغاء- ixa’): دەوروبەری ماڵ، حەوشە.

**عقائد**- ا.ع(ئەغائید- exaid): باوەڕ، ئایین، ڕێباز، ئیدولوژیا.

**عقائم**- ص.ع(ئەغائیم- exaim): ژنانی نەزۆک.

**عقاب**- مص.ع(ئیغاب- ixab): سزادان، ئەشکەنجەدان.

**عقاب**- ا.ع(ئوغاب- uxab): هەڵۆ.

**عقاب**- ا.ع(ئیغاب- ixab): کۆسپان، ملە، ڕێگەی سەختی کوێستانی.

**عقابیل**- ا.ع(ئەغابیل- exabîl): تەنگانە، سەختیو ناخۆشی، پاشماوەی نەخۆشی یان دژمنایەتی.

**عقابین**- ا.ع(ئوغابەین- uxabeyîn): دوو هەڵۆ، فەلاقە.

**عقار**- ا.ع(ئەغار- exar): موڵک، خانووبەرە، زەویو زاری کشتوکاڵی.

**عقار**- ا.ع(ئوغار-uxar): کاڵاو ناو ماڵ، شەراب، مەی.

**عقار**- ا.ع(ئەغغار- exxar): درەخت، دەوا، دەرمانی گیایی.

**عقارب**- ا.ع(ئەغاریب- exarîb): دووپشکان، کۆڵاژدمان، تەنگانە.

**عقاقیر**- ا.ع(ئەغاغیر- exaxîr): گیاییێن دەرمانی.

**عقال**- ا.ع(ئیغال- ixal): پەتێکە ئەژنۆی وشتری پێ دەبەسترێ، عەگال کە عەرەبان لەسەری دەکەن.

**عقب**- ا.ع(ئەغیب- exîb): پاژنەی پێ، پشتەسەر، نەوە.

**عقبات**- ا.ع(ئەغەبات- exebat): کۆسپان، ڕێگەی سەختو تووشی ناو شاخان.

**عقب افتاده**- ص.مر(ئەغیب ئوفتادە- exib uftade): پاشکەوتوو، ئەوەی لە کارو کاسبیدا یان لە زانست و هونەردا لە خەڵکانی دی دواکەوتبێ.

**عقبان**- ا.ع(ئیغبان- ixban): هەڵۆیان.

**عقب گرد**- ا.مص(ئەغیب گەرد- exib gerd): پاشگەزبوونەوە، گەڕانەوە بۆ پاشەوە، بەرەو پاش چوون، لە زاراوەی سوپاییدا وەرچەرخان بۆ پاشەوە.

**عقب مانده**- ص.مر(ئەغیب ماندە- exib mande): پاشکەوتوو، دواکەوتوو، لە رووی ئەقڵیو بەدەنییەوە.

**عقب نشینی**- ا.مص(ئەغیب نیشینی- exeb nişînî): پاشەکشێ.

**عقبول**- ا.ع(ئوغبول- uxbûl): تەنگانە، سەختی، پاشماوەی نەخۆشی یان دژمنایەتی، تامێسکە.

**عقبە**- ا.ع(ئەغەبە- exebe): کۆسپ، تەگەرە، رێگەی سەختی کوێستانی، ملەی چیا، رکە.

**عقبی**- ا.ع(ئوغبا- uxba): سزا، ئاقیبەت و کۆتایی هەر کارێک، رۆژی پەسلانێ، ئاخر زەمان.

**عقد**- مص.ل.ع(ئەغد- exd): بەستن، گرێدان، بەستنی ئەهدو پەیمان، مارەکردن.

**عقد**- ا.ع(ئیغد- ixd): خەناوکە، گەردن بەند، ملوانکە، کۆ ئەستێرەیەکی پرشنگدارە، پەروین.

**عقد**- ا.ع(ئوغەد- uxed): گرێی دەرونی، عەزرەتی دڵ، (نەخۆشی دەروونی).

**عقدنامە**- ا.مر(ئەغدنامە- exd name): ژننامە، قەواڵەی هاوسەرێتی، زەوجیننامە.

**عقدە**- ا.ع(ئوغدە- uxde): گرێ، گرێی دەرونی، داخی دڵ، عەزرەتی دڵ.

**عقدە گشا**- ص.فا(ئوغدە گوشا- uxde guşa): چارەسازی گرفتان، گرێکردەوە.

**عقر**- مص.ع(ئەغر- exr): بریندار کردن، نەزۆکبوونی ژن، برینی دەستو لاقی وشتر.

**عقر**- ا.ع(ئەغر- exr): ناوەند، جەرگە، ماڵ، ناوەندی ماڵ، شوێنی هەوار خستنی قەوم، کۆشکو تەلار، بینای بەرزو بڵند، درزو بەینی دوو شت.

**عقرب**- ا.ع(ئەغرەب- exreb): کۆلاژدم، دوو پشکە، بورجی هەشتەم.

**عقرباء**- ا.ع(ئەغرەباء- exreba’): دووپشکی مێ.

**عقربک**- ا(ئەغرەبەک- exrebek): کۆلاژدمی بچووک، نەخۆشییەکە لە سەری پەنجەو نینۆکان دەداو دەبێتە مایەی کەوتنی نوخان.

**عقربە**- ا.ع(ئەغرەبە- exrebe): کۆلاژدمی مێیە، میلی سەعات.

**عقص**- مص.ع(ئەغس- exs): بادانی قژی سەر.

**عقص**- مص.ع(ئەغەس- exes): بەخیل بوون، بەدخوو بوون.

**عقعق**- ا.ع(ئەغئەغ- exex): قەشقەڵە، قەلەباجکە، قەلەبازکە.

**عقل**- مص.م.ع(ئەغل- exl): دەرککردن، حاڵی بوون، تێ گەیشتن، فامین.

**عقل**- مص.م.ع(ئەغل- exl): بەستن، بەستن و کردنەوەی لاقی وشتر.

**عقل**- ا.ع(ئوغەل- uxel): پەتێ کە لەدەست و پێ ببەسترێ.

**عقل**- ا.ع(ئوغول- uxel): پێ بەندی وشتر.

**عقلاء**- ص.ا.ع(ئوغەلاء- uxela): ئاوەزداران، ئاقڵان، دانایان.

**عقلانی**- ص.ن.ع(ئەغلانی- exlanî): ئەقلانی.

**عقلە**- ا.مص(ئەغلە- exle): زمانگرتن.

**عقلە**- ا.ع(ئوغلە- uxle): عەگال، پەت، پەتێ کە لە دەست و پێ ببەسترێ.

**عقلی**- ص.ن.ع(ئەغلی- exlî): ئەوەی بەزەبری ئەقڵ دەرک بکرێ.

**عقم**- مص.ل.ع(ئوغم- uxm): نەزۆکبوون، قسربوون.

**عقماء**- ص.ع(ئوغەماء- uxema’): نەزۆکان، ئەو پیاوانەی منالیان نەبێ.

**عقوبت**- ا.ع(ئوغوبەت- uxûbet): سزا، ئەشکەنجە.

**عقود**- ا.ع(ئوغود- uxûd): پەیمان و بەڵێن، گرێ بەست و مامەڵە، گەردن بەندان.

**عقور**- ص.ع(ئەغور- exûr): گازگیر (سەگ و ئەو شتانە)، قەپگر.

**عقوق**- مص.م.ع(ئوغوغ- uxûx): ئازاردانی داک و باب، لاساری کردن.

**عقول**- ا.ع(ئوغول- uxûl): ئاقلان، حەکیمان، فەیلەسوفان، ئاوەزداران.

**عقول**- ص.ع(ئەغول- exûl): ئاقڵ و دانا.

**عقوه**- ا.ع(ئەغڤە- exve): مەیدان، حەوشە، دەوروبەری ماڵ.

**عقیب**- ص.ع(ئەغیب- exîb): پاش، شتێک لە دوای شتێکی ترەو بێ، پاشکۆ.

**عقیده**- ا.ع(ئەغیدە- exîde): باوەڕ، ئیمان، ڕێباز، ئایدیولۆژیا.

**عقیر**- ص.ع(ئەغیر- exîr): پیاوی وەجاغ کوێر، پیاوێ کە مناڵی نەبێ، ماندوو و بریندار.

**عقیق**- ا.ع(ئەغیغ- exîx): عەقیق، نگین.

**عقیقه**- ا.ع(ئەغیغە- exîxe): قژی مناڵی ساوا، ئەو مەڕەی کە لە ڕۆژی حەوتەمی لە دایکبوونی منداڵداو لە کاتی تاشینی قژیدا، دەکرێتە قوربانی.

**عقیل**- ص.ع(ئەغیل- exîl): پیاوی سەنگینو ئاقڵ.

**عقیله**- ص.ع(ئەغیلە- exîle): ژنی سەلارو سەنگین، گەورەو سەرداری قەوم، هەر شتێکی بەنرخ.

**عقیم**- ص.ع(ئەغیم- exîm): نەزۆک،

**عکار**- ص.ع(ئەککار- ekkar): پیاوی بە هەڵمەت لە شەڕا.

**عکاز**- ا.ص(ئوککاز- ukkaz): گۆچان، دار دەستی قەشە.

**عکاس**- ا.ص(ئەککاس- ekkas): وێنەگر، ڕەسمچی.

**عکاش**- ا.ع(ئوککاش- ukkaş): جاڵجاڵۆکەی نێر.

**عکاشه**- ا.ع(ئوکاشە- ukaşe): جاڵجاڵۆکە، ماڵی جاڵجاڵۆکە.

**عکرش**- ا.ع(ئیکریش- ikriş): جۆرە گیایەکە.

**عکرمه**- ا.ع(ئیکریمە- ikrime): کۆتری مێچکە.

**عکس**- مص.ع(ئەکس- eks): پێچەوانەکردن، ئاوەژووکردن، وێنەگرتن.

**عکس برداری**- ا.مص(ئەکس بەرداری- eks berdarî): وێنەگری.

**عکعک**- ا.(ئەک ئەک- ekek): قشقەڵە، قەڵەبازکە.

**عکنه**- ا.ع(ئوکنە- ukne): چینەگۆشتی لە سەریەکی ورگ لەبەر قەڵەوی، جۆرە گیایەکە.

**عکه**- ا(ئەککە- ekke): قەلەباچکە، قشقرە، قەڵەبازکە.

**علاء**- مص.ل.ع(ئەلاء- ela'): بەرزبوونەوە، پایەبەرزبوون، بەقەدر بوون.

**علائق**- ا.ع(ئەلائیغ- elaix): دۆستایەتی، پەیوەندی، مەحەبەتی لە دڵەوە، خۆشەویستی، هەر شتێک مرۆڤ دڵی پێوەی بێ لە ماڵو ژنو منداڵ.

**علائم**- ا(ئەلائیم، - elaim): عەلامەت، نیشانە، زناکان.

**علات**- ا.ع(ئیللات- illat): نەخۆشی، بیانوو، هۆ، سۆنگە، بەهانە.

**علاج**- مص.م.ع(ئیلاج- ilac): دەرمانکردن ، چارەکردن.

**علاج پزیر**- ص.فا(ئیلاج پەزیر- ilac pezîr): چارەپەزیر، لە چارەهاتوو.

**علاف**- ا.ص.ع(ئەللاف- ellaf): عەلاف، کەسێک کە کاوجۆو گەنمو ئەو شتانە بفرۆشێت.

**علاقه**- مص.ع(ئەلاغە- elaxe): خۆشویستن، خۆشویستنی بەدڵ، پەیوەندی، دۆستایەتی، مەحەبەت.

**علاقه**- ا.ع(ئیلاغە- ilaxe): پەتێک کەشتی پێوە هەڵواسن، پەتی کەوان، پەتی شمشێر، میوەیەک کە بە دارەوە بێ.

**علاقه‌بند**- ا.ص(ئیلاغە بەند- ilaxe bend): کەسێک کە داو و قەیتان لە ئاوریشم دروست بکات، کەسێک کە دەزوو و ئاوریشم و قەیتان بفرۆشێت.

**علاقه مند**- ا.ص(ئیلاغه مەند- ilaxe mend): پەیوەندار، دۆستدار.

**علالا**- ا(ئەلالا- elala): هەرا هەرا، هاتوهاوار.

**علام**- ا.ع(ئەلام- elam): عەلامەت، نیشانە، زناک.

**علام**- ص.ع(ئەللام- ellam): زانا، دانا، زۆر زانا، یەزدان.

**علامات**- ا.ع(ئەلامات- elamat): نیشانان، زناکان.

**علامت**- ا.ع(ئەلامەت- elamet): زناک، عەلامەت، نیشانە، ئاڵا، بەیداخ،.

**علامت گزاری**- ا.مص(ئەلامەت گوزاری- elamet guzarî): دانانی نیشانە لە کەناری ڕێگا یان لەسەر سنوورو مەرزان، نیشانە دانان، هوومدانان، زناکدانان.

**علامه**- ص.ع(ئەللامە- ellame): زۆر دانا، هزرڤان، بیرەوان.

**علامی**- مص.ع(ئولامی- ulamîy): هوشیار، زیرەک، زەین روون.

**علامی**- ص.ع(ئەللامی- ellamî): پیاوی زۆر زاناو هۆشمەند.

**علان**- مص.م.ع(ئیلان- ilan): ئاشکراکردن، دەربرین، ئاشکراکردنی دژمنایەتی.

**علانی**- ص.ع(ئەلانی- elanî): کەسێک کە کاروباروی ئاشکرابێ، پیاوی ناسراوو دیار.

**علانیه**- مص.ل.ع(ئەلانییە- elanîye): ئاشکرابوون، دیار بوون.

**علاوه**- ا.ع(ئیلاڤە- ilave): سەربار.

**علت**- ا.ع(ئیللەت- illet): نەخۆشی، دەغەزاری، هۆ، بیانوو.

**علج**- ا.ص.ع(ئیلیج- ilc): کەر، کەری کێوی قەڵەوو بەهێز، پیاوی کەتەی بەهێزی نا موسڵمان، گاور.

**علف**- ا.ع(ئەلەف- elef): گیا، گیای سەوز، خۆراکی چوار پایان.

**علف بر**- ا.مر(ئەلەف بور- elef bur): ئامێرێکە لە چەشنی داس بۆ گیا درون.

**علف چر**- ا.ص(ئەلەف چەر- elef çer): گیاخۆر.

**علف خرس**- ا.مر(ئەلەفی خیرس- elefi xirs): گیایەکی دڕکاوییە

**علفخوار**- ص.فا(ئەلەف خار- elef xar): گیاخۆر، پاوەن، لەوەڕگە.

**علفزار**- ا.مر(ئەلەفزار- elef zar): شوێنێ گیای زۆربێ

**علف گربه**- ا.مر(ئەلەفی گوربە- elefi gurbe): جۆرە رووەکێکە.

**علفه**- ا.ع(ئەلەفە- elefe): ئەوەی لە زەمانی جارانا پاشایان لە خواردنو پێداویستی دیکە بۆ پێشوازی سەفیرانو هاوەڵانیانو وڵاخەکانیان ئامادەیان دەکرد.

**علق**- ا.ع(ئەلەغ- elex): خوێن، خوێنی مەییوو، زەروو، خوێنی سوورو خەست، قوڕێ بلکێتە دەستەوە.

**علق**- ا.ع(ئیلغ- ilx): هەر شتێکی چاکو گرانبەها.

**علقم**- ا.ع(ئەلغەم- elxem): گوژاڵک، کاڵەکە مارانە، تەحلەسێڤ.

**علقمه**- مص.ل.ع(ئەلغەمە- elxeme): تاڵبوون.

**علقه**- ا.ع(ئولغە- ulxe): ئەشق و خۆشەویستی و دڵ پێوە بوون، حەزلێکردن.

**علقه**- ا.ع(ئەلەغە- elexe): زەروو، نوتفە یان پز کە هێشتا لە شێوەی پەڵە خوێنێکی خەست دایە..

**علک**- ا.ع(ئیلک- ilk): بنێشت، جاجک.

**علک خاییدن**- مص.م(ئیلک خاییدەن- ilk xayîden): بنێشت جوون، هەرزە بێژی.

**علک خای**- ص.فا(ئیلک خای- ilk xay): بنێشت جوو، بێهودە وێژ.

**علل**- ا.ع(ئيلەل- ilel): هۆ، بيانوو، سۆنگە، نەخۆشی.

**علا**- ا(ئەلەلا- elela): هەلەلا، هەراوهوريا، هەراو هەنگامە، غەلّبەغەلّپ.

**علم**- ا.ع(ئەلەم- elem): ئالا، بەيداخ، ناوی شۆرەت، سەرداری قەوم، ناودار.

**علم**- مص.ل.ع(ئيلم- ilm): زانين، يەقينكردن.

**علماء** - ا.ع(ئولەما ء- ’ulema): زانايان، هزرڤانان.

**علمدار**- ا.ص(ئەلەمدار- elemdar): ئالادار، نيگابانی ئالا، ئالاهەلّگر، كەسێك كە لە ناو سوپادا ئالا بەدەست بێ.

**علم شدن**- مص.ل(ئەلەم شودەن- elem şuden): مەنشور بوون، ناوداربوون، شۆرەت پەيداكردن.

**علم غيب**- ا.مر(ئيلمی غەيب- ilmi xeyb): غەيبزانی.

**علم كردن**- مص.م(ئەلەم كەردەن- elem kerden): راستكردن، بەرزكردن، هەلّكردن.

**علن**- مص. ع(ئەلەن- elen): ئاشكرابوون.

**علن**- ص.ع(ئەلين- elin): ئاشكرا، خويا.

**علنی شدن**- مص.ع(ئەلەنی شودەن- eleni şuden): ئاشكرابوون.

**علنی كردن**- مص.ع(ئەلەنی كەردەن- eleni kerden): ئاشكرا كردن.

**علو**- ا.ع(ئيلڤ- ilv): بەرزترين و باشترين شت، بەرز، بالا، شوێنی بەرز.

**علو**- مص.م.ع(ئولوڤ- uluv): بلّندی، بەرزبوونەوە، گەورەبوون، پايەو پلە بەرزبوون.

**علوفه**- ا.ع(ئولوفە- ulûfe): ئالف، ئاليكی ولاخان لەكاو جۆو گياو...

**علوفه**- ا.ع(ئەلوفە- elûfe): ئاليكی چوارپێيان.

**علوق**- ا.ع(ئەلوغ- elûx): مەرگ، دەرد و بەلا.

**علوک**- ا.ع(ئولوک- ulûk): جۆرە رووەكێكە.

**علوم**- ا.ع(ئولوم- ulûm): زانستان.

**علوی**- ص.ن.ع(ئولڤی- ulvî): بەرزايی، سەر بە جيهانی بالا.

**علوی**- ص.ن.ع(ئەلەڤی- elevî): سەر بە عەلی، لە نەوەی عەلی، نەوەو نەتيرەی حەزرەتی عەلی كوڕی ئەبی تاليب.

**علويان**- ص.ن(ئەلەڤيان- elevîyan): سادات، خەلّكانێک كە لە نەوەو نەتيرەی حەزرەتی عەلی بن ئەبی تالّيب.

**علويون**- ص.ن(ئەلەڤييون- elevîyyûn): عەلەوييان.

**علويه**- ص.ن.ع(ئيلڤييە- ilvîyye): بەرزی، بلّندی، ئەستێرەبەرزەكان: زوحەلو مشتەری و مەريخ.

**علويين**- ص.ن.ع(ئەلەڤيين- elevîyyin): جەماعەتی عەلی، عەلەوييان.

**عله**- ا.ع(ئيللە- ille): هۆ، بيانوو، سۆنگە، نەخۆشی.

**علی**- حر.ع(ئەلا- ela): حەرفی جەڕ، ژێر.

**علی**- ا.ع(ئولا- ula): بەرزی، بلّندی، قەدر، شەرەف، گەورەيی، مەزنايەتی.

**علی**- ص.ع(ئەليی- eliy): بەرز، بلّند، پايەبەرز، قەدرگران، شەريف، ناوی يەكەم ئيمامی شيعەيە.

**عليا**- ص.ع(ئوليا- ulya): بەرزتر، بەرزو بالا.

**علياء**- ا.ص.ع(ئەليا ء- ’elya): شوێنی بەرز، لوتكەی چيا، ئاسمان.

**عليا حضرت**- ا.مر(ئوليا هەزرەت- ulya hezret): نازناوی مەليكەی ولاتە، دايكی پاشا، ژنی پاشا.

**عليق**- ا.ع(ئەليغ- elîx): ئاليک، خواردنی ولاخ.

**علیق**- ا.ع(ئوللیــــەغ- ullyex): توترک، توورک.

**علیل**- ص.ع(ئەلیل- elîl): نەخۆش، دەغەزار.

**علیله**- ص.ع (ئەلیلە- elîle): ژنی نەخـۆش، دەردەدار.

**علیم**- ص.ع(ئەلیم- elîm): هزرڤان، زانا.

**علیـون**- ص.ع(ئیلیـیـون- ilîyûn): بەرزی، بەرزترین پلەی بەهەشت.

**علیـه**- ص.ع(ئیللیــــە- illîye): پایەبەرز، ئەهلی بەرزیو بالآیی.

**علیه**- ص.ع(ئەلییە- ellîye): ژنی پایەبەرز، سەربەرز.

**علی هذا**- ق.ع(ئـەلا هـازا- elahaza): بـەم پێیە، بە گوێرەی ئەمە.

**عم** - ا.ع(ئەمم- emm): مام، ئاپ، هاپۆ.

**عـمـاء**- ا.ع(ئەمـاء- ema’): هەوری بەرز، هەوری بە باران.

**عـمائم**- ا.ع(ئەمائیم- emaim): عـەمامـان، مێزەران، شاشکان، کەشیدەیان.

**عمات**- ا.ع(ئەممات- emmat): پور، میمک، پلک.

**عـمـاد**- ا.ع(ئیـمــاد- imad): کـۆڵەکـە، پشتیوانە، بینای بەرز.

**عـــمــــــار**- ص.ع(ئومّار-ummar ): ئاوەدانکەرەوان، ئاڤاکاران.

**عـمــار**- ص.ع(ئەممار- emmar): پیــاوی بەدینو ئیمان، بە سەبرو بە هەڵوێست.

**عـمـارت**- مص.م.ع(ئیـمــارەت- imaret): ئاوەدان کردن، بیناکردن.

**عماری**- ا.ع(ئەماری- emarî): کەژاوە،

**عـمـا قـریب**- ق.ع(ئەمما غـەریب- emma xerîb): بەم زووانە، پاش مـاوەیەکی کـەم، لەم نزیکانە..

**عمال**- ا.ع(ئوممال- ummal): کرێکاران.

**عـمامـه**- ا.ع(ئیـمامـە- imame): شاشک، مێزەر، سەروپێچ، کەشیدە.

**عــمـــایت**- ا.مص(ئەمــایەت- emayet): گومرایی، خۆسەری.

**عـمـد**- مص.ل.ع(ئەمـد- emd): ئەنجـامـدانی کارێک بە ئەنقەست.

**عــمــد**- ا.ع(ئومـود- umud): کـۆڵەکـان، عەمودان، ئەستوونان.

**عـمـد**- ا.ع(ئەمـەد- emed): کـەڵەک، جـۆرە قەیاغێکە، کۆمەڵە دارێکی پێکەوە بەسـتـراو بۆ پەڕینەوە لە ئاو.

**عــمــده**- ا.ع(ئومــدە- umde): کـۆڵەکــە، پشتیوانە، شتی زۆرو سەرەکی، جوملە.

**عـمده فـروش**- ص.فا(ئومدە فـورووش- umde furûş): جوملە فرۆش.

**عمر**- ا.ع(ئومر- umr): تەمەن، ماوەی ژیان، عومر.

**عمر**- ا.ع(ئەمر- emr): عەمر، تەمەن.

**عـمـرات**- ا.ع(ئومـورات- umurat): حـەجی عومرە.

**عـــمـــــران**- ا.مص.ع(ئومـــران- umran): ئاوەدانی.

**عمرانی**- ص.ن.ع(ئیمرانی- imranî): ناوی مامی پەیامبەرو باوکی حەزرەتی عەلی بووە.

**عمرگاه**- ص.فا(ئومرگـاه- umrkah): هەر شتێ عەمر کورت بکات یان کەم بکات.

**عـمره**- ا.ع(ئومرە- umre): حەجی بچـووک، عومرە.

**عـمری**- ا.ع(ئەمـرا- emra): شتێ کـەسێک بیـدا بە یەکـێکی دی کـە تا لە ژیاندا بێ سـوودی لێ وەربگرێ.

**عم زاده**- ا.مر(ئەم زادە- em zade): ئامـۆزا، پس مام، کورەمام.

**عــمــش**- ا.ع(ئەمــەش- emeş): چاوکـــزی چاوپروش.

**عـمـشــاء**- ص.ع(ئەمـشــاء- emşa’): ژنی چاوکزی پروشاوی.

**عمق**- ا.ع(ئومغ- umx): قوڵایی.

**عمل**- مص.ع(ئەمەل- emel): کارکردن، دروستکردن.

**عمل کرد**- ا.مر(ئەمەل کەرد- emel kerd): کارو ئەنجامی کار.

**عمله**- ا.ع(ئەمەلە- emele): عەمەلە، کرێکاران، کرێکاری بیناو دیوار.

**عمو**- ا(ئەمو- emû): مام، ئاپ، هاپۆ.

**عمود**- ا.ع(ئەمود- emûd): ستوون، پایە، کۆڵەکە، گورزی ئاسن، سەروەرو گەورەی قەوم.

**عموم**- مص. ع(ئوموم- umûm): گشتاندن، گشت لە گشت، عام، هەموو بوون.

**عمه**- ا.ع(ئەممە- emme): پور، خوشکی باوک.

**عمی**- ا.مص.ع(ئەما- ema): کوێری، نابینایی.

**عمی**- ص.ع(ئەمی- emî): کوێرە، نابینا، مزمەعیل.

**عمی**- ص.ع(ئوما- uma): کوێران، نابینایان.

**عمياء**- ص.ع(ئەمیاء- emya'): ژنی کوێر.

**عميان**- ص.(ئومیان- umyan): نابینایان، کوێران.

**عميد**- ا.ص.ع(ئەمید- emîd): گەورە، سەروەر، سەردار، سەرۆک، دەم سپی قەوم.

**عميق**- ص.ع(ئەمیغ- emîx): قووڵ،

**عميم**- ص.ع(ئەمیم- emîm): زۆر، تەواو، گشت لە گشت، لاپ.

**عناء**- مص.ع(ئەناء- ena'): رەنجکێشان، زەحمەتکێشان، ماندووبوون.

**عناب**- ا.ع(ئوناب- unnab): جۆرە درەختێکە، عەنناب.

**عناب**- ا.ص.ع(ئەنناب- ennab): ترێ فرۆش.

**عناب گون**- ص.مر(ئوناب گون- unnab gûn): سوور وەکو عەنناب.

**عناد**- مص.ل.ع(ئیناد- inad): یاخی بوون، سەرکێشی کردن، شەڕکردن.

**عنادل**- ا.ع(ئەنادیل- enadil): بولبولان، شالووران، جۆرەیەکی کاکۆڵدارە.

**عناصر**- ا.ع(ئەناسیر- enasîr): رەگەزان.

**عناق**- مص.ع(ئیناغ- inax): دەست لە ملکردنی یەکدی، دەست لەملانێ.

**عناق**- ا.ع(ئەناغ- enax): دەردوبەلا، نائومێدی، کاری سەخت.

**عناق**- ا.ع(ئەناغ- enax): کارژۆڵە، کارێک کە لە ساڵ کەمتر بێ.

**عناقيد**- ا.ع(ئەناغید- enaxîd): هێشووان، بۆڵان.

**عناكب**- ا.ع(ئەناکیب- enakîb): جاڵجاڵۆکان، داپیرۆشکان.

**عنان**- ا.ع(ئینان- inan): رەشمە، هەوسار،

**عنان تافتن**- مص.ل(ئینان تافتەن- inan taften): گەڕانەوە، روو وەرگێڕان، ماندووبوون.

**عنان كشدن**- مص.م(ئینان کەشیدەن- inan keşîden): جڵەو راکێشان، وەستاندنی ئەسپ، وەستاندنەوە.

**عنايت**- مص.ل.ع(ئینایەت- inayet): بایەخدان بەشتێ یان کارێ، پاراستن.

**عنب**- ا.ع(ئینەب- ineb): ترێ، ئەنگور، هەنگور.

**عنبر**- ا.ع(ئەنبەر- enber): شابۆن، مادەیەکی بۆن خۆشی کەوەییە لە ناو سکی ماسی عەنبەردا دروست دەبێ.

**عنبراكين**- ص.مر(عەنبەر ئاگین- enber agîn): عەنبەراوی، ئاوێتە بە عەنبەر، پڕ لە عەنبەر.

**عنبرالود**- ص.مف(ئەنبەر ئالوود- enber alûd): تێکەڵ بە عەنبەر، عەنبەراوی .

**عنبربار**- ص.فا(ئەنبەربار- enber bar): بۆن

خۆش وەکو عەنبەر.

**عنبربو**- ص.مر(ئەنبەر بوو- enber bû): هەر شتێ بۆنی عەنبەری لێ بێ.

**عنبرچە**- ا.مر(ئەنبەرچە- enber çe): جۆرە خشڵێکی ژنانەیە، پاکەتێکی بچووکی زێڕ یان گەوهەر کە ژنان عەنبەریان تێدەکردو لە ملیان دەکرد.

**عنبردان**- ا.مر(ئەنبەردان- enber dan): عەنبەردان، شتێ کە عەنبەری تێ بکەن.

**عنبرسوز**- ا.مر(ئەنبەرسووز- enber sûz): قاپێ کە عەنبەری تیا بسووتێنن.

**عنبرفام**- ص.مر(عەنبەرفام- enber fam): هاوڕەنگی عەنبەر.

**عنبرین**- ص.ن(ئەنبەرین- enberîn): بۆن خۆش وەکو عەنبەر.

**عنبرینە**- ص.ن(ئەنبەرینە- enberîne): گەردنبەندێکە لە عەنبەر دروست دەکراو لەمل دەکرا.

**عنبس**- ا.ع(ئەنبەس- enbes): شێر.

**عنبیە**- ا.ع(ئینەبییە- inebîye): بەشێکی چاو.

**عنت**- مص.ل.ع(ئەنەت- enet): گێرۆدەبوون، لەناوچوون، فەوتان.

**عنتر**- ا.ع(ئەنتەر- enter): خەرەنگێز، مێشەکەرانە، جۆرە مەیمونێکە.

**عنترە**- مص.ع(ئەنتەرە- entere): دلێری نواندن لە شەڕدا.

**عنجد**- ا.ع(ئەنجەد- enced): جۆرە گیایەکە.

**عند**- ق.ع(ئیند- ind): لا، نزیک، (ئاوەڵفرمانی کات و شوێنە).

**عندلیب**- ا.ع(ئەندەلیب- endelîb): عەندەلی، بولبول، هوزار، شالوور.

**عندم**- ا.ع(ئەندەم- endem): جۆرە گیایەکە.

**عنز**- ا.ع(ئەنز- enz): بزن، بزنەکێوی، ماسوێسکە.

**عنزە**- ا.ع(ئەنزە- enze): بزن.

**عنزە**- ا.ع(ئەنەزە- eneze): کورتە ڕم، بێڵەقان، کورتە نێزە.

**عنصر**- ا.ع(ئونسور- unsûr): ڕەگەز، ئەسڵ.

**عنصرە**- (ئەنسەرە- ensere): جەژنێکی نەسرانیانە.

**عنصل**- ا.ع(ئونسول- unsul): پیازی کێوی.

**عنعنە**- مص.م.ع(ئەنئەنە- en'ene): درکاندنی هەمزە لە شێوەی عەیندا، لە گێڕانەوەدا دەگوترێ، (روی عن فلان عن فلان عن فلان...)، شەرح و بەیانی شکۆ و شانازی باوباپیران بە ریز.

**عنف**- ا.مص.ع(ئونف- unf): زەبرو زەنگ، توندو تیژی.

**عنفوان**- ا.ع(ئەنفوڤان- unfuvan): هەوەڵی لاوی، هەوەڵی هەر شتێک، هەرەت، تاف.

**عنق**- ا.ع(ئونوغ- unûx): گەردن، مل، ئەستۆ.

**عنقاء**- ا.ص.ع(ئەنغاء- enxa'): سیمرخ، ژنی گەردن درێژ، دەرد و بەڵاو تەنگانە.

**عن قریب**- ق.ع(ئەن غەریب- en xerîb): بەو زووانە، بە زوویی.

**عنقود**- ا.ع(ئونغود- unxûd): هێشوو، بۆڵ.

**عنکب**- ا.ع(ئەنکەب- enkeb): جاڵجاڵۆکەی نێرە، داپیرۆشک.

**عنکبوت**- ا.ع(ئەنکەبوت- enkebût): جۆڵاتەنە، جاڵجاڵۆکە، داپیرۆشک.

**عنکبە**- ا.ع(ئەنکەبە- enkebe) جۆڵاتەنەی مێ، داپیرۆشک.

**عنوان**- ا.ع(ئینڤان- invan): سەرناڤ، سەرنامە، عینوانی کتێب، ئەدەرس.

**عنود**- مص.ع(ئونوود- unûd): گەڕانەوە، هەڵگەڕانەوە لە هەق، گرتنەبەری ڕێی چەوت.

**عنود**- ص.ع(ئەنوود- enûd): شەڕانی، کەللە شەق، گەڕاوە لە ڕێ.

**عنید**- ص.ع(ئەنید- enîd): سەرسەخت، هەڵگەڕاوە لە هەق، شەڕانی، ناکلۆک.

**عنیزه**- ا.خ.ع(ئونەیزە- uneyze): تیرەیەکی عەرەبە لە هۆزی بەنی ئەسەد.

**عنیف**- ص.ع(ئەنیف- enîf): توندوتیژ، تووڕەو تڕۆ، زەبرکار.

**عنین**- ص.ع(ئینین- innîn): پیاوێ نەتوانێ گان بکات.

**عواء**- ا.ع(ئوڤاء- uva'): لوورەی گورگ و لوورەی سەگ.

**عواء**- ص.ع(ئەڤڤاء- evva'): سەگێ زۆر بحەپێ، زۆروەڕ.

**عوائد**- ا.فا.ع(ئەڤائید- evaid): کەسێک سەری نەخۆش بدات، چاکی و میهرەبانی.

**عوائق**- ا.ع(ئەڤائیغ- evaix): کۆسپ و تەگەران، گرفتاری رۆژگار کە مرۆڤ مژوڵ بکات.

**عواتق**- ا.ع(ئەڤاتیغ- evatix): نێوان شان و مل، قەڵاندۆش، قەڵاندۆشکان.

**عواتک**- ص.ع(ئەڤاتیک- evatik): کۆنە کەوان، ژنانی بۆنخۆش.

**عواجز**- ص.ع(ئەڤاجیز- evaciz): نەخۆشان، پیران، نابینایان، نوقستانان، پەککەوتووان.

**عواد**- ا.ع(ئوڤڤاد- uvvad): گەڕاوان، دەرامەتو دەستکەوتان، سەر دەرانی نەخۆش.

**عوادی**- ص.ا.ع(ئەڤادی- evadî): کۆسپ و تەگەرەێن رۆژگار، گرفتاری و سەربەشەی رۆژگار.

**عواذل**- ا.ع(ئەڤازیل- evazil): ژنی بە گلەییو گازاندە.

**عوار**- ا.ع(ئیڤار، ئەڤار، ئوڤار- ,ivar, evar uvar): عەیب و عار، جلی دڕاو.

**عوارض**- ا.ع(ئەڤاریز- evariz): رووداو پێشهات و نەخۆشی، باج و خەراجی نائاسایی.

**عوارف**- ا.ع(ئەڤاریف- evarif): ژنانی پشوو درێژو بە سەبرو حەوسەڵە، چاکەکاران.

**عواری**- ص.ع(ئەڤاری- evarî): رووت و قووت،

**عواریه**- ص.ع(ئەڤارییە- evarîye): کاڵایەک ئاوی دەریا لێی دابێو نرخی شکابێ.

**عواصف**- ا.ع(ئەڤاسیف- evasif): گەرداو، باهۆز، تۆزوبا، بای توند، رەشەبایان.

**عواصم**- ا.ع(ئەڤاسیم- evasim): پایتەختان، پێتەختان.

**عواطف**- ا.ع(ئەڤاتیف- evatif): سۆز.

**عواطل**- ص.ع(ئەڤاتیل- evatil): ژنی بێ خشڵ و زێڕ و زیو.

**عواف**- ا.ع(ئوڤاف- uvaf): گیانلەبەرێک کە شێر بە شەو راوی بکات، دەستکەوت.

**عوافی**- ا.ع(ئەڤافی- evafî): تەندروستی، سەلامەتی، ساغڵەمی.

**عواقب**- ا.ع(ئەڤاغیب- evaxib): ئاقیبەتان، ئاکامان.

**عواقد**- ا.ع(ئەڤاغید- evaxid): گرێدەران، پەیمانکاران.

**عواقر**- ص.ع(ئەڤاغیر- evaxir): نەزۆکان، ئەستێوران.

**عواقیل**- ا.ع(ئەڤاغیل- evaxîl): عەگوڵ، وشترالوک، پێچو دەورانو شەپۆلی دەریا، دەشتی کاکی بە کاکی بێ رێگە.

**عوالم**- ا.ع(ئەڤالیم- evalim): جیهانان، جیهانی لاهووت، ناسووت، مەلەکووت، جەبەرووت.

**عوالی**- ص(ئەڤالی- evalî): بەرز، بەرزی.

**عوام**- ا.ع(ئەڤام- evam): عەوام، عەوامی خەڵک، ئۆمیان، رەشو رووتان.

**عوام فریب**- ص.فا(ئەڤام فەریب- evam ferîb): عەوام خەڵەتێن، ئەوەی رەشو رووتان بخەڵەتێنێ.

**عوام فریبی**- ا.مص(ئەڤام فەریبی- evam ferîbî): عەوام خەڵەتێنی.

**عوامل**- ا.ع(ئەڤامیل- evamil): کرێکاران، گاجووتان.

**عوان**- مص.ع(ئیڤان- ivan): یاریدەدان.

**عوان**- ا.ص.ع(ئەڤان- evan): میانە ساڵ، یاران، خزمەتکاران.

**عوانی**- ص.ع(ئەڤانی- evanî): یەخسیر، دیل، بەندە، گیرۆدەو گرفتار.

**عوج**- ا.مص.ع(ئیڤەج- ivec): خواری، چەوتی، کەچی، گیری، شەلی.

**عوجاء**- ص.ع(ئەوجاء- ewca'): کەچ، خوار، چەوت، گیر.

**عود**- مص.ل.ع(ئەود- ewd): گەڕانەوە، زڤرین.

**عود**- ا.ع(ئود- ûd): ئامێری عود، لقی بڕاوەی درەخت، دار، چڵ.

**عودت**- م.ل.ع(ئەودەت- ewdet): گەڕانەوە، هاتنەوە، زڤرینەڤە.

**عود سوز**- ا.مر(ئود سوز- ûd sûz): مەقلێ، قاپێک کە عودی تیا بسوتێنن.

**عوذ**- مص. ع(ئەوز- ewz): پەنا بردن، (پەنا بەخوا).

**عور**- مص.ل.ع(ئەڤەر- ever): نابینابوون، کۆرەبوون، کوێر بوون، یەک چاوبوون.

**عور**- ص.ع(ئور- ûr): یەکەڵەچاو، رووتو قووت.

**عوراء**- ص.ع(ئەوراء- ewra'): ژنی یەک چاو، ناشیرینو دزێو، قسەی ناشیرین، کاری قۆرو دزێو.

**عورات**- ا.ع(ئەورات- ewrat): ژنان، ئافرەتان.

**عوران**- ص.ع(ئوران- uran): کوێران.

**عورت**- ا.ع(ئەورەت- ewret): عەورەت، شەرمی ژن و پیاو، ئافرەت.

**عورتینە**- ص.ن(ئەورەتینە- ewretîne): رەگەزی مێینە.

**عوز**- مص.ل.ع(ئەڤەز- evez): کەمبوون، پێویستی بوون، دەستکورت بوون.

**عوسج**- ا.ع(ئەوسەج- ewsec): جۆرە رووەکێکە.

**عوض**- ا.ع(ئیڤەز- ivez): لەبری، لە جیاتی، لە باتی.

**عوعو**- ا.(ئەو ئەو- ew ew): حەپە حەپی کسۆک.

**عوف**- ا.ع(ئەوف- ewf): کاروکۆشش، میوان، بەخت، شێری بێشە، گورگ، کەڵەشێر.

**عول**- ا.ع(ئەول- ewl): قووت و سەرچاوەی ژیان، گریان بەدەنگی بەرز.

**عول**- ا.مص.ع(ئیڤەل- ivel): پشت بەستن و یارمەتی خوازی.

**عون**- ا.ع(ئەون- ewn): یارمەتی، کۆمەک، هاریکاری، پشتیوان.

**عویل**- ا.ع(ئەڤیل- evîl): گریان بە دەنگی بەرز.

**عهد**- مص.م.ع(ئەهد- ehd): پاراستن، وەسێت کردن، وەعزدادان، ئامۆژگاری کردن، پەیمان بەستن، ئەهدکردن.

**عهد جدید**- ا.مر(ئەهدی جەدید- ehdi cedîd): پەیمانی نوێ، ئەو کتێبە پیرۆزانەی کە پاش مەسیح نووسراون، ئینجیل.

**عهد قدیم**- ا.مر(ئەهدی غەدیم- ehdi xedîm): پەیمانی دێرین، ئەو کتێبە پیرۆزانەی پێش مەسیح نووسراون، تەورات.

**عهده**- ا.ع(ئوهدە- uhde): زەمانەت، کەفالەت، پەیمان، سزا، عۆدە.

**عهدەدار**- ص.فا(ئوهدەدار- uhdedar): پەیماندار، کەسێک پەیمان یان بەڵێنی دابێ.

**عهن**- ا.ع(ئیهن- ihn): خوری مەڕ، خوری رەنگ کراو.

**عهود**- ص.ع(ئوهود- uhûd): پەیمان و بەڵێنان.

**عهید**- ص.ع(ئەهید- ehîd): کۆن، دێرینە، هاوپەیمان، هاوعەسر.

**عیاب**- ا.ع(ئیاب- iyab): جانتا، عەیب و شەرم.

**عیاب**- ص.ع(ئەییاب- eyyab): عەیبگۆ، زۆر عەیبگۆ.

**عیاد**- مص.م.ع(ئییاد- iyyad): چوونە سەردانی نەخۆش، گەڕانەوە بۆ لای شتێ یان کەسێک، دەست پێکردنەوە.

**عیادت**- مص.ل.ع(ئییادەت- iyyadet): چوونە دیدەنی نەخۆش، دیدەنی و هەواڵپرسینی نەخۆش.

**عیاذ**- مص.ل.ع(ئیاز- iyaz): پەنابردن، پەناگرتن، پەناگە، پەنا (پەنام بە خوا).

**عیار**- مص.ع(ئیار- iyar): عەیار، مەحەک.

**عیار**- ص.ع(ئەییار- eyyar): چەرچی، گەڕۆڵ، بەرەڵلا، کەسێک بێهودەو بێ کار هەر بێ و بچێ، ئیبۆز، چوست و چالاک، گورجو گۆڵ، دلێر، جوامێر، تەڕدەست، خێرا.

**عیارپیشه**- ص.مر(ئەییارپیشە-eyyarpîşe): جوامێر و سەخی و چالاک.

**عیارگیر**- ص.فا(ئییارگیر- iyar gîr): ئەوەی عەیاری زێڕو زیو بگرێ.

**عیار وش**- ص.مر(ئەییار ڤەش- eyyar veş): وەکو عەیار، عەیار ئاسا، ئیبۆز ئاسا.

**عیاش**- ص.ع(ئەییاش- eyyaş): دەوڵەمەندو خۆشگوزەران، ئەهلی عەیش و نۆش.

**عیافت**- مص.ع(ئییافەت- iyyafet): فاڵ گرتنەوە بەپێی فڕینی باڵندە.

**عیال**- ا.ع(ئیال- iyal): ژن، ماڵو مناڵ، کەسوکاری یەک خێزان،(ژنو مێردوو مناڵەکانیان).

**عیال**- ص.ع(ئەییال- eyyal): ڕۆیشتنی بەلارو لەنجە، بەفیزو دەعیە.

**عیالدار**- ص.فا(ئیال دار- iyal dar): خودان ژن و مناڵ، عەیالدار.

**عیالمند**- ص.مر(ئیالمەند- iyalmend): خێزاندار.

**عیالوار**- ص.مر(ئیالڤار- iyal var): خودان ژن و مناڵی زۆر، خێزاندار.

**عیان**- مص.م.ع(ئییان- iyan): دیتن بە چاو، دیار، ئەوەی بدینرێ، بەرچاو.

**عیانی**- ص.ع(ئیانی- iyanî): شایەت، شایەتێک ئەوەی بە چاو دەیبینێ بیلێ.

**عیب**- ا.ع(ئەیب- eyb): خراپی، شەرم، عەیب، بەدناوی، ریسوایی، خەوش.

**عیب**- ا.ع(ئییەب- iyeb): جانتا، جانتای جلوبەرگ، عەیب، خەوش.

**عیب بین**- ص.فا(ئەیب بین- eyb bîn): کەسێک عەیبی خەڵکی ببینێ و لە قاوی بدات.

**عیب پوش**- ص.فا(ئەیب پوش- eyb pûş): عەیب پۆش، کەسێک کە عەیبەی خەڵکی بپۆشێت و باسی نەکات.

**عیب جو**- ص.فا(ئەیب جو- eyb cû): کەسێک لە دووی عەیبی خەڵکی بێو لە قاوی بدات.

**عیب دار**- ص.مر(ئەیب دار- eyb dar): عەیبدار، خەوشدار.

**عیبناک**- ص.مر(ئەیبناک- eyb nak): خاوەن عەیب، عەیبدار، بەدناو، ریسوا، گوناحکار.

**عیبه**- ا.ع(ئەیبە- eybe): جانتا، ساک، زەمیلەی چەرمی، عەیبە.

**عیث**- مص.ع(ئەیس- eys): گەندەڵ کردن، لەناودان، زیان پێ گەیاندن.

**عیثمی**- ا.ع(ئەیسەمی- eysemiy): کەرە کێوی.

**عیثوم**- ا.ع(ئەیسوم- eysûm): کەمتیار، فیل.

**عید**- ا.ع(ئید- id): جەژن.

**عیدان**- ا.ع(ئیدان- idan): دار، چیلکە، چوکڵان.

**عیدگاه**- ا.مر(ئیدگاه- idgah): ئەو شوێنەی نوێژی جەژنی لێ بکەن.

**عیسوی**- ص.ن(ئیسەڤی- isevî): پەیڕەوانی حەرزەتی عیسا.

**عیسی دم**- ص(ئیسادەم- isa dem): عیسا نەفەس، ئەوەی دەم و نفوسی وەکو عیسابێ و مردوو زندوو بکاتەوەو نەخۆش چابکاتەوە.

**عیش**- مص.ع(ئەیش- eyş): ژیان، ژین، گوزەران.

**عیشە**- ا.ع(ئیشە- işe): بارودۆخی ژیان، گوزەران.

**عین**- ا.ع(ئەین- eyn): چاو، چاڤ، دیە، سەرچاوە، هەڵبژاردەی هەر شتێک، گەورەو سەروەری قەوم.

**عیناء**- ص.ع(ئەیناء- eyna’): ژنی چاوگەورە، ژنێ کە رەشێنەی چاوی درشت و جوان بێ.

**عینک**- ا(ئەینەک- eynek): چاویلکە، عەینەک، بەرچاڤک.

**عیوب**- ا.ع(ئویوب- uyûb): خەوش و عەیبان.

**عیوق**- ا.ع(ئەیوغ- eyûx): ئەستێرەیەکی سوری گەشە لەلای راستی کاکێشانەوە.

**عیون**- ا.ع(ئویون- uyûn): چاوان، کانی و سەرچاوان، کانیاوان.

# غ

**غ- حر** (غ- X):
پیتی بیستو دووەمی ئەلفبای فارسییە کە بە (غەین) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (١٠٠٠) هەزار، ئەم پیتە هاوبەشە لە نێوان زمانی فارسیو عەرەبیدا.

**غائب**- ص.فا (غائیب- xaib): پێوار، غایب، ناپەیدا، دوور لە چاو، ئامادەنەبوو.

**غائبانە**- ق(غائیبانە- xaibane): پێوارانە، غاییانە، لە حاڵی غایب بووندا، کارێک کە لە غیابی کەسێکدا بکرێ.

**غائر**- ا.فا.ع(غائیر- xair): رۆچوو، ئاوی رۆچوو بە زەویدا، زەوی نزم، چاڵ.

**غائص**- ا.فا.ع(غائیس- xais): چووە ناو ئاو، چووە ژێر ئاو، ئەوەی بچێتە ژێر دەریاوە.

**غائط**- ا.ع(غائیت- xait): زەوی نزم و چاڵ، شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن، گوو.

**غائلە**- ا.ع(غائیلە- xaile): ئاژاوە، غایلە، شەڕو گەندەڵی.

**غائی**- ص.ن.ع(غائی- xaî): غایەت، کۆتایی، مەبەست، ئامانج.

**غاب**- ا.ع(غاب- xab): جەنگەڵ، بێشە، دارستان، دارستانان، لێڕەوار.

**غاب**- ا.ع(غابب- xabb): گۆشتی شەومەنە، گۆشتی گەنیو، خواردنی پاشماوە، هەرزەوێژی، هەڵەوەڕی.

**غابات**- ا.ع(غابات- xabat): غابات، لێڕەواران، جەنگەڵستان، بێشەلان، دارستانان.

**غابر**- ا.فا (غابیر- xabir): رابردوو، رابوردی، کۆن، دێرین.

**غابط**- ا.فا (غابیت- xabit): خۆزیاخواز، خۆزی خواستن بە کەسێک، حەسوودی بردن بە کەسێک بێ ئەوەی ئارەزووی لە دەستچوونی نیعمەتی بکرێ.

**غابن**- ا.فا.ع(غابین- xabin): کەسێک لە کاردا سستی بکات، حیلەکار لە کڕینو فرۆشتندا.

**غابە**- ا.ع(غابە- xabe): بێشە، جەنگەڵ، دارستان، لێڕەوار، قامیشەلان، نێزەی درێژ، کۆمەڵە خەڵک.

**غات شدن**- مص.ل(غات شودەن- xat şuden): لە یاری نەردا راکردنو قاپی گرتنە.

**غادر**- ا.فا.ع(غادیر- xadir): غەددار، بێ وەفا، خایەن، پەیمانشکێن.

**غادرە**- ا.فا.ع(غادیرە- xadire): ژنی پەیمان شکێن و غەددارو بێ وەفاو غایەن.

**غادی**- ا.فا.ع(غادی- xadî): شێر، ڕێبواری بەرەبەیان.

**غادیات**- ا.فا.ع(غادییات- xadiyat): هەور یان بارانی بەرەبەیان، بەرەبەیان.

**غادیە**- ا.فا.ع(غادییە- xadîye): بارانی بەرەبەیان، بەرەبەیان.

**غاذی**- ا.فا.ع(غازی- xazî): نانبدە، ناندەر.

**غاذیە**- ا.فا.ع(غازییە- xazîye): ژنی نانبدەر.

**قوەء غاذیە**- ا.مر( غوەی غازیە- xuwey xazîye): وزەیەک کە خۆراک شیتەڵ بکاتەوەو بیکا بە بەشێک لە بەدەن.

**غار**- ا.ع(غار- xar): غار، ئەشکەوت، شکەفت.

**غار**- ا.ع(غار- xar): غار، جۆرە درەختێکە.

**غارات**- ا.ع(غارات- xarat): هێرش و پەلامار، هێرش بردن، تالان کردن.

**غارب**- ا.فا.ع(غاریب- xarib): ئاوا بوو.

**غارب**- ا.ع(غاریب- xarib): شان، سەرووی هەر شتێک.

**غارت**- ا.ع(غارەت- xaret): تالان و برۆ، هێرش و پەلامار.

**غارت زدە**- ص.مف(غارەت زەدە- xaret zede): تالانکراو.

**غارت زدگی**- ا.مص(غارەت زەدەگی- xaret zedegî): تالانکاری.

**غارتگر**- ص.فا(غارەتگەر- xaret ger): تالانچی، دز، ڕێگر، جەردە.

**غارتیدن**- مص.م(غارەتیدەن- xaretîden): تالانکردن.

**غارج**- ا(غاریج- xaric): شەرابێ کە بەیانیان بخورێتەوە.

**غارس**- ا.فا.ع(غاریس- xeris): ئەوەی درەخت بروێنێ.

**غارغار**- ا(غار غار- xar xar): دەنگی قەڵەڕەش، قارەقار، قڕاندن.

**غارغارک**- ا.مر(غارغارەک- xar xarek): هەر شتێک دەنگە دەنگی زۆرو ناخۆش بێ وەک: بڵندگۆ، رادیۆو فرۆکە.

**غارق**- ص.ع(غاریغ- xari x): خنکاو، لە ئاوا نقوم بوو.

**غارگیلاسی**- ا.مر(غارگیلاسی- xargîlasî): درەختێکی کێوییە لە جۆری گێلاس و ئاڵوباڵو.

**غارنشین**- ص.فا(غارنیشین- xar nişîn): ئەشکەوت نشین.

**غارو غور**- ا.مر(غاروغوور- xarû xûr): هەراو هوریا، ئاژاوەو فەرتەنە، قۆرە قۆری زگ.

**غاریغون**- ا(غاریغوون- xarî xûn): جۆرە قارچکێکە لە کلۆری پیرەداران دەروێ و بۆ دەرمان بەکار دێ.

**غاز**- ا(غاز- xaz): قاز.

**غاز**- ا(غاز- xaz): جۆرە دراوێکی زۆر بچووکە تا هەوەڵی سەردەمی قاجارییەکان رەواجی هەبوو.

**غاز**- ا(غاز- xaz): پینە، دڕاو، درز، قاز، پارچە پارچە.

**غاز**- ا.ع(غاز- xaz): گاز.

**غازایاقی**- ا.مر(غازایاغی- xaza ya xî): جۆرە رووەکێکە.

**غازل**- ا.فا.ع(غازیل- xazil): تەشی ڕێس، ڕێسەر.

**غازلە**- ا.فا.ع(غازیلە- xazile): ژنی تەشی ڕێس، بڕێس.

**غازە**- ا(غازە- xaze): سووراوی ژنان.

**غازە رخ**- ص.مر(غازە روخ- xaze rûx): روو سوور، کەسێک سوراوی لە رووی خۆی دابێ، ئەوەی گۆناکانی سوور بێ وەکو سووراو.

**غازی**- ا.فا.ع(غازی- xazî): کەسێک لە رای ئایندا دژی گاوران بجەنگێ، پاشای جەنگاوەر.

**غازی**- ا.ع(غازی- xazî): جۆرە سکەیەکی کۆن بووە بەرانبەر بە بیست قرۆش بووە.

**غازی**- ص(غازی- xazî): رستی باز، پەتی باز.

**غاسق**- ا.فا.ع(غاسیغ- xasi x): شەوەزەنگ، شەوی زۆر تاریک، ماری رەش، مانگ.

**غاسول**- ا.ع(غاسوول- xasûl): سابوون، یان هەر شتێ کە جل یان لەشی پێ بشۆن.

**غاسول رومی**- ا.مر(غاسوولی روومی- xasûli rûmî): دەوەنێکی دڕکدارە.

**غاش**- ص(غاش- xaş ): ئاشق، شەیدا، کەودەن.

**غاش**- ص.فا.ع(غاشش- xaşş): غەشکار، کەسێک کە خەڵکی فریو بدات.

**غاشم**- ص.ع(غاشیم- xaşim): زاڵم، ستەمکار، داگیرکەر.

**غاشیه**- ا.ع(غاشییە- xaşîye): پۆشاک، پەردە، پەردەی دڵ، رووپۆشی زین، رۆژی پەسڵان.

**غاشیه بردوش**- ص.مر(غاشییە بەردوش- xaşîye berdûş): گوێڕایەڵ و ملکەچ.

**غاشیەدار**- ص.فا(غاشییەدار- xaşîye dar): ئەوەی زین پۆشی ئەسپی ئاغای خۆی هەڵگرێ.

**غاشیەکش**- ص.فا(غاشییەکەش- xaşîye keş): هەڵگری زینپۆش.

**غاص**- ص.ع(غاس- xass): پڕ، چڕ، قەرەباڵغ، پیاوی موفلیس، کەسێک پارو لە گەروی گیربێ‌و نەفەسی بۆ نەدرێ.

**غاصب**- ا.فا.ع(غاسیب- xasib): زەفتکەر، داگیرکەر، کەسێک بە تۆبزی ماڵی کەسێکی دی غەسپ بکات، زەوتکار.

**غاصبانه**- ق(غاسیبانە- xasibane): داگیرکەرانە، بە شێوازی داگیرکەر، زەفتکەرانە.

**غاطی**- ا.فا.ع(غاتی- xatî): تاریک، داپۆشەر، پڕ، چڕو تێکچڕژاو، پۆشەر.

**غاطیه**- ا.فا.ع(غاتییە- xatîye): مێو کە بە عارەدیدا پان بوویێتەوەو دای پۆشی بێ.

**غاغ**- ا.ع(غاغ- xax): پونگە.

**غاغالس**- ا(غاغالیس- xaxalis): جۆرە رووەکێکە.

**غاغه**- ا.ع(غاغە- xa xe): پونگە، قەرەباڵغی زۆر، ئاپوورەی خەڵکی، هەیشەت.

**غافت**- ا(غافەت- xafet): جۆرە رووەکێکی دڕکدارە.

**غافر**- ا.فا.ع(غافیر- xafir): یەکێکە لە ناوەکانی یەزدان، گوناهبەخش، کەسێک لە گوناحی کەسێک ببورێ.

**غافل**- ص.فا.ع(غافیل- xafil): بێ خەبەر، غافڵ، نا ئاگا، فەرامۆشکار، بێ ئەقڵ، نەزان.

**غافلانه**- ق.مر(غافیلانە- xafilane): نەزانانە، گێلانە، بێ خەبەرانە.

**غافل گونه**- ص.مر(غافیل گوونە- xafil gûne): نەزان ئاسا، غافڵ ئاسا.

**غافل گیر**- ص.فا(غافیل گیر- xafil gîr): غافڵگیر، کەسێک لە نکاودا پەلاماری کەسێک بدات.

**غافل وار**- ص.مر(غافیل وار- xafil var): غافل ئاسا.

**غاق**- ا.ع(ئاغ- xa x): قەلەرەش.

**غاک**- ا(غاک- xak): کاوێژ، دەنگی کاوێژی حەیوانات، ناڵەناڵ، قغەقغی قەلان.

**غال**- ا(غال- xal): غار، موغارە، ئاغەڵی پەزان لە کێودا، لانەی چەقەڵ‌و ریوی‌و...

**غال**- ا.ع(غالل- xall): دەشتی نزمی چرە درەخت‌و دار.

**غالا لوط**- ا(غالالووت- xala lût): جۆرە رووەکێکە.

**غالب**- ا.فا.ع(غالیب- xalib): زاڵ، سەرکەوتوو، زیادە، فراوان، زۆر.

**غالب امدن**- مص.ل(غالیب ئامەدەن- xalib ameden): سەرکەوتن، زاڵبوون.

**غالب شدن**- مص.ل(غالیب شودەن- xalib şuden): سەرکەوتن، زاڵبوون، زاڵ گومان.

**غالب ظن**- ا.مر(غالیب زەن- xalib zen): گومانی زاڵ، زاڵ گومان.

**غالبا**- ق.ع(غالیبەن- xaliben): زۆربەی کات، بە زۆری.

**غالط**- ا.فا.ع(غالیت- xalit): غەڵەتکەر، غەڵەتکار، خەتاکار.

**غالظ**- ص.ع(غالیز- xaliz): خەلیس، خەست، درشت، ئەستوور.

**غالوک**- ا(غالووک- xalûk): گلاهەک.

**غالی**- ص.ع(غالی- xalî): گران، گرانبەها، زێدەڕۆیی.

**غالیدن**- مص.ل(غالیدەن- xalîden): غلاندن، خلبوونەوە، گینگڵ دان.

**غالیس**- ا(غالیس- xalîs): جۆرێکە لە شادانە، جۆرە رووەکێکە.

**غالیون**- ا(غالیوون- xaliyûn): جۆرە رووەکێکە بۆ دەرمان دەشێ.

**غالیه**- ص.ع(غالیە- xaliye): گران، گرانبەها، هەژی، بۆنێکی خۆشە لە مسکو عەنبەر پێکهاتووەو رەنگی رەشەو لە قژ دەدرێ.

**غالیه اسا**- ص.مر(غالیە ئاسا- xaliye asa): بە رەنگو بۆی غالییە.

**غالیه‌اندایه**- ا.مر(غالیە ئەندایە- xaliye endaye): ئامێرێکە کە غالییەی پێ لە شت بدرێ.

**غالیه‌اندوده**- ص.مف(غالییە ئەندودە-xaliye endûde): شتێ کە غالییەی لێ سورابێ، رەش.

**غالیه‌بار**- ص.فا(غالییەبار- xaliye bar): ئەوەی وەکو غالییە بۆنی خۆش بدا، بۆنخۆش وەکو غالییە.

**غالیه‌بو**- ص.مر(غالییە بوو- xaliye bû): ئەوەی بۆنی غالییە بدا.

**غالیه‌جعد**- ص.مر(غالییە جەئد- xaliye ce'd): زوڵفی رەش و بۆنخۆش.

**غالیه خط**- ص.مر(غالییە خەت- xaliye xet): سمێڵ رەش.

**غالیه‌دان**- ا.مر(غالییەدان- xaliye dan): غالییەدان، زارو چاڵی چەناگەی یار.

**غالیه‌رنگ**- ص.مر(غالییە رەنگ- xaliye reng): رەش وەکو غالییە.

**غالیه‌زلف**- ص.مر(غالییە زولف- xaliye zulf): زولف رەش و بۆنخۆش.

**غالیه سا**- ص.فا(غالییە سا- xaliye sa): غالییە ساز، عەتر فرۆش.

**غالیه ساز**- ص.فا(غالییە ساز- xaliye saz): غالییە ساز، عەتار، عەترساز.

**غالیه سودن**- مص.م(غالییە سوودەن- xaliye sûden): دروستکردنی عەتر، عەترسازی.

**غالیه فام**- ص.مر(غالییە فام- xaliye fam): رەش وەکو غالییە.

**غالیه گون**- ص.مر(غالییەگوون- xaliye gûn): رەش وەکو غالییە، بەرەنگی غالییە.

**غالیه مو**- ص.مر(غالییە موو- xaliye mû): قژ رەشی بۆنخۆش.

**غامر**- ص.ع(غامیر- xamir): وێران، زەوی بە یارو بێ کەڵک، زەوییەک بۆ کشتوکاڵ نەبێت.

**غامض**- ص.ع(غامیز- xamiz): زەوی نزم، کاری ئاڵۆزو ئەستەم، گۆنگ، قسەی نا مەفهوم.

**غامضه**- ص.ع(غامیزە- xamize): ئاڵۆزو ئەستەمو نا روون (بۆمێ).

**غامی**- ص(غامی- xamî): لاواز، بێ توانا، لەڕ.

**غان**- ا(غان- xan): جۆرە درەختێکە.

**غانغرایا**-ا(غان غەرایا-xan xeraya): گانگرین.

**غانم**- ا.فا.ع(غانیم- xanim): خودان دەستکەوت، غەنیمەتگیر.

**غـــانی**- ص.ع(غـــانی- xanî): زەنگین، دەوڵەمەند.

**غانیە**- ص.ع(غـانیـیـە- xaniye): ژنی زۆر جوان کە بە هۆی جوانییەوە پێویستی بە خشڵ و خۆ رازانەوە نەبێ، ژنی داوێن پاکی بە مێرد.

**غـاو**- ا(غـاڤ- xav): مـانگا، چێڵ، گـا، گاجووت.

**غاو**- ا(غاڤ- xav): ئاغەڵی پەزان.

**غـاوش**- ا(غـاڤـوش- xavûş): خـەیاری تۆو، هێشووە ترێی گەییوو کە بۆ تۆو هەڵگیرێ.

**غاوشنگ**- ا.مر(غـاڤـشـەنگ- xav şeng): دارگاران.

**غاوی**- ا.فا(غاڤی- xavî): گومڕاو ناهومێد.

**غـاویە**- ا.فـا.ع(غـاڤـیـیـە- xaviye): ژنی گومڕاو ناهومێد.

**غـایات**- ا.ع(غـایات- xayat): ئامـانجـان، کۆتاییان، ئارمانجان.

**غـایب**- ص.فـا.ص(غـایب- xayib): نەدیار، ئەوی لەبەر چاو نەبێ، پەنهان.

**غـــایت**- ا.ع(غـــایەت- xayet): کـــۆتایی، مـەبەست، ئەوپەڕی خـواستو ئارەزوو، ئەنجـام، ئامانج.

**غـایر**- ا.فـا.ع(غـایر- xayir): رۆچوو، ئاوێ بچێتە ژێر زەوی.

**غـــایط**- ا.ع(غــــایت- xayit): زەوی نزم و بەرین، گوو.

**غب**- مص.ع(غـیـبب- xibb): هاتنی رۆژ نە رۆژ، نۆبەتێ.

**غب**- ا.ع(غیبب- xibb): ئاکام، ئاقیبەت، کۆتایی هەر شتێک،

**غب**- ا.ع(غـوبب- xubb): زەوی نزم، شـوێنی وەستانی ئاو.

**غـــــبــــــار**- ا.ع(غـــــوبـار- xubar): گەردو تۆز،

**غبارخاطر**-ا.مر(غوبار خاتیر- xubar xatir): دڵ گەرد گرتوو.

**غـــبـــار الود**- ص.مف(غـوبار ئالود- xubar alûd): تۆزگرتوو، خۆڵاوی.

**غباز**-ا(غەباز-xabaz): دار دەستی شوانان، گاڕان.

**غـبـاوت**- مص.ل.ع(غـەباڤـەت- xabavat): گەوج بوون، گێل بوون.

**غـبـب**- ا.ع(غـەبەب- xebeb): غـەبغـەبە، گۆشتی ژێر چەناگە.

**غبج**- مص.ع(غەبج- xebc): خواردنەوەی ئاو بە قوم قوم، ئاو خواردنەوە.

**غـبـجـە**- ا.ع(غـوبجـە- xubce): بەشی یەک خواردنەوە لە ئاو یان شەراب.

**غـبـراء**- ص.ع(غـەبراء- xebra'): تۆزاوی، بۆر، خاکی رەنگ، زەوی.

**غـــبس**- ا.ع(غــــەبەس- xebes): بولێـــڵی ئێوارێ، خۆڵەمێشی.

**غـــبش**- ا.ع(غـــــەبەش- xebeş): تاریکی ئاخیری شەو، بولێڵی بەرەبەیان.

**غبطە**- مص.ع(غیبتە- xibte): جۆرە بەغیلی بردنێکی حەلاڵە، خۆزی خواستن بە دەوڵەمـەندی کـەسـێک بێ ئەوەی ئارەزووی لە دەست چوونی دەوڵەمەندییەکەی بکرێ.

**غـــبــغـب**- ا.ع(غـــەب غـــەب- xeb xeb): غەبغەبە، گۆشتی ژێر چەناگە.

**غبن**- مص.م.ع(غـەبن- xebn): زیان لێـدانی کـەسـێک لە کـڕینو فـرۆشـتندا، خـەڵەتاندن، زەرەرکردن لە کڕینو فرۆشتندا.

**غـبـوق**- ا.ع(غـەبوغ- xebûx): شـەرابێ کـە شەوان بیخۆنەوە، شەرابی شەو.

**غـــبی**- ص.ع(غــەبی- xebî): گــێل، نەزان، گەوج، کەودەن.

**غبیراء**- ا.ع(غەبەیراء-'xubeyra): درەختی سنجو.

**غـبین**- ص.ع(غـەبین- xebîn): ئەقڵ سـست، فریو خواردوو لە سەوادادا.

**غـبـینە**- ا.ع(غـەبینە- xebîne): فـێڵ، زەرەرو زیانو هەڵخەتاوی لە کڕیندا.

**غپک**- ا(غەپەک- xepek): زەل، زەلی حەسیر دروستکردن، لەبان.

**غت**- ص(غــەت- xet): ئەبلەه، کــەودەن، گەلحۆ، گێل، گەوج.

**غتفر**- ص(غوتفەر- xutfer): گەوج، نەزان، گێل، بەدکردەوە.

**غث**- ص.ع(غـەس- xes): لەرو لاواز، قسـەی نا دروستو بێ بنجو بناوان.

**غثیان**- مص.ل.ع(غـەسـەیان- xeseyan): هێلنج، دڵ تێک هەڵهاتن، رشانەوە.

**غـچک**- ا(غــیـــچـــەک- xicek): جــۆرە کەمانچەیەکە.

**غـد**- ص.(عـا)(غـودد- xudd): خـۆویست، خۆبین.

**غد**- ا.ع(غەد- xed): سبەی.

**غداء**- ا.ع(غەداء- xada'): خواردنی نیوەرۆ، فراڤین..

**غدائد**- ا.ع(غەدائید- xadaid): غودە، لوو.

**غـدائر**- ا.ع(غـەدائیـر- xedair): گـێـسـوو، کەزی، پرچ.

**غـــدات**- ا.ع(غـــەدات- xedat): کــازیوە، بەرەبەیان.

**غداد**- ا.ع(غیداد- xedad): تاعوونی وشتر.

**غـدار**- ص.ع(غـەددار- xeddar): غـەددار، زاڵم، سـتـەمکار، بێ وەفـا، غـایەن، فـریوکـار، حیلەباز.

**غـداره**- ص.ع(غـەددارە- xeddare): ژنی بێ وەفاو دەستبڕ.

**غداره**- ا(غەددارە- xeddare): حەربەی پان.

**غـدارەبند**- ص.فـا(غـەددارە بەند- xeddare bend): غەدارە بەقەد.

**غدد**- ا.ع(غودەد- xuded): غودە، لوو.

**غدد**- ا.ع(غەدەد- xeded): تاعوونی وشتر.

**غـدر**- مص.ع(غـەدر- xedr): خـیـانەت کـردن، بێ وەفـــاییکردن، پەیمان شکاندن، تەفـــرەدان، لە خشتەبردن.

**غـــدراء**- ا.ع(غـــەدراء- xedra'): تاریکی، شەوی تاریک.

**غـــداره**- ا(غـــەددارە- xeddare): ســونگی، حەربە، قەمە.

**غــــدره**- ص.ع(غـــەدیرە- xedire): تاریک، شەوی تاریک، شەوە زەنگ.

**غدریفی**- ص.ن(غیدریفی- xidrîfî): سەخی، جـوامـێـر، سـەروەر، گـەورە، بێـچـوەباز، جـۆرە سکەیەکی کۆنە لە (بوخارا)دا باوی بووە.

**غدغد**- ا(غودغـود- xud xud): قرتە قرتی مریشک، دەنگی مریشک.

**غدغن**- ا(غـەدەغـەن- xede xen): قـەدەغـە، یاساغ.

**غـدفره**- ص(غـودفـەرە- xud fere): گـەوج، گێل، کەودەن.

**غــدنگ**- ص(غـــەدەنگ- xedeng): نەزان، گێل، گەوج، ناشیرینو نا قۆڵا.

**غدو**- ا.ع(غودوڤ- xuduv): سبەینێ.

**غـدو**- مص.ل.ع(غـەدڤ- xedv): رۆیـیـشـتـنی سپێدەزوو، سپێدە.

**غدو**- ا.ع(غودوڤ- xuduv): بەرەبەیان.

**غـــدوات**- ا.ع(غــــەدەڤــــات- xedevat): بەرەبەیانیان.

**غدود**- ا.ع(غودود- xudûd): غودە، لوو.

**غـدور**-ص. ع (غـەدور- xedûr): بێ وەفـا، تەڵەکەباز، بەفێڵو دەهۆ.

**غـدوه**- ا.ع(غـودوڤـە- xudûve): کــازیوە، بەیان، بەرەبەیان، سپێدە.

**غده**- ا.ع(غوددە- xudde): غودە، لوو.

**غـدیر**- ا.ع(غـەدیر- xedîr): گـۆلاو، شـوێنی کۆبوونەوەی باراناو لە دەشـتـدا، ئاوی وەسـتـاوی پاش سێلاو.

**غـدیرخم**- ا.مـر(غـــەدیری خـــومم- xedîri xumm): شـوێنێکە لە نێوان مـەکـەو مـەدینە،

جەژنی غەدیری خوم: دەکاتە رۆژی ١٨ی زیلحەجە کە لەو رۆژەدا پەیامبەر لە غەدیری خومدا عەلی بە جێگری خۆی دانا.

**غدیره**- ا.ع(غەدیره- xedîre): پرچ، گێسوو.

**غذاء**- ا.ع(غیزاء- xiza’): خۆراک، خواردن، خوارن.

**غر**- ص(غور- xur): قۆڕ، گون ئاوسیاگ.

**غر**- ا(غیر- xir): رەقسین و سەما بەنازەوە، سەما بە غەمزەو نازەوە.

**غر**- ص.(غەر- xer): قەحبە، ژنی بەدکار، سۆزانی، نامەرد، گەواد.

**غر**- ا(غور- xur): بۆڵەبۆڵ لە بن لێوانەوە، پرتەو بۆڵە.

**غر**- ص.ع(غیر- xir): گەنجی بێ تەجرەبەو ناکارامە، کەسێک فریو بخوات.

**غر**- ا.ع(غەر- xer): درز، شەق یان چاڵ، جۆگەلە، چرچو لۆچی جل.

**غراء**- ص.ع(غەڕاء- xera’): باش، جوان، سپی و رووناک، درەخشان، سوارو رەوان و جوان.

**غرائب**- ص.ا.ع(غەرائیب- xeraib): شتی غەریبو عەجیب و دەگمەن.

**غرائر**- ا.ص.ع(غەرائیر- xerair): ژنی گەنجی بێ تەجرەبە، بێ ساوکەکان.

**غرائز**- ا.ع(غەرائیز- xara’iz): مەگێزەکان، سروشت، قەریحە، ئارەزووی سێکسی.

**غراب**- ا.ع(غوراب- xurab): قەلەڕەش، دەمی چەقۆ، دەمی تەور، بەفر، تەرزە، جۆرە کەشتییەکی چارۆکەدارە.

**غرابت**- مص.ل.ع(غەرابەت- xerabet): دوور بوون، دوور بوون لە نیشتمان، ئاڵۆزبوونی وشە، ناباوبوونی شتێک.

**غرابه**- ا(غەرابە- xerabe): شووشەی گەورەی گەرو تەنگی زگ گەورە.

**غرابی**- ا.ع(غورابی- xurabî): جۆرە خورمایەکە، جۆرە شەکرلەمەیەکە.

**غرابیل**- ا.ع(غەرابیل- xerabîl): سەرەن، بێژنگ، بێژنگان.

**غراچه**- ص(غەراچە- xeraçe): نامەرد، دەیوس، گەواد، کەسێک ژن بە گان بدا، نەزان، گەوج، گەلحۆ، قورمساغ.

**غرار**- مص.ل.ع(غەرار- xerar): فریوخواردن، خەڵەتان، بێ تەجرەبەیی.

**غرار**- ا.ع(غیرار- xirar): دەمی تیژی شمشێر، کەسادی بازار، بێ بازاڕی، خەوی کەم.

**غرار**- ا(غیرار- xirar): تەلیس، جەواڵی گەورە، خەرار.

**غرار**- ص.ع(غەڕار- xerar): فێڵباز، خاپینۆک، دەستبڕ.

**غرارات**- مص.ل.ع(غەرارات- xerarat): هەڵخەڵەتان، ئاشقێنی پاش تەجرەبە، نا کارامەیی.

**غراره**- ا.ع(غیرارە- xirare): خەرار، جەواڵ، رەشکە، غەرغەرەکردن، ئاو لەزار وەردان.

**غراش**- ا(غەراش- xeraş): روشان، برین، خەمو خەفەت، پشمو غەزەب.

**غراشیدن**- مص.م(غەراشیدەن- xeraşîden): تورەبوون، شەرکردن، تۆران، خەم خواردن.

**غراشیده**- ا.مف(غەراشیدە- xeraşîde): تۆراو، تورە.

**غراضیف**- ا.ع(غەرازیف- xerazîf): کرکراگە.

**غراف**- ا.ع(غیراف- xiraf): پێوانەی گەورە.

**غراف**- ص.ع(غەڕاف- xeraf): روباری پڕ ئاو، ئەسپی هەنگاو هەڕاو.

**غرام**- ا.ع(غەرام- xeram): ئەشق و شەیدایی، عەزاب، دەردو ئازار.

**غرامات**- ا.ع(غەرامات- xeramat): سزا.

**غرامت**- ا.ع(غەرامەت- xeramet): غەرامەت، جەزا، سزا، زەرەرو زیانو شەڕەشەق، پەشیمانی.

**غرامت خواستن**- مص.ل(غەرامەت خاستەن- xeramet xasten): غەرامەت ویستن، خوازیاری غەرامەت کردن.

**غرامت دادن**- مص.م(غەرامەت دادەن- xeramet daden): سزادان.

**غرامت ستاندن**- مص.ل(غەرامەت سەتاندەن- xeramet setanden): سزاسەندن.

**غرامت کشیدن**- مص.ل(غەرامەت کەشیدەن- xeramet keşîden): قبوڵ کردنی سزا، لە ئەستۆگرتنی سزا.

**غران**- ص.فا(غوڕان- xurran): نەڕاندن، بۆڵاندن، بەنەڕە، بەبۆڵە.

**غرانیق**- ا.ع(غەرانیغ- xeranî x): جۆرە تەیرێکە.

**غراورنگ**- ا.مر(غەرئەورەنگ- xer ewreng): تەختی گەورە.

**غرب**- مص.ع(غەرب- xerb): ئاوابوون، خۆر ئاوا بوون، خۆرنشین.

**غرب**- ا.ع(غەرەب- xereb): زرەدار، داری زڕ، دارێ کە بەری نەبێ وەک: چنارو سپێدارو...

**غرب**- ا.ع(غەرەب- xereb): زێڕ، تەلا، زیو، پەرداخ، مەی.

**غرباء**- ص.ع(غورەباء- xureba’): غەریبان.

**غربال**- ا.ع(غیربال- xirbal): بێژنگ.

**غربال بند**- ص.فا(غیربال بەند- xirbal bend): بێژنگساز، وەستای بێژنگ دروست کردن.

**غربال کردن**- مص.م(غیربال کەردەن- xirbal kerden): لە بێژنگ دان، بێژان.

**غربال گر**- ص.فا(غیربال گەر- xirbal ger): سەرەنساز، کەسێک کە کاری لە بێژنگدانی دانەوێڵەو شتی دی بێ.

**غربان**- ا.ع(غیربان- xirban): قەلەڕەشان.

**غربت**- مص.ع(غوربەت- xurbet): نامۆیی، غەریب بوون، دوور بوون لە شاری خۆت، دوورە وڵات بوون، کەوتنە غەریبی.

**غربت گرا**- ص.فا(غوربەت گەرا- xurbet gera): کەسێک حەزی لە غەریبایەتی بێ، غوربەت دۆست.

**غربچه**- ا.مر(غەربەچە- xerbeçe): کوڕی قەحپە، قەحپەداک، حیزداک.

**غربله**- مص.ع(غەربەلە- xerbele): لە سەرەندان، لە بێژنگدان، بێژان، بێژەکردن.

**غربیب**- ص.ع(غەربیب- xerbîb): تریێ رەشکە، پیرەمێردێک سەرو ردێنی رەش بکاتەوە، زۆر رەش.

**غربیل**- ا(غەربیل- xerbîl): بێژنگ، سەرەند.

**غربیله**- ا(غەربیلە- xerbîle): سوڕدان، قون بادان، سەما.

**غرت**- ا.عا(غورت- xurt): خواردنەوە یان ئاو کە بە جارێ بخورێتەوە.

**غرتش**- ص.عا(غورتەش- xurteş): مل ئەستورو زۆردار.

**غرتی**- ص.عا(غیرتی- xirtî): خوێڕی، لووسکە، حیز.

**غرچ غرچ**- ا(غیرچ غیرچ- xirç xirç): چۆقە چۆقی دان، قرچە قرچی دان، جیرە جیری دگان.

**غرچه**- ص(غەرچە- xerçe): نامەرد، گەواد، گێل، کەودەن، قورمساغ.

**غرد**- ا(غەرد- xerd): کەپر، ماڵێک لە حەسیرو قامیش دروست بکرێ.

**غردل**- ص.مر(غەردیل- xerdil): ترسنۆک، نامەرد.

**غرده**- ا(غەردە- xerde): جۆرە تۆپێک بووە لە کۆندا بۆ هاویشتنی بەرد لە جەنگدا بەکار هاتووە، مەنجەنیق.

**غرر**- ا.مص.ع(غەرەر- xerer): کەوتنە تالوکە، کەوتنە مەترسییەوە.

**غرر**- مص.ع(غەرەر- xerer): روو سپی بوون.

**فاسد شدن**- مص.ل(فاسید شودەن- fasid şuden): بۆگەن بوون، خرابوون، گەندەڵ بوون، فەوتان، عەیبداربوون.

**فاسق**- ا.فا.ع(فاسیغ- fasix): گوناحکار، زیناکار، لە هەق لادەر.

**فاسقە**- ا.فا.ع(فاسیغە- fasixe): ژنی بەدکار، سۆزانی.

**فاسی**- ا(فاسی- fasî): جۆرە رووەکێکە.

**فاسیس**- ا.فر(فاسیس- fasîs): دیمەن، روخسار، رواڵەت، رووکار.

**فاش**- ص(فاش- faş): ئاشکرا، بڵاوبوونەوە، کشش.

**فاش شدن**- مص.ل(فاش شودەن- faş şuden): بڵاوبوونەوە، ئاشکرابوون، کششبوون، خویابوون.

**فاش گردیدن**- مص.ل(فاش گەردیدەن- faş gerdîden): ئاشکرابوون، بڵاوبوونەوە، کششبوون، خویابوون.

**فاش کردن**- مص.م(فاش کەردەن- faş kerden): بڵاوکردنەوە، ئاشکراکردن، لەقاودان.

**فاشرا**- ا(فاشرا- faşra): جۆرە رووەکێکە لە کۆنا بۆ دەرمان بەکار دەهێنرا.

**فاشر ستین**- ا(فاشیریستین- faşiristîn): جۆرە گیایەکە لە لاولاو دەچێت.

**فاشورانیدن**- مص.م(فاشورانیدەن- faşuranîden): هاڕوژاندن.

**فاشیست**- ص.فر(فاشیست- faşîst): پەیڕەوی رێبازو رێچکەی فاشیزم.

**فاشیسم**- ا.فر(فاشیسم- faşîsm): ناوی رێبازو قوتابخانەیەکی سیاسیو جۆری حکومەتێک بوو کە لە نێوان جەنگی یەکەم و جەنگی دووەمی جیهاندا لە ئیتالیا حوکمڕان بوو، و بە شێوازێکی ملهوڕانەو دیکتاتۆری فەرمانڕەوایی دەکرد، ئێستا پتر بە مانای دیکتاتۆری بەکاردێ.

**فاصل**- ا.فا.ع(فاسیل- falil): سنووری نێوان دوو زەوی، سنووری نیوان دوو شت.

**فاصلە**- ا.فا.ع(فاسیلە- fasile): ماوەی نێوان دوو شت، ئەوەی لە نێوان دوو شتدا روویدات.

**فاصلە دادن**- مص.م(فاسیلە دادەن- fasile daden): فاسیلەدان، سنووردانان لە نێوان دوو شتدا.

**فاصلەگرفتن**- مص.ل(فاسیلە گیریفتەن- falile giriften): سنووردانان لە نێوان خۆو کەسێک یان شتێکی دیدا.

**فاضح**- ا.فا.ع(فازیه- fazih): سپێدە، ئاشکراکار، ریسواکار.

**فاضل**- ا.فا.ع(فازیل- fazil): زانا، خاوەن فەزڵ، کەسێک لە زانستو کەماڵدا لە خەڵکانی دی زیاتر بێ.

**فاضل اب**- ا.مر(فازیل ئاب- fazil ab): ئاوی زیادە کە لە سەری رووبار یان جۆگە بڕوات، چڵکاوی گەرماو و موبەق.

**فاضلات**- ا.فا.ع(فازیلات- fazilat): ژنێن خودان فەزڵ.

**فاضلانە**- ق.ص(فازیلانە- fazilane): زانایانە، هێژایانە.

**فاضلتر**- ص.ت(فازیلتەر- fazilter): باڵاتر، زیاتر، زاناتر.

**فاضلە**- ا.فا.ع(فازیلە- fazile): باڵا، زانا (بۆ مێ).

**فاطر**- ا.فا.ع(فاتیر- fatir): خولقێنەر، داهێنەر، خوای گەورە.

**فاطمە**- ا.ص.ع(فاتیمە- fatime): ژنێ کە منداڵی خۆی لە شیر بڕیبێتەوە، ناوی کچی حەزرەتی پێغەمبەرە.

**فاطمی**- ص.ن.ع(فاتیمی- fatimî): ئەولادی حەزرەتی فاتیمە.

**فاطمەارە**- ا.مر(فاتیمە ئەرە- fatime ere): ناوی قارەمانێکی هەزارو یەک شەوەیە، ژنی زۆر بێ شەرم.

**فاطن**- ص.ع(فاتین- fatin): زیرەک، زانا.

**فاعل**- ا.فا.ع(فائیل- fail): کارا، بکەر، کارکەر، کرێکاری قوڕکاری.

**فاعله**- ا.فا(فائیله- faile): بکەر (بۆ مێ).

**فاغره**- ا.ع(فاغیره- faxire): جۆرە رووەکێکە.

**فاغیه**- ا.ع(فاغییە- faxiye): شکۆفەی خەنە، لقی خەنە، هەر شکۆفەیەک کە بۆنی خۆشبێ.

**فافا**- ص(فافا- fafa): هەر شتێک باش و جوان بێ، جوان .

**فاق**- ا(فاغ- fax): درزی نێوان ردێنی درێژ، کوێرکردنی چاو، دەربوونی دوومەڵ.

**فاق**- ا.ع(فاغ- fax): کاسەی پڕ تەعام، دەشتو تەختانی، بیابان.

**فاقد**- ا.فا.ع(فاغید- faxid): ئەوەی کەسێک یان شتێکی لە دەست دابێ، ژنێ کە فەرزەن یان مێردی خۆی لە دەست دابێ.

**فاقع**- ص.ع(فاغئ- faxi’): زەردی خالیسە، زۆر زەرد.

**فاقعه**- ا.ع(فاغیئە- faxi’e): تەنگانە، بەڵا، ناخۆشی.

**فاقه**- ا.ع(فاغە- faxe): نەداری، دەستکورتی، هەژاری.

**فاکتور**- ا.فر(فاکتوور- faktûr): لیستی حیساب.

**فاکولته**- ا.فر(فاکوولتە- fakûlte): زانستگە، کۆلیج.

**فاکه**- ا.فا.ع(فاکیه- fakih): خواوەندی میوە، میوەفرۆش، پیاوی حەنەکچی، قسەخۆش، دەم بە پێکەنین.

**فاکهانی**- ص.ع(فاکیهانی- fakihanî): میوەفرۆش.

**فاکهه**- ا.ع(فاکیهە- fakihe): میوە، فیقی.

**فال**- ا(فال- fal): فاڵ، گەشبینی.

**فال دیدن**- مص.ل(فال دیدەن- fal dîden): فاڵگرتنەوە.

**فال زدن**- مص.ل(فال زەدەن- fal zeden): فاڵگرتنەوە.

**فال گرفتن**- مص.ل(فال گیریفتەن- fal giriften): فاڵگرتنەوە.

**فال**- ا٠(فال- fal): چەند (چەند گوێزێک) یک فال گردو.

**فالبین**- ص.فا(فال بین- fal bîn): فاڵچی، فاڵگرەوە.

**فالج**- ا.ع(فالیج- falic): ئیفلیج، ئیفلیجی.

**فالج زده**- ا.فا(فالیج زەدە- falic zede): موفتەلا بە ئیفلیجی.

**فالق**- ا.فا(فالیغ- fali¨x): خەرەند، داهێنەر، خودا.

**فالکباز**- ا.ص(فالەکباز- falek baz): فاڵچی، فاڵگرەوە، فاڵچییەک لە کووچەو کەناران دابنیشێت و فاڵ بۆ خەڵکی بگرێتەوە.

**فالگو**- ص.فا(فالگوو- falgû): فاڵچی، بەختگرەوە.

**فالگوش**- ا.مر(فالگووش- fal gûş): ئەمە لای کورد بەردی جومعەی پێ دەگوترێ، ئەمە زیاتر کاری ژنە، ژنێک لە رۆژی ٥ شەممە لەسەر جومعە لە ڕێگایەک یان چوار ڕیانێک دەوەستێ و بە نیازی خۆی گوێ لە قسەی یەکەم کەس دەگرێ کە بەوێندەردا رەت دەبێ و بەمەش دەزانێ نیازەکەی دێتە دێ یان نا.

**فالگیر**- ص.فا(فالگیر- falgîr): فاڵچی، فاڵگرەوە.

**فالنامه**- ا.مر(فالنامە- falname): فاڵنامە، کتێبێکە کە دەستوورو ڕێ و شوێنی فاڵگرتنەوەی تێدا نووسراوە.

**فالوده**- ا(فالوودە- falûde): بەستەنی، دۆندرمە.

**فالوذج**- ا(فالووزەج- falûzec): فالودە، بەستەنی.

**فالیز**- ا(فالیز- falîz): باغ، بێستان.

**فالینوس**- ا(فالینووس- falînûs): شاتەڕە.

**فالیە**- ا.ع(فالییە- faliye): جۆرە مێروویەکە لە کونی ماراندا دەژی.

**فام**- پس(فام- fam): پاشگرێکە پتر مانای رەنگ دەدات وەک: سیاە فام، رەشباو.

**فام**- ا٠(فام- fam): قەرز.

**فامگزار**- ص.فا(فامگوزار- fam guzar): ئەوەی قەرز بداتەوە، قەرزدەر، سەر راست.

**فامیل**- ا.فر(فامیل- famîl): ماڵبات، خێزان، خانەوادە، کوانگو وەچاخ، تیرەو تایفە.

**فامیلدار**- ص.فا(فامیلدار- famîldar): کەسێک لە بنەماڵەیەکی ناوداربێ، وەچاخزادە.

**فانتزی**- ا.فر(فانتیزی- fantizî): خەیاڵ، وەهم، وێنا، زەوق، فەنکاری، فانتازی.

**فانتوم**- ا.فر(فانتوم- fantûm): تارمایی، خەیاڵ، وێنەی خەیاڵی، شەبەنگ، تاپۆ.

**فانوس**- ا(فانووس- fanûs): فانووس.

**فانوس خیال**- ا.مر(فانووسی خەیال- fanûsi xeyal): فانۆسی خەیاڵی، فانۆسێکە لە سەر شووشەکەی یان پەردەکەی نەخشو نیگار هەبووەو بە جوڵاندنی فانۆسەکە سێبەری ئەو نەخشو نیگارانە لەسەر دیواران دەرکەوتووە.

**فانوس دریایی**- ا.مر(فانووسی دەریایی- fanûsî deryayî): فانۆسی دەریایی، فەنار، جۆرە فانۆسێکە لە بەندەرەکاندا لەسەر بورجان دایدەنێن بۆ رێنوێنی کەشتییان.

**فانوسقە**- ا(فانوسغە- fanûs¨xe): فیشەکدان، رەخت، فیشەکلغ.

**فانە**- ا(فانە- fane): پواز، ئەو قاڵبەدارەی لە ناو قۆندەرەی دەنێن، پشتیوانەی دەرگا.

**فانی**- ا.فا.ع(فانی- fanî): ناپایەدار، شتێ نەمێنێو لەناو بچێ.

**فانیز**- ا(فانیز- fanîz): شەکر، قەندی سپی.

**فاوا**- ص(فاڤا- fava): شەرمەزار، ریسوا.

**فاوانیا**- (فاڤانیا- favaniya): جۆرە رووەکێکە.

**فایتون**- ا.فر(فایتوون- faytûn): عەرەبانە، گالیسکەی چوار چەرخە.

**فئات**- ا.ع(فیئات- fiat): گرووپان، تاقمان، دەستەیان.

**فؤاد**- ا.ع(فوئاد- fûad): دڵ، ئەقڵ.

**فیودال**- ا.ص.فر(فیوودال- fiyûdal): فیوودالٚ، دەرەبەگ، ئاغا.

**فئودالیتە**- ا.فر(فیوودالیتە- fiyûdalîte): جۆرە سیستەمێکی فیودالی بوو لە سەدەکانی ناڤیندا لە ئەورووپادا باو بوو، و فیودالەکانو خاوەن موڵکە گەورەکان بۆیان هەبوو فەرمانڕەوایی رەعیەتو مەسکێنانی خۆ بکەن.

**فیودالیسم**- ا.فر(فیوودالیسم- fiyûdalîsm): فیودالیزم، سیستەمی حوکمڕانی فیوداڵان کە هەقی حوکمڕانیان بەسەر هەموو کاروباری کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووری جوتیارانو مسکێنانەوە هەبووە.

**فئە**- ا.ع(فیئە- fi'e): جماعەت، تاقم، گرووپ، دەستە.

**فبها**- ع(فەبیها- febiha): زۆر چاکە، باشتر.

**فت**- مص.ع(فەتت- fett): شکان، وردوخاش کردن، بلاو، پەرتو بلاو، درز لەبەردا.

**فتاء**- ا.مص (فەتاء- feta'): لاوی، جەوانی، کەرەمو سەخاوەت، دڵو چاو تێری.

**فتائل**- ا.ع(فەتائیل- fatail): فتیلە، پلێتە، شاف.

**فتات**- ا.ع(فوتات- futat): بەرماوە، ورتکەنان، وردە و خوردەی هەر شتێک.

**فتات**- ا.ص.ع(فەتات- fetat): کچۆلان، کیژانی گەنج.

**فتاح**- ص.ع(فەتتاه- fettah): فەتحکار، پشتیوان، حاکم، داوەر.

**فتادن**- مص.ل(فەتادەن- fetaden): کەوتن.

**فتاریدن**- مص.م(فەتاریدەن- fetarîden): هەڵکەندن، رشتن، پەرتو بڵاوکردن، دڕاندن، شەقکردن، جیاکردنەوە، پەریشان کردن، پەراگەندەکردن.

**فتالنده**- ا.فا(فەتالەندە- fetalende): پەریشانکەر، ریژەر، پەرتو بڵاوکەر، پەراگەندەکار.

**فتالیده**- ا.مف(فەتالیدە- fetalîde): رژاو، پەرتو بڵاو، دڕاو، پەریشان.

**فتان**- ص.ع(فەتتان- fettan): جوان و دڵرفێن، شەیتان، دز، ریگر، فیتنەگێڕ.

**فتانه**- ص.ع(فەتتانە- fettane): دڵرفێن، زۆر جوان، فیتنەگێڕ.

**فتاوی**- ا.ع(فەتاڤی- fetavî): فتوا، رای حاکمی شەرع.

**فتح**- مص.م.ع(فەتە- feth): گرتن، کردنەوە، سەرکەوتن، گرتنی شاریک.

**فتح کردن**- مص.م(فەتح کەردەن- feth kerden): کردنەوە، گرتن، سەرکەوتن بەسەر دژمندا.

**فتحات**- ا.ع(فەتەهات- fetehat): کون، کەلێن، کەلەبەر.

**فتحنامه**- ا.مر(فەتە نامە- feth name): نووسراویک هەواڵی سەرکەوتنی تێدا بێ.

**فتحه**- ا.ع(فەتهە- fethe): سەر:(نیشانەیەکە دەخرێتە سەر پیت).

**فتدن**- مص.ل(فوتەدەن- futeden): کەوتن.

**فتر**- ا.مص(فەتەر- feter): سستی، لاوازی، ساردی.

**فتراک**- ا(فیتراک- fitrak): تەرک بەندی زین.

**فترت**- ا.ع(فەترەت- fetret): سستی، خاوی، ماوەی نێوان دوو نۆرەتێ، زەمانی نێوان دوو پێغەمبەر.

**فتردن**- مص.م(فەتەردەن- feterden): درین، پەرت کردن، شەق کردن.

**فتق**- مص.ل.ع(فەتغ- fetx): کرانەوە، دڕان، قۆڕبوون.

**فتق بدن**- ا.مر(فەتغ بەند- fetx bend): فتق بەند، جۆرە پشتێنیکی تایبەتییە خەڵکی قۆڕ دەیبەستن.

**فتک**- مص.م.ع(فەتک- fetk): گرتنی لە ناخافڵی کەسێک، کوشتنی لەنکاوی کەسێک.

**فتل**- مص.م.ع(فەتل- fetl): بادان.

**فتلیدن**- مص.م(فەتەلیدەن- fetelîden): رشتن، شەق کردن، دڕاندن، پەریشان کردن.

**فتن**- ا.ع(فیتەن- fiten): ئاژاوە، تاقیکردنەوە، گومڕاکردن، کفر، نا حەزی نێوان خەڵکی، مەینەت، عەزاب، ئاژاوە، شتێتی.

**فتنه**- مص.م.ع(فیتنە- fitne): گومڕاکردن، تاقیکردنەوە، ئاژاوەنانەوە.

**فتنه انگیختن**- مص.م(فیتنە ئەنگیختەن- fitne engixten): ئاژاوە نانەوە، ئاژاوە بەرپاکردن.

**فتنه انگیز**- ص.فا(فیتنە ئەنگیز- fitne engîz) ئاژاوەگێڕ.

**فتنه‌جو**- ص.فا(فیتنەجو- fitne cû): ئاژاوەگێڕ، فیتنەچی.

**فتنه‌خیز**- ص.مر(فیتنەخیز- fitne xîz): شوێنی بە ئاژاوەو پڕ شەڕو ئاشوب.

**فتنه‌زا**- ص.مر(فیتنەزا- fitne za): ئاژاوەزێ.

**فتنه‌شدن**- مص.ل(فیتنە شودەن- fitne şuden): شەیدابوون، ئاشق بووون.

**فتنه‌گر**- ص.فا(فیتنەگەر- fitne ger): ئاژاوەگێڕ.

**فتنه‌نشان**- ص.فا(فیتنەنیشان- fitne nişan): ئاژاوە کوژێنەوە، کەسێک ئاژاوە بکوژێنێتەوە.

**فتوت**- ا.مص.ع(فوتووڤەت- futûvet): تافی لاوی، جوامێری، سەخاوەتو دڵاوایی.

**فتوح**- ا.ع(فوتووه- futûh): سەرکەوتنان، فەتحان.

**فتوحات**- ا.ع(فوتووهات- fultûhat): ئەو شارانەی بەشەڕ دەگیرێن.

**فتور**- مص.ل.ع(فوتوور- futûr): ئارام بوون، خاوبوونەوە، پەرێشان بوون، هێوربوونەوە.

**فتوره**- اا(فەتووره- fetûre): پارچە، قوماش.

**فتون**- مص.ع(فوتوون- futûn): ئاژاوەنانەوە، کەوتنەئاژاوەوە، خستنە ئاژاوەوە، شەیدا بوون، ئاشق بوون.

**فتوی**- ا.ع(فەتڤا- fietva): فتوا، رای زانای ئایینیو حاکمی شەرع دەربارەی مەسەلەیەک.

**فتوی دادن**- مص.ل(فەتڤادادەن- fetva daden): فتوادان، رادانی زانای ئایینی لە مەسەلەی شەرعیدا.

**فتوی پرسیدن**- مص.م(فەتڤا پورسیدەن- fetva pursîden): پرسینی رای موفتی لە مەسەلەیەکی شەرعیدا.

**فتوی خواستن**- مص.م(فەتڤا خاستەن- fetva xasten): پرسینی رای موفتی لە مەسەلەیەکی شەرعیدا.

**فته**- اا(فەتە- fete): بلیت، بەرگە، گوزەرنامە.

**فته طلب**- ا.مر(فەتە تەلەب- fete teleb): چەک خواز، سفتە.

**فتی**- ا.ص.ع(فەتا- feta): لاو، جوامێرو دلاوا.

**فتی**- ص.ع(فەتی- fetî): نۆ لاوی، نەورەسیدە لە هەر شتێک، نۆبەرە، تازە.

**فتیات**- ص.ع(فەتەیات- feteyat): کیژۆلان.

**فتیان**- ص.ع(فیتیان- fityan): لاوان، نۆلاوان، سەخی تەبیعەتان.

**فتیت**- ص.ع(فەتیت- fetît): نانە رەق، وردەنان، وردەو کوتراوی هەر شتێک.

**فتیدن**- مص.ل(فوتیدەن- futîden): کەوتن.

**فتیش**- ا.فر(فیتیش- fitîş): هەر شتێ بپەرستریٚ، وەکو بت.

**فتیشیست**- ص.فر(فیتیشیست- fitîşîst): پەرستاری فیتیش، ئەوەی فیتیش بپەرستێ.

**فتیشیسم**- ا.فر(فیتیشیزم- fitişîsm): رێبازی فیتیشیسی.

**فتیل**- ص.ع(فەتیل- fietîl): بادراو.

**فتیله**- ا.ع(فەتیله- fetîle): پلیتە، فتیلە.

**فتیه**- ص.ع(فیتیه- fitye): لاوی، گەنجێتی، لاوان، گەنجان.

**فج**- ص(فوج، فیج- fuc, fic): لێو شۆڕ.

**فج**- ا.ع(فەجج- fecc): رێگەی بەرینی نێوان دوو شاخ.

**فجاء**- مص.م.ع(فوجائه- fuca'e): پەلامارداني لەنکاو، کوشتنی لە نا خافڵ، گرتنی لە ناکاوی کەسێک.

**فجاء**- مص.م.ع(فەجائه- feca'e): گرتنی لە نکاوی کەسێک، غافڵگیرکردن، غافڵ کوشتن.

**فجاج**- ا.ع(فوجاج- fucac): رێگەی بەرینو ئاشکرای نێوان دوو شاخ.

**فجار**- مص.ع(فیجار- ficar): زیناکردن، رابواردنی حەرام، گانی حەرام.

**فجار**- ا.ع(فیجار- ficar): رێگەی بەرینو ئاشکرای نێوان دوو چیا.

**فجار**- ا.ع(فوججار- fuccar): زیناکاران.

**فجایع**- ا.ع(فەجایئ- fecayi'): کارەساتان، مسیبەتو بەلایان.

**فجر**- ا.ع(فەجر- fecr): کازیوە، بەرەبەیان، سپێدە، ئەلەند.

**فجره**- ص.ع(فەجەره- fecere): بەدکاران، زیناکاران.

**فجفاج**- ص.ع(فەجفاج- fec fac): فشەکەر، فیشالباز، پیاوی چەنەبازو بێهودەوێژ، خۆهەلکێش.

**فجل**- مص.ل.ع(فەجەل- fecel): نەرم و داهێزراو، خەست بوون، ئەستوور بوون، قایم بوون.

**فجل**- ا.ع(فوجول- fucul): تور، ترپ.

**فجور**- ص.ع(فەجوور- fecûr): خراپەکردن، گوناح کردن، لە هەق لادان، درۆکردن، زیناکردن.

**فجور**- ص. ع (فەجور- fecûr): ژن یان پیاوی داوین پیس.

**فجه**- ا.ع(فوجچە- fucce): درز، شەق، زەندۆڵ.

**فجيع**- ص.ع(فەجيئ- fecî'e): بەسوێ، بە ئازار، خەمناک.

**فجيعه**- ا.ع(فەجيئە- fecî'e): کارەسات، مسیبەتی بە ئازار، بەڵای ناخۆش.

**فچفچه**- ا(فوچفوچە- fuç fuçe): چپە چپ، مقۆ مقۆ، دەمگۆ.

**فحاش**- ص.ع(فەحهاش- fehhaş): بەدخووی زمان پیس، جنێو فرۆش.

**فحاشي**- ا.مص(فەحهاشی- fehhaşî): جنێو فرۆشی، دەمپیسی.

**فحاص**- ص.ع(فەحهاس- fehhas): کنوکۆکار، کەسێک زۆر بکۆڵێتەوە.

**فحال**- ص.ع(فیحال- fihal): فەحلان، نێران، کەلان، کەڵیاگەل.

**فحام**- ا.ع(فیحام- fiham): رەژووان، زوغالان، خەڵوزان.

**فحام**- ا.ص.ع(فەحهام- fehham): رەژوو فرۆش، رەژووکەر.

**فحاوى**- ا.ع(فەهاڤی- fehavî): ناوەڕۆکان.

**فحث**- مص.ع(فەحس- fehs): کۆڵینەوە.

**فحش**- مص.ل.ع(فوحش- fuhş): خراپە کردنی لە ئەندازە بەدەر، جنێودان.

**فحشاء**- ا.ع(فەحشا ء- fehşa'): گوناهی گەورە، کاری زۆر دزێوو قێزەون، زینا، گانی حەرام.

**فحص**- مص.م.ع(فەحس- fehs): تاقیب کردن، کۆڵینەوە، تەفتیش کردن.

**فحل**- ص.ع(فەحل- fehl): فەحل، نێر، پیاوی دیارو زاناو بەنامێ، دیار.

**فحم**- ص.ع(فەحم- fehm): رەژوو، زوخاڵ، خەڵووز.

**فحمه**- ا.ع(فەحمە- fehme): یەک کلۆ خەڵوز.

**فحواء**- ا.ع(فەحڤاء- fehva'): ناوەڕۆک، کاکڵ، پوختە.

**فحول**- ص.ع(فوحول- fuhûl): فەحلان، کەڵە ناوداران، نێران.

**فحولت**- ا.مص.ع(فوحوولەت- fuhûlet): نێرایەتی.

**فحوم**- ا.ع(فوحووم- fuhûm): خەڵوزان.

**فحوى**- ا.ع(فەحڤا- fehva): ناوەڕۆک، کاکڵ، مەبەستو کرۆکی قسە.

**فخ**- ل.غ(فەخخ- fexx): داو، فاق، تەڵە.

**فخ**- مص.ل.ع(فەخخ- fexx): پرخەپرخ کردن لە خەودا، پرخاندن لە خەودا.

**فخاخ**- ا.ع(فیخاخ- fixax): داو، تەڵە.

**فخار**- مص.ل.ع(فیخار- fixar): هاو فەخری، فەخرکردن بەسەر یەکدا.

**فخار**- مص.ل.ع(فەخار- fexar): نازین، فەخر کردن.

**فخار**- ا.ع(فەخخار- fexxar): خۆهەڵکێش، فەخر فرۆش.

**فخار**- ا.ع(فەخخار- fexxar): سواڵەت، کورەچی.

**فخاري**- ا.ع(فەخخاری- fexxarî): سواڵەتفرۆش، گۆزەگەر.

**فخامت**- مص.ل.ع(فەخامەت- fexamet): گەورەبوون، بەرزبوونی پلەو پایە.

**فخذ**- ا.ع(فەخز- fexz): ران.

**فخذ**- ا.ع(فەخز- fexz): کەسوکارو خزم و ماڵباتی پیاو.

**فخر**- مص.ل.ع(فەخر- fexr): نازین، فەخرکرن.

**فخرکردن**- مص.ل(فەخر کەردەن- fexr kerden): خۆ هەڵکێشان، بەخۆنازین.

**فخفره**- ا(فەخفەرە- fexfere): سوس، کەپەک، کۆن، نانی کۆنو ماوە.

**فخم**- ا(فەخەم- fexem): پارچە پەڕۆیەکی گەورەیە لەبن درەختی بەردارردا رایدەخەن تا میوەکەی بوەرێننە سەری.

**فخم**- ص.ع(فەخم- fexm): بڵندپایە، پایە بەرز، قەدرگران، قسەی خۆشو رەوان.

**فخمیدن**- مص.م(فەخمیدەن- fexmîden): جیاکردنەوەی لۆکە لە ناوکەکەی، شیکردنەوەی لۆکە.

**فخمنده**- ا.فا(فەخمەندە- fexmende): ئەوەی لۆکە شیبکاتەوەو دانەکەی لێ دەربێنێ.

**فخمیده**- ا.مف(فەخمیدە- fexmîde): لۆکەتی شیکراوە .

**فخن**- ا (فەخەن- fexen): ناوباغ.

**فخوخ**-ا.ع(فوخوخ-fuxûx): داو، تەڵە، فاق.

**فخور**- ص.ع(فەخوور- fexûr): نازکەر، فەخرکەر.

**فخیخ**- مص.ل.ع(فەخیخ- fexîx): پرخەپرخکردن لە خەودا، فیشکاندنی مار.

**فخیر**- ا(فەخیر- fexîr): مامێز.

**فخیم**- ص.ع(فەخیم- fexîm): گران قەدر، گەورە، پایەبەرز.

**فداء**- مص.ل.ع(فیداء- fida'): سەربایی، بەهای سەر، فدیەدان، خۆکڕینەوە لە یەخسیری، پارەدان بۆ خۆ رزگارکردن لە دیلی یان شتی دی.

**فداشدن**- مص.ل(فیداشودەن- fida şuden): گیان فیداکردن لە رای کەسێک یان مەبەستو ئارمانجێک.

**فداکردن**- مص.م(فیداکەردەن- fida kerden): قوربانی کردن، خۆ فیداکردن لە پێناوی مەبەستێک یان کەسێک، گیان فیداکردن.

**فداء**- ا.ع(فەداء- feda'): عەماری ئازووقە، عەماری کاڵا.

**فدائی**- ص.ع(فیدائی- fida'î): فیدائی، پێشمەرگە، گیان فیدا.

**فدافد**- ا.ع(فەدافید- fedafid): شوێنی دژوارو سەخت، شوێنی بەرز، دەست، زەوی هەموارو راستانی .

**فداکار**- ص.مر(فیداکار- fidakar): فیداکار، کەسێک گیان یان سامانی خۆی لە رای کەسێکی دیدا فیدابکات.

**فداکاری**- ا.مص(فیداکاری- fidakarî): فیداکاری، گیان فیداکردن.

**فدام**- ا.ع(فەددام- feddam): دەم بەند، پاڵوێنکە، جرجێتێ یان پەڕۆیەکی تەنک کە شلەمەنی پێ بپاڵێورێ.

**فدامت**- مص.ل.ع(فەدامەت- fedamet): دامان لە قسەکردندا، گەوج بوون.

**فدان**- ا.ع(فەددان- feddan): دوو گا بۆ جووتکردن بەیەکەوە ببەسترێن، مەزرا، کێڵگە، پێوانەیەک بووە بۆ پێوانی پانتایی.

**فدراسیون**- ا.فر(فیدیراسیون- fidirasyûn): فیدراسیۆن، یەکێتی چەند وڵاتێک، یەکێتی چەند شارێک، یەکێتی چەند دەستەیەک لە خەڵکی، ئەنجوومەنی کارگێڕی لقێک لە وەرزش.

**فدرال**- ص.فر(فیدیرال- fidiral): فیدراڵ.

**فدرالیسم**- ا.فر(فیدیرالیسم- fidiralism): سیستەمی سیاسەتێکە کە بەپێی ئەوە وڵاتێک لە چەند هەرێمو ناوچەیەکی سەربەخۆ پێکدێ، وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

**فدرنجک**- ا(فەدرەنجەک- fedrencek): مێردەزمە، شەوگ، مۆتەکە.

**فدرنگ**- ا(فەدرەنگ- fedreng): گلاکوتک، دارێکە دەخرێتە پشتی دەرگا تا قایم بێو نەکرێتەوە، پشتکۆڵ.

**فدره**- ا(فەدرە- fedre): زەل، قەرەم، حەسیر، لەبان.

**فدفد**- ا.ع(فەدفەد- fedfed): شوێنی سەختو عاسی، شوێنی بەرز، شوێنی دەشتو راستانیو هەموار.

**فدوی**- ص.(فەدەڤی- fedevî): فیدایی،

**فدی**- ا.ع(فیدا- fîda): ئەوەی کە یەخسیران لەبری رزگاری خۆ بیدەن ، سەر بەها ، بەهای سەر، سەربایی.

**فدیات**- ا.ع(فیدەیات- fideyat): فدیە، سەربەها ، بەهای خۆ کڕینەوە.

**فدیه**- ا.ع(فیدیە- fidye): فدیە، سەربەها، بەهای خۆ کڕینەوە.

**فذلکه**- مص.م.ع(فەزلەکە- fezleke): بە کۆتایی هێنانی حیسابو لێبوونەوە لێی، خۆلاسەی کەلام، خۆلاسەو ئەنجامو کۆتایی، پوختەی قسە.

**فر**- ا(فەر- fer): شانو شەوکەت، شکۆ، تیشک، جوانی، ڕەونەق.

**فر**- ا.فر(فیر- fir ): ئامێرێکە بۆ وشکەوەکردنو لوول کردنی قژ، ئامێرێکە وەکو تەنور یان کوانوو کە خواردنی تیا لێدەنرێ.

**فر**- مص.ل.ع(فەر- fer): ڕاکردن، هەڵاتن.

**کروفر**- ا.مر(کەرو فەڕ- kerrû ferr): پەلامارو ڕاکردن، هەڵمەت و کشانەوە.

**فراء**- ا.ع(فەراء- fera’): کەری کێوی.

**فراء**- ا.ع(فیراء- fira’): فەروە.

**فراء**- ا.ص.ع(فەڕاء- ferra’): فەروەفرۆش، پەستەک فرۆش.

**فرا امدن**- مص.ل(فەرا ئامەدەن- fera ameden): هاتنەپێش.

**فرا اوردن**- مص.م(فەرا ئاڤەردەن- fera averden): بەدەست هێنان، دروستکردن.

**فرا اورده**- ص.مف(فەرا ئاڤەردە- fera averde): بەرووبوومی بەدەست هاتوو، دروستکراو.

**فرائد**- ص.ع(فەرائید- feraid): گەوهەری تاقانە، بێ وێنە، بێ هاوتا، دەگمەن.

**فرائس**- ا.ع(فەرائیس- ferais): نێچیر، کوژراو، کوشتە.

**فرائض**- ا.ع(فەرائیز- feraiz): فەرزو واجبان.

**فرا افکندن**- مص.م (فەرا ئەفکەندەن- fera efkenden): هێنانە ئارا.

**فرا بافتن**- مص.مر(فرا بافتەن-fre baften): بادان، دووبارەبادان، پێکەوە بادان، پێکەوە هۆنینەوە، درۆ هەڵبەستن، بوختانو ئیفتەرا.

**فرابر**- ا(فەرابەر- feraber): ئەو بەشەی میوە کە ناوکی تێدایە.

**فرابردن**- مص.م(فەرا بوردەن- fera burden): پێش بردن.

**فرابستن**- مص.م(فەرابەستەن- fera besten): بەستن بە چاکی، مەحکەم داخستن، توندگرێ دان.

**فراپایه**- ص(فەراپایە- fera paye): پایە بەرز، گران قەدر.

**فراپشت**- ق(فەراپوشت- fera puşt): لەسەر پشت.

**فراپشت کردن**- مص.م(فەراپوشت کەردەن- fera puşt kerden): خستنە سەرشان.

**فراپوش**- ص(فەراپووش- fera pûş): بێهۆش، لە هۆش چوو.

**فراپیش**- ق(فەراپیش- fera pîş): پێش، بەردەم.

**فرات**- ا.ع(فورات- furat): دەریا، ئاوی شیرینو سازگار، ناوی ڕووبارێکە بە سوریاو عێراقدا دەڕوات، ناوی ڕووبارێکە لە کوردستانی تورکیاوە هەڵدەقوڵێ.

**فراتر**- ق(فەراتەر- ferater): پێشتر، نزیکتر، باڵاتر، بەرزتر.

**فراترک**- ق(فەرا تەرەک- fera terek): کەمێ پێشتر، تۆزێ پێشتر.

**فراته**- ا(فوراتە- furate): باسوق.

**فراچنگ**- ق(فەراچەنگ- fera çeng): بە چنگ هێنان، بەدەست هێنان.

**فراچیدن**- مص.م(فەراچیدەن- feraçîden): کۆکردنەوە، کێشانەوە.

**فراخ**- ص(فەراخ- ferax): بەرین، پان، زۆر، فرە.

**فراخ**- ا.ع(فیراخ- firax): فەرخە، بێچوو.

**فراخا**- ا(فەراخا- faraxa): پانی، پانایی.

**فراخاستن**- مص.ل( فەراخاستەن- feraxasten): هەستان.

**فراخ استین**- ص.مر(فەراخ ئاستین- ferax astîn): دەست بڵاو، دەست کراوە، بەخشندە، سەخیو جوامێر.

**فراخ اهنگ**- ص.مر(فەراخ ئاهەنگ- ferax aheng): دوور بورد، گوللەیەک کە نیشانەی دوور بپێکێ.

**فراخ ابرو**- ص.مر(فەراخ ئەبروو- ferax ebrû): رووخۆش.

**فراخبال**- ص.مر(فەراخ باڵ- ferax bal): ئاسوودە خەیاڵ، ئاسوودە دڵ، دەستکراوە، بەخشندەو دڵاوا.

**فراخبر**- ص.مر(فەراخ بەر- ferax ber): سینەپان، سینگ پان.

**فراخ بوم**- ص.مر(فەراخ بوم- ferax bûm): دەشتی پانو بەرین.

**فراخ بین**- ص.فا(فەراخ بین- ferax bîn): سینگ فراوان، فراوان بین.

**فراخ پیشانی**- ص.مر(فەراخ پیشانی- ferax pîşanî): تەوێڵ پان، نێوچەوان پان.

**فراختن**- مص.م(فەراختەن- farax ten): هەڵکردن، بەرزکردنەوە.

**فراخ جا**- ص.مر(فەراخ جا- ferax ca): شوێنی بەرین.

**فراخ چشم**- ص.مر(فەراخ چەشم- ferax çeşm): چاو گەورە.

**فراخ حوصله**- ص.مر(فەراخ هەوسەلە- ferax hewsele): بەسەبرو حەوسەڵە، پشوودرێژ، بە ویقار.

**فراخ دامن**- ص.مر(فەراخ دامەن- ferax damen): داوێن پان، دەستکراوە.

**فراخ درم**- ص.مر(فەراخ دیرەم- ferax direm): پارەدار، زەنگین، دەوڵەمەند، دارا، بووە.

**فراخ دست**- ص.مر(فەراخ دەست- ferax dest): سەخی، بەخشندە، دڵاوا، دەستکراوە.

**فراخ دستی**- ا.مص(فەراخ دەستی- ferax destî): جوامێری، دەستکراوەیی، بەخشندەیی، سەخاوەتی.

**فراخ دل**- ص.مر(فەراخ دیل- ferax dil): بێ باک، زۆر خۆر.

**فراخ دوش**- ص.مر(فەراخ دووش- ferax dûş): چوار شانە.

**فراخ دهن**- ص.مر(فەراخ دەهەن- ferax de-hen): دەم پان، هەرزەوێژ، چەنەباز، چەقاوەسوو، هەڵەوەڕ.

**فراخ دیده**- ص.مر(فەراخ دیدە- ferax dîde): چاوو دڵ کراوە، چاوو دڵ تێر، بەخشندە.

**فراخ رو**- ص.فا(فەراخ رەو- ferax rew): تیژڕەو، دەست بڵاو.

**فراخ روو**- ص.مر(فەراخ روو- ferax rû): رووخۆش، دەم بە پێکەنین.

**فراخ روزی**- ص.مر(فەراخ رووزی- ferax rûzî): دەوڵەمەندو رزقدار، ئەوەی رزقو رۆزی زۆر بێ.

**فراخ زیدن**- مص.ل(فەراخەزیدەن- ferax-ezîden): خزین بەرەوپێش.

**فراخ زیست**- ص.مر(فەراخ زیست- ferax zîst): ژیان خۆش، ئەوەی لە نازو نیعمەتدا بژی.

**فراخ سال**- ص.مر(فەراخ سال- ferax sal): هاتە ساڵ، ساڵی پڕ بەرەکەتو هەرزانی.

**فراخ سخن**- ص.مر(فەراخ سوخەن- ferax suxen): هەڵەوەڕ، چەنەباز، هەرزەگۆ، چەقاوەسوو، چەقەچناوە.

**فراخ سخنی**- ا.مص(فەراخ سوخەنی- ferax suxenî): هەڵەوەری، چەنەبازی.

**فراخ شانە**- ص.مر(فەراخ شانە- ferax şane): چوارشانە.

**فراخ شکم**- ص.مر(فەراخ شیکەم- ferax şikem): زگ زل، پرخۆر، زۆر خۆر.

**فراخ شلوار**- ص.مر(فەراخ شەلڤار- ferax şelvar): پانتۆڵ دەڵب، تەمبەڵو تەوەزەل، قون گران.

**فراخ عیش**- ص.مر(فەراخ ئەیش- ferax eyş): ژین خۆش، کەسێک لە نازو نیعمەتدا بژی.

**فراخ کام**- ص.مر(فەراخ کام- ferax kam): خۆشحاڵ، خۆشبەخت، کامەران.

**فراخ کندوری**- ص.مر(فەراخ کەندوری- ferax kendûrî): سفرە گەورە، سەخیو جوامێر، دەست کراوە، دڵاوا.

**فراخ گام**- ص.مر(فەراخ گام- ferax gam): هەنگاو هەراو، هەراو هەنگاو، تیژڕەو.

**فراخنا**- ا.مر(فەرخنا- ferexna): بەرین و بەربڵاو..

**فراخ نان و نمک**- ص.مر(فەراخ نانو نەمەک- ferax nan û nemek): ئەوەی زۆربەی کات میوانی هەبێ، میواندار، فرە میوان.

**فراخ نشتن**- مص.ل(فەراخ نیشیستەن- ferax nişisten): پان دانیشتن، دانیشتن دوور لە یەک.

**فراخ نعمت**- ص.مر(فەراخ نیئمەت- ferax ni'met): فرە نیعمەت، شوێنێ پڕ نیعمەت بێ.

**فرا خواندن**- مص.ل(فەراخاندەن- feraxanden): ناردن بە شوێن کەسێکدا، جەلبکردن.

**فراخور**- ص(فەراخوور- feraxûr): شایستە، هەژ، شایانی.

**فراخویش**- ق(فەراخیش- feraxîş): لەگەڵ خۆدا.

**فراخە**- ا(فەراخە- feraxe): لەرزە، موچوڕکە.

**فراخیدن**- مص.ل(فەراخیدەن- feraxîden): رەپبوونی مووی لەش، لێکدی جیابوونەوە.

**فراخیگاە**- ا.مر(فەراخیگاه- feraxîgah): شوێنی بەرین، شوێنێ کە فەرو بەرەکەتو نیعمەتی زۆربێ.

**فرادادن**- مص.م(فەرادادەن- feradaden): ئاراستەکردن، شەڕحکردنی بابەتێک.

**پشت فرادادن**- مص.م(پوشت فەرا دادەن- puşt fera daden): پشت تێ کردنو هەڵاتن.

**گوش فرا دادن**- مص.م(گووش فەرا دادەن- gûş fera daden): گوێ گرتن و ژنەوتن.

**فرا داشتن**- مص.م(فەرا داشتەن- fera daşten): بەرزکردنەوە، ئاراستەکردن بەلایەکدا.

**گوش فرا داشتن**- مص.م(گووش فەرا داشتەن- gûş fera daşten): گوێ گرتنو ژنەوتن.

**فرادر**- ا.مر(فەرادەر- fera der): پشتکۆڵ.

**فرادست**- ق(فەرادەست- fera dest): بەدەست، لە دەستدا.

**فرادست امدن**- مص(فەرا دەست ئامەدەن- fera dest ameden): بەدەست هاتن، هاتنە پێش.

**فرادست دادن**- مص(فەرادەست دادەن- fera dest daden): سپاردن، پێ سپاردن، دان بە دەستی کەسێک.

**فرادی**- ع(فورادا- furada): تەنیا تەنیا.

**فرادید**- ق(فەرادید- feradîd): ئاشکرا، لەبەرچاو.

**فرادیدن**- مص.م(فەرادیدەن- feradîden): دیتن.

**فرادیس**- ا.ع(فەرادیس- feradîs): بەهەشتان.

**فرار**- مص.ل.ع(فیرار- firar): هەڵاتن، ڕاکردن، وایین.

**فـرارکـردن**- مص.ل(فـیـرار کـەردەن- firar kerden): هەڵاتن، راکردن، وایین.

**فـرار**- ص.ع(فـەڕار- ferrar): کـەسـێک زوو فیرار بکات. تەنێک زوو ببێ بە هەڵم.

**فـراسـیـدن**- مص.ل(فـەرا رەسـیـدەن- fera resîden): نزیک بوونەوەی وەختی شتێک یان کارێک.

**فرارفتن**- مص.ل.فەرا رەفتەن- ferar reften): رۆییشتن.

**فـرارون**- ص(فـەراروون- ferarûn): ئەوەی دەچێـتـە پێـشـێ، راست، دروست، دروسـتـکار، راستگۆ، چاکەکار، داوێن پاک.

**فراروی**- ق(فەرارووی- fera rûy): بەرانبەر، ناسراوو مەنشور.

**فراز**- ا.فەراز- feraz): هەوراز، بەرز، باڵا.

**فـراز اوردن**- مص.م(فـەراز ئاڤـەردەن- feraz averden): کـۆکـردنەوە، دۆزینەوە، بەدەست هێنان.

**فـراز امـدن**- مص.ل(فـەراز ئامـەدەن- feraz ameden): گەییشتن، نزیکبوونەوە، هاتنەوە، دەرکەوتن.

**فـرازانیـدن**- مص.م(فـەرازانیـدەن- fera-zanîden): هـەڵـکـردن، هـەڵـکـردنـی ئـاڵا، بەرزکردنەوە، داگیرساندنی ئاگر، هەڵایساندنی ئاور.

**فـرازیاب**- ا.مـر(فـەرازیاب- ferazyab): ئامێری بەرزی پێو.

**فـرازیدن**- مص.م(فـەرازیدەن- ferazîden): هەڵکردن، بەرزکردن، کردنەوە، داخستن.

**فـرازنده**- ا.فـا(فـەرازەندە- ferazende): بەرزکەرەوە، هەڵکەر.

**فـرازیده**- ا.مف(فـەرازیدە- ferazîde): هەڵکراو، بەستراو، داخراو.

**فراس**- ا.ع(فەراس- feras): جۆرە خورمایەکە، خورمای رەش.

**فراس**- ا.ع(فەڕاس- ferras): شێر.

**فـراس**- ص.ع(فـەڕاس- ferras): زۆر زیرەک، هۆشمەند، سەرناس.

**فـراست**- مص.م.ع(فـیـراسـەت- firaset): دەرککردنی ناخی شتێک لە رێگەی تەماشاکردنی رواڵەتی ئەو شـتـە، هوشـیـاری، هۆشـمـەندی، زیرەکی.

**فـراست**- مص.م.ع(فـەراسـەت- feraset): سوارچاکی، سواریکردن.

**فراستدن**- مص.م(فەراسیتەدەن- ferasite-den): وەرگرتن، سەندن.

**فـراسـتـوک**- ا(فـەراس توک- ferastûk): پەڕەسێلکە، پلیسری.

**فراسخ**- ا.ع(فەراسیخ- ferasix): قۆناغان، فەرسەخان.

**فراسر**- ق(فەراسەر- feraser): سەری سەر، دەوری سەر، ژێر سەر.

**فراسیون**- ا(فەراسییون- ferasîyûn): جۆرە گیایەکە لە کۆنا بۆ دەرمان بەکار هاتووە.

**فراش**- ا.ع(فـیـراش- firaş): فـەرش، رایەخ، نوێن، پێخەف.

**صاحب فراش**- ا.مر(ساهیب فیـراش- sahib firaş): نەخۆشی لە جێدا کەوتوو.

**تجدید فـراش کـردن**- مص.م(تەجدیدی فـیـراش کـەردەن- tecdîdi firaş kerden): دووبارە ژن هێنان.

**فراش**- ا.ع(فەراش- feraş): پەپوولان.

**فراش**- ص.ع(فەڕاش- feraş): فەرش راخەر، پۆستەبەر، گسکدەری حەرەمێن پیرۆز، فەڕاش، پێشخزمەت.

**فراشا**- ا.فەراشا- feraşa): موچورکە، باوێشکە.

**فـراش باشی**- ا.مـر(فـەڕاش باشی- feraş başî): فەڕاش باشی، سەر دەستەی فەڕاشان.

**فـراشتن**- مص.م(فـەراش تەن- feraşten): هەڵکردن.

**فـراشـتـوک**- ا(فـەراش توک- feraş tûk): پەڕەسێلکە، پلیسری.

**فراشخانە**- ا.مر(فەراش خانە- feraş xane): فەڕاشخانە، ژووری فەڕاشان.

**فراشدن**- مص.ل(فـەراشودەن- feraşuden): وەژوور کەوتن، داخڵ بوون.

**فراشە**- ا.ع(فەراشە- feraşe): پەروانە، پەپوولە.

**فراشیدن**- مص.ل(فەراشیدەن- feraşîden): لەرزو بێتاقەتی بەر لەسەر هەڵدانی تێ.

**فراشیون**- ا(فەراشییون- feraşîyûn): جۆرە رووەکێکە.

**فـراص**- ص.ع(فـیـراس- firas): توند، زبر، درشت، زۆر سوور، جل.

**فـراض**- ا.ع(فـیـراز- firaz): جل و بەرگ، پۆشاک.

**فـراض**- ص.ع(فـەراز- ferraz): شـارەزای فەرزو واجبان.

**فـراعنە**- ا.ص.ع(فـەرائینە- fera'ine): فیرعەونان، ستەمکاران، سەرکێشان، لوتبەرزان، نازناوی هەر یەکێک لە پاشایانی کۆنی میسر بووە.

**فراغ**- مص.ل.ع(فەراغ- ferax): بەتاڵ بوون، ئاسوودە بوون، لێبوونەوە لە کارێک.

**فراغ**- ا.ع(فیراغ- firax): قاپ، ئامان، بادەی گەورە.

**فراغت**- مص.ل.ع(فەراغەت- feraxet): بێ تاقەت بوون، نیگەران بوون، ئاسوودەبوون، دڵنیا بوون.

**فرافر**- ا(فەرافەر- ferrafer): فرەفڕ.

**فـرافـر**- ا.ع(فـورافـیـر- furafir): بەرخ، کارژۆلە، گوێرەکە، پیاوی گەوج.

**فراق**- مص.ل.ع(فیراغ- firax): جیابوونەوە.

**فراق**- ا.مص.ع(فەراغ- ferax): جودایی.

**فراق زده**- ص.مر(فیراغ زەدە- firax zede): جودایی کێش، هیجران دیتە، موفتەلا بەدەردو ئازاری جودایی.

**فـراک**- ا.فـر(فـوراک- furak): پشت، حیز، کرێت، دزێو.

**فراک**- ا.فر(فراک- frak): جۆرە جلێکی رەشی پیاوانەیە لە بۆنەو میوانی رەسمیدا لەبەری دەکەن.

**فراکسیون**- ا.فر(فراکسیون- fraksiyûn): دەستەیەک لە ئەندامانی یەک حیزب، فراکسیۆن، بەش، پاژ، تاقمێکی هاو باوەڕ، شکان.

**فـراکـشـیـدن**- مص.م(فـەراکـەشـیـدەن- fera keşîden): بەلای خۆدا راکێشان، هەڵکێشان بۆ سەرەوە.

**فـراکن**- ا(فـەراکـەن- fera ken): کـارێز، جوگەی تازە لێدراو، زەوییەک کەسێلاو هەڵیدڕی بێ‌و بووبێ بە کەندڕ، ئاودڕ.

**فرا گرفتن**- مص.م(فەراگیریفتەن- fera girif-ten): وەرگرتنەوە، داگیرکردن، فێربوون.

**فـرامـاسـونری**- ا.فـر(فەراما سوونەری- ferma sûnerî): رێکخراویکە بۆچوونی خۆی هەیە، شانەو ئەنجوومەنی نهێنی هەیە، لە هەندێ وڵاتاندا بە تایبەتی لە بەریتانیادا رێکخستنی هەیەو ئەندامانی ئەم رێکخراوە فراماسۆن-یان پێ دەگوترێ. ئامانجیان لایەنگرییە لە مرۆڤپەروەریو مشتوماڵدانی ئاکارو گەشەپێدانی فیکری خەڵکو وڵاتانی جیاوازی ئایینی. لە فارسیدا (فەراموشخانە)شیان بەم رێکخراوە گوتووە، ماسۆنی.

**فرامش**- ا.ص(فـەرامـوش- feramuş): لەیاد چوو، لە بیرکراو، فەرامۆش.

**فرامـشـت**- ا.ص(فـەرامـوشت- feramuşt): لەیادکراو، لەبیرکراو، فەرامۆشێنراو.

**فـرامـشـت**- ا(فـەرامـوشت- feramuşt): لە مستدا، ئەوەی لە مستتدابێ.

**فـرامـشـکـار**- ص.فـا(فـەرامـوشکار- feramuşkar): فەرامۆشکار، کەسێک زوو شت لە بیر بکا، سست بیر.

**فـرامـوش شـدن**- مص.ل(فـەرامـوش شـودەن- feramuş şuden): لەبیرچوون، لە یادچوون.

**فراموش کردن**- مص.م(فەرامۆش کەردەن- feramuş kerden): لەبیرکردن.

**فراموشخانه**- ا.مر(فەرامووشخانە- feramuşxane): ڕێکخراوی ماسۆنیەت، زندانە سامناکەکانی سەردەمی دیکتاتۆریەت.

**فراموشکار**- ص.فا(فەرامووشکار- feramuşkar): سست بیر، کەسێک زوو شت لە بیر بکات.

**فراموشیدن**- مص.م(فەرامووشیدەن- feramûşîden): لەبیرکردن، لەبیر بردنەوە، فەرامۆشاندن.

**فرامون**- ا(فەراموون- feramûn): دەورووبەر.

**فرامین**- ا.ع(فەرامین- feramîn): فەرمانان.

**فرانج**- ا.ع(فەرانەج- feranec): مۆتەکە، دێوەزمە، شەوگ.

**فراند**- ا.ع(فەرانید- feranid): شمشێری جەوهەردار، حەریر.

**فرانسوی**- ص.ن(فەرانسەڤی- feransevî): خەڵکی فەرەنسا، زمانی فەرەنسی.

**فرانق**- ا.ع(فورانیغ- furanix): ڕێنوێن و پێشڕەوی لەشکر.

**فرانک**- ا(فەرانەک- feranek): جۆرە جانەوەرێکە، گوێ ڕەش.

**فرانک**- ا.فر(فیرانک- firank): جۆرە پارەیەکی فەرەنسیو سویسرییە.

**فرانمودن**- مص.م(فەرانوموودەن- fera numûden): نیشاندان، ئاشکراکردن، نواندن.

**فرانهادن**- مص.م(فەرانیهادەن- feranihaden): دانان.

**فراوار**- ا(فەراڤار- feraver): باڵەخانە، هاوینە هەوار، شوێنی هاوینە.

**فراوان**- ص(فەراڤان- feravan): فراوان، فرە، زۆر، مشە.

**فراوان هنر**- ص.مر(فەراڤان هونەر- feravan huner): فرە هونەر، کەسێک هونەری زۆر هەبێ.

**فراورده**- ا.مف(فەراڤەردە- fera verde): بەرووبوومی بەدەست هاتوو، بەروبوومی کشتوکاڵ یان سنعەت.

**فراوند**- ا(فەراڤەند- feravend): پشتکۆڵ.

**فراویز**- ا(فەراڤیز- feravîz): پەراوێز.

**فراهت**- مص.ل.ع(فەراهەت- ferahet): شادبوون، شادمان بوون، بۆژانەوە.

**فراهم**- ص(فەراهەم- ferahem): ئامادە، تەیار، گردوکۆ.

**فراهم امدن**- مص.ل(فەراهەم ئامەدەن- ferahem ameden): جەم بوون، گردبوونەوە، خربوونەوە.

**فراهم اوردن**- مص.م(فەراهەم ئاڤەردەن- ferahem averden): گردکردنەوە، خڕکردنەوە.

**فراهم شدن**- مص.ل(فەراهەم شودەن- ferahem şuden): بەدەست هاتن.

**فراهم کردن**- مص.م(فەراهم کەردەن- ferahem-kerden): ئامادەکردن، بەدەست هێنان.

**فراهیختن**- مص.م(فەراهیختەن- ferahixten): پەروەردەکردن، تەربێت دان، فێرکردن، هەڵکێشان (بۆ شمشێرو خەنجەران).

**فراهیخته**- ص.مف(فەراهیختە- ferahixte): پەروەردەکراو، تەربێت دراو، هەڵکێشراو، دەرچوو.

**فراهید**- ا.ع(فەراهید- ferahid): بەرخ، بەرخۆلە، بێچوی بزنە کێوی.

**فرایاز**- ص.فا(فەرایاز- ferayaz): تصاعد (بەرزبوونەوە).

**فرایازی**- ا.مص(فەرایازی- ferayazî): تصاعدی.

**فرایافتن**- مص.م(فەریافتەن- ferayaften): دەرککردن، تێگەییشتن.

**فربال**- ا(فەربال- ferbal): باڵەخانە، خانووی هاوینە، کەپر.

**فربه**- ص(فەربیه- ferbih): گۆشتن، قەڵەو.

**فربهی**- ا.مص(فەربیهی- ferbihî): قەڵەوی، گۆشتنی.

**فربەشدن**- مص.ل(فەربیه شودەن- ferbih şuden): قەڵەو بوون.

**فربەکردن**- مص.م(فەربیه کەردەن- ferbih kerden): دابەستن و قەڵەو کردن.

**فربی**- ص(فەربی- ferbî): قەڵەو.

**فربیون**- ا(فەربییون- ferbiyûn): جۆرە گیایەکە، هەمیشەبەهار.

**فرت**- ا(فەرت- fert): تان.

**فرت فرت**- ق( فیرت فیرت- firt firt): فرتە فرتە، جرت و فرت، پەلە پەل.

**فر توت**- ص(فەرتووت- fertût): زۆر پیر، پەککەوتە، زورهان، کەنفت.

**فرث**- ا.ع(فەرس- fers): ریخی ناو زگ.

**فرج**- ا.ع(فەرەج- ferec): لاچوونی غەمو پەژارە، ڤەبوونی دەروو، رەوینەوەی خەم.

**فرج**- ا.ع(فەرج- ferc): کون، عەورەتی ژن، شەرم، زێ، قوز

**فرج**- ا.ع(فورەج- furec): درزان، شەقان، کونان.

**فرجاد**- ص(فەرجاد- fercad): هزرڤان، زانا.

**فرجار**- ا.ع(فیرجار- fircar): پرگاڵ.

**فرجاری**- ص.ن.ع(فیرجاری- fircarî): بازنەیی.

**فرجام**- ا.(فەرجام- feircam): ئەنجام، ئاکام، کۆتایی، ئاقیبەت.

**فرجام خواستن**- ص.ل(فەرجام خاستەن- fercam xasten): داوای تەمییز کردنی حوکم.

**فرجامگاه**- ا.مر(فەرجام گاه- fercamgah): دوا ماڵ، گۆڕ، قیامەت، رۆژی پەسڵانێ.

**فرجامیدن**- مص.ل(فەرجامیدەن- fercamîden): بە ئەنجام گەییشتن، کۆتایی هاتن.

**فرجمند**- ص(فەرجمەند- fercmend): هەژێ، هێژا، بەرێز، قەدرگران.

**فرجه**- ا.ع(فورجە- furce): کون، دزر، دەروو، کەلێن.

**فرجه**- ا.ع(فورجە- furce): خەلە سین لە خەمو پەژارە، شادیو خۆشی پاش رەوینەوەی خەم.

**فرجی**- ا(فەرەجی- ferecî): جۆرە جبەیەکی سۆفیانە، خەرقە.

**فرچه** ا(فیرچە- firçe): فڵچە، پەرەمووچ، فڵچەی تەراش.

**فرح**- مص.ل.ع(فەرەه- fereh): شادبوون، شادمان بوون.

**فرح**- ص.ع(فەریه- ferih): شاد، شادمان.

**فرح افزار**- ص.فا(فەرەه ئەفزا- fereh efza): زیادکەری شادی.

**فرحان**- ص.ع(فەرهان- ferhan): شاد، بەکەیف، دڵخۆش.

**فرح انگیز**- ص.فا(فەرەه ئەنگیز- fereh engîz): مایەی شادی.

**فرح بخش**- ص.فا(فەرەه بەخش- fereh bexş): شادی بەخش شادی هێن.

**فرحت**- ا.مص.ع(فەرهەت- ferhet): خۆشی، شادی، مژدە.

**فرحناک**- ا.(فەرەهناک- ferehnak): شاد، شادمان، بە کەیف، مایەی شادی.

**فرخ**- ا.ع(فەرخ- ferx): جوجەڵە.

**فرخ**- ص.(فەرروخ- ferrux): جوان، پرشنگدار، تابان، موبارەک، پیرۆزو پاک.

**فرخار**- ا(فەرخار- ferxar): دێر، پەرستگە، بتخانە.

**فرخاردیس**- ص.مر(فەرخاردیس- ferxardîs ): وەکو بتخانە، جوان و رازاوە وەک و بتخانە.

**فرخاش**- ا(فەرخاش- ferxaş): توندوتیژ، جەنگ و جیدال.

**فرخاگ**- ا(فەرخاگ- ferxag): مەخلەمە، گۆشتی لە رۆنا سوورەوەکراو بە هێلکەوە.

**فرخال**- ص (فەرخال- ferxal): قژی خاو.

**فرخ پی**- ص.مر(فەروخ پەی- ferux pey): پێ بە خێر.

**فرختار**- ص.فا(فروختار- fruxtar): فرۆشیار.

**فرختن**- مص.م(فوروختەن- furuxten): فرۆشتن، فرۆتن.

**فرخج**- ص(فەرەخج- ferexc): ناشیرین، دزێو، کرێت، ناپاک.

**فرخجسته**- ص(فەرخوجەستە- ferxuceste): موبارەک، پیرۆز، گوڵی هەمیشە بەهار.

**فرخ دیم**- ا.مر(فەروخ دیم- ferux dîm): جوان، قۆز، جوان خاس.

**فرخ روز**- ا.مر(فەڕوخ رووز- ferux rûz): ناوی ئاوازێکە لە سی ئاوازەکەی باربەد-ە.

**فرخ زاد**- ص.مر(فەروخ زاد- ferux zad): خۆشبەخت، بە بەخت، بەشانس.

**فرخسته**- ص(فەرخەستە- ferxeste): کوژراوی بە عاریدا راکێشراو، پێشێلکراو.

**فرخ سیر**- ص.مر(فەڕوخ سییەر- ferux siyer): ئاکار جوان، ئاکار باش.

**فرخش**- ا(فەرەخش- ferexş): کەفەڵ و لاتەرافی ئەسپو هێستر، سمت، پاشەڵ.

**فرخ شب**- ا.مر(فەڕوخ شەب- ferux şeb): ناوی ئاوازێکی سی ئاوازەکەی باربەد-ە.

**فرخشته**- ا(فەرخەشتە- ferxeşte): لەبزینە، لەوزینە.

**فرخ فال**- ص.مر(فەڕوخ فال- ferrux fal): بەبەخت، بەخت باش.

**فرخ لقا**- ص.مر(فەڕوخ لیغا- ferrux lixa): جوان، خشکۆک.

**فرخمیدن**- مص.م(فەرەخ میدەن- ferex mîden): شیکردنەوە، هەلاجی کردن، وردبوونەوە لە کاردا.

**فرخمیده**- ا.مف(فەرەخمیدە- fere mîde): هەلاجی کراو، پەمووی شیکراوە.

**فرخنج**- ا(فەرخەنج- ferxenc): بەخت، بەش، نسیب، تەرەبو خۆشی.

**فرخنده**- ص(فەرخوندە- ferxunde): مومبارەک، پیرۆز، باش.

**فرخنده بخت**- ص.مر(فەرخوندە بەخت- ferxunde bext): خۆشبەخت، بە تالح.

**فرخندەپی**- ص.مر(فەرخوندەپەی- ferxunde pey): پێ بەخێر.

**فرخنده حال**- ص.مر(فەرخوندە هال- ferxunde hal): شادمان، حاڵ باش.

**فرخندەرای**- ص.مر(فەرخوندە رای- ferxunde-ray): ئەوەی راوبۆچوونی باشی هەبێ.

**فرخنده طالع**- ص.مر(فەرخوندە تالیئ- ferxunde tali’): خۆشبەخت، بەتالح، خۆش یەغباڵ.

**فرخنده فال**- ص.مر(فەرخوندە فال- ferxunde-fal): خۆشبەختو ناوچەوان.

**فرخنده فرجام**- ص.مر(فەرخوندە فەرجام- ferxunde fercam): ئاقیبەت خێر، خۆش ئاقیبەت، ئاکام خێر.

**فرخ نژاد**- ص.مر(فەروخ نەژاد- ferux nejad): وەچاغزادە، خودان ئەسڵو فەسڵ.

**فرخو**- ا.مص(فەرخەو- ferxew): بژارکردنی گیاکەڵە لە نێو مەزرادا، پەرچ کردنی لقو پۆپی مێوو دارو درەختی دی.

**فرخواگ**- ا (فەرخاگ- ferxag): گۆشتی سوورەوەکراو کە هێلکەی بەسەرا بکرێ، هێلکەو قیمەی سوورەوەکراو، مەخلەمە.

**فرخویدن**- مص.م(فەرخەڤیدەن-ferxevîden): برینو پەرچکردنی لقو پۆپی درەخت.

**فرد**- ص.ع(فەرد- ferd): تاک، تاقانە، بێ نەزیر، بێ هاوتا.

**فردا**- ا(فەردا- ferda): سبەی. بەیانی، سبزی، سارا.

**فردان**- ص.ع(فەردان- ferdan): تەنیا، تاقانە.

**فردایین**- ص.ن(فەردایین- ferdayin): سبەی.

**فردخانە**- ا.مر(فەردخانە- ferdxane): چلەخانە، خەڵوەتخانە، ژوورێکە لە خانەقادا کە خەڵکانێک لەوێندەر چلەکێشی دەکەن.

**فردر**- ا.مر(فەردەر- ferder): پشتکۆڵی دەرگا.

**فردوس**- ا(فیردەوس- firdews): باغ، بەهەشت.

**فردوس مکان**- ص.مر(فیردەوس مەکان- firdews mekan): بەهەشتی، ئەوەی لە بەهەشتدا جێی هەبێ.

**فردیت**- ا.ع(فەردییەت- ferdiyet): تاکایەتی، تاک بوون.

**فردین**- ا(فەردین- ferdîn): کورت کراوەی فەروەردین-ە.

**فرز** - ص(فیرز- firz): چوستو چالاک، گورجو گۆڵ، چابوکو چەلەنگ.

**فرز**- ا(فیریز- firiz): فریز، چیمەن.

**فرزام**- ص(فەرزام- ferzam): شایستە.

**فرزان**- ص(فەرزان- ferzan): حەکیم، زانا، فرەزان، ئاقڵ، بە ئاوەز.

**فرزان**- ا.ع(فیرزان- firzan): بەردێکی شەترەنجە، وەزیر.

**فرزانە**- ص(فەرزانە- ferzane): هرزڤان، زانا، ئاقڵ، شەریف، پاک نەژاد.

**فرزجە**- ا(فەرزەجە- ferzece): ریشوو، پرزۆڵ.

**فرزد**-ا(فەرزەد- ferzed): فریز، چیمەن.

**فرزدق**- ا.ع(فەرەزدەغ- ferezdex): گونکە هەویر، شونگە.

**فرزند**- ا(فەرزەند- ferzend): فەرزەن، مناڵ، کورو کچ.

**فرزندک**- ا(فەرزەندەک- ferzendek): فەرزەندۆکە، فەرزەنی بچووک.

**فرزوم**- ا.ع(فورزوم- furzûm): قاڵبی قۆندەرە درو، قوماشی نەدوراو کە لە خۆوەی وەپێچی.

**فرزە**- ا(فەرزە- ferze): فریز، چیمەن.

**فرزین**- ا(فەرزین- ferzîn: بەردێکی شەترەنجە.

**فرژ**- ا(فەرەژ- ferej): رەگی گیایەکی تاڵە، دەکوڵێنرێو بۆ مالیجەی نەخۆشی گەدە بەکار دێ.

**فرس**- ا(فورس- furs): فارس، زمانی فارسی.

**فرس**- ا.ع(فەرەس- feres): ماین، ئەسپ.

**فرسان**- ا.ع(فورسان- fursan): سواران، ئەسپ سواران.

**فرسایش**- ا.مص(فەرسایش- fersayiş): سووان، کۆن بوون.

**فرساییدن**- مص.م(فەرساییدەن- fersayîden): سووان، رزاندن.

**فرسپ**- ا(فەرسەپ- fersep): کاریتە، راژە.

**فرسپس**- ا.فر(فورسیپس- fursips): ئامێرێکی نەشتەرگەرییە لە کاتی زایینی نا سروشتیدا مناڵەکەی پێ دەردەهێنرێ.

**فرستادن**- مص.م(فیریستادەن- firistaden: ناردن، رەوان کردن، بەرێکردن، پاڵنان.

**فرستندە**- ا.فا(فیریستەندە- firistende): نێرەر، یەکێک شتێک یان کەسێک بۆ شوێنێ بنێرێ.

**فرستادە**- ا.مف(فیریستادە- firistade): رەوانەکراو، نێردراو، سەفیر، قاسید، پەیامبەر.

**فرستوک**- ا(فەرەستووک- ferestûk): پەرەسێلکە، پلیسری.

**فرستە**- ص.مف(فیریستە- firiste): سەفیر، نێردراو، پەیامبەر.

**فرسخ**- ا.ع(فەرسەخ- fersex): فەرسەخ، قۆناغ، لای عەرەب هەر فەرسەخێک بەرانبەر سێ میله، یان بەرانبەر ١٢ هەزار یاردەیە.

**فرسک**- ا.فر(فریسک- firisk): نەخشی سەر دیواری گەچ، نەخش‌و نیگاری دیواری .

**فرسنگ**- ا(فەرسەنگ- ferseng): فەرسەخ، پێوانەیەکە بەرانبەر بەنزیکەی شەش کیلۆمەتر.

**فرسنگسار**- ا.مر(فەرسەنگ سار- ferseng sar): نیشانەیەکە لە کەناری جادەوبان لەسەری هەر فەرسەخێک بە بەرد هەڵیدەچنن، یان ستوونێکی بەردی بۆ دروست دەکەن.

**فرسودگی**- ا.مص(فەرسوودەگی- fersûdegî): رزیوی، پواو، سواو.

**فرسودن**- مص.م(فەرسوودەن- fersûden): سووان، رزین، کۆن بوون، پووان.

**فرساینده**- ا.فا(فەرسایەندە- fersayende): سووێنەر، رزێنەر، کۆنکەر.

**فرسوده**- ا.مف(فەرسوودە- fersûde): کۆن و دارزاو، سواو و پوواو، دەغەزار و بێ توانا.

**فرش**- مص.م.ع(فەرش- ferş): راخستن، داخستن، راخستنی فەرش‌و رایەخ.

**فرش**- ا.ع(فەرش- ferş): رایەخ، فەرش، بەڕە، مافور، ئەوەی رابخرێ.

**فرشکردن**- مص.م(فەرش کەردەن- ferş kerden): راخستنی فەرش.

**فرش**- ا.ع(فوروش- furuş): رایەخ.

**فرشتو**- ا(فەرەشتوو- fereştû): پەڕەسێلکە، پلیسری.

**فرشته**- ا(فیریشتە- firişte): فریشتە، پەری، مەلایەکە، لە بواری پێشەنگیدا بەو کیژە پێشەنگانە دەگوترێ کە تەمەنیان ٧- ١١ ساڵە.

**فرشه**- ا(فورشە- furşe): ژەک، فرۆ.

**فرص**- ا.ع(فورەس- fures): دەرفەت، دەلیقە، دەرفەتی گونجاو.

**فرصاد**- ا.ع(فیرساد- firsad): توو، تووی سپی یان رەش، ناوکی ترێ، رەنگی سوور.

**فرصت**- ا.ع(فورسەت- furset): دەرفەت، دەلیقە، فرسەت.

**فرصت دادن**- مص.م(فورسەت دادەن- furset daden): فورسەت پێ دان، دەرفەت پێ دان.

**فرصت داشتن**- مص.ل(فورسەت داشتەن- furset daşten): دەرفەت هەبوون.

**فرصت یافتن**- مص.ل(فورسەت یافتەن- furset-yaften): دەرفەت پەیداکردن.

**فرض**- مص.م.ع(فەرز- ferz): سەپاندن، فەرزکردن، دیاریکردنی کارێک بۆ کەسێک، ئەوەی یەزدان لەسەر مرۆڤی واجب کردووە..

**فرض کردن**- مص(فەرزکەردەن- ferz kerden): گومان کردن، گریمانە کردن.

**فرضه**- ا.ع(فورزە- furze): کون، کەلێن، لەنگەرگە.

**فرضیه**- ا.ع(فەرزییە- ferziye): گریمانە.

**فرط**- مص.ل.ع(فەرت- fert): زێدەڕۆیی، زۆری، فراوانی.

**فرع**- ا.ع(فەرء- fer'): لق، چڵ، لک، تەرز.

**فرعون**- ا.ص(فیرئەون- fir'ewn): ستەمکار، زۆردار، نازناوی هەر یەکێک لە پاشایانی کۆنی میسر بووە.

**فرغار**- ص(فەرغار- ferxar): تەڕی تەڕ.

**فرغاریدن**- مص.م(فەرغاریدەن- ferxarîden): تەڕکردن، خوساندن، شێلانی هەویر.

**فرغان**- ا.ع(فەرغان- ferxan): قاپی گەورە، تەشت.

**فرغانج**- ا.ص(فەرغانەج- ferxanec): مانگا، یان ماکەری قەڵەو، هێستری قەڵەو.

**فرغر**- ا(فەرغەر- ferxer): وشکەچەم، جۆگەی ئاو، چاڵ.

**فرغردن**- مص.م(فەرغەردەن- ferxerde): خوساندن، تەڕکردن.

**فــرغــرده**- ا. مف (فــرغــەردە- ferxerde): خوساو، تەڕكراو، هەڵشێلراو.

**فرغن**- ا(فەرغەن- fer^xen): كارێز، جۆگەی ئاو كە تازە هەڵكەنرابێ، زەوییەک كە سێلاو دڕی بێ، ئاودڕ.

**فــرغند**- ا(فــەرغــەند- ferxend): لاولاو، ڕوەكی خۆ هەڵواس.

**فـرغند**- ص(فـەرغـەند- ferxend): بۆگـەن، پیس.

**فرغول**- ا(فەرغوول- ferxûl: تاخیر، درەنگ.

**فرغیش**- ا.ص(فەرغیش- ferxîş): جلی كۆن، داڕزاو، شڕ، كۆنە فەروەی چڵكن.

**فــرفتن**- مص.ل.م(فــیــریفــتــەن- firiften): هەڵخـەڵەتاندن، فریودان، گـومـڕاكردن، سـەر لێ شێوان، فریو خواردن.

**فرفخ**- ا.ع(فەرفەخ- ferfex): جۆرە گیایەكە.

**فرفر**- ا(فــیرفــیر- firfir): پەلەپەل، بە پەلە نووسین، بەپەلە خوێندنەوە.

**فــرفــروک**- ا(فــەرفــەرووک- ferferûk): فرفرۆكە.

**فرفره**- ا(فیرفیره- firfire): فرفرۆكە.

**فـرفـره**- ا(فـەرفـەرە- ferfere): پەلەكـاری، پەلەكاری لە قسەكردن، نووسین، خوێندنەوە، هەر كارێكی دی.

**فرفره**- مص.(فەرفەرە- ferfere): هاواركردن، بانگ كردن.

**فرفور**- ا(فەرفوور- ferfûr): سوێسكە.

**فـرفـور**- ا.ع(فـور فـوور- fur fûr): بەرخـۆڵە، كارژۆڵە، گوێرەكە، كوریژگە.

**فـرفـهن**- ا(فـەرفـەهەن- ferfehen): جـۆرە ڕووەكێكە.

**فرفیر**- ا(فەرفیر- ferfîr): جۆرە گیایەكە.

**فرفین**- ا(فەرفین- ferfîn): جۆرە گیایەكە.

**فـرفـیون**- ا(فـەرفـیـیـون- ferfîyûn): جـۆرە گیایەكە.

**فرق**- مص.م.ع(فەرغ- ferx): جیاكردنەوە.

**فرقدادن**- مص.م(فەرغ دادەن- ferxdaden): لێک جیا كردنەوە، هەڵاوێردن.

**فرق**- ا.ع(فەرغ- ferx): تەپڵی سەر، ناوەندی سـەر، ئەو خـەتەی كـە لە ناوەڕاسـتی سـەرەوە دەیخەنە بەینی قژەوە.

**فرق**- ا.ع(فیرەغ- firex): گـرووپان، دەسـتـان، تاقمان، تیپان.

**فرقان**- ص(فورغان- furxan): جیـاكەرەوەی هەق لە ناهەق، قورئان.

**فـرقت**- ا.مص.ع(فـورغـە- furxe): جـودایی، دابڕان.

**فـرقـد**- ا.ع(فـەرغـەد- ferxed): گـوێرەكـە، گوێرەكەی كێوی.

**فــرقــد**- ا.خ(فــەرغــەد- ferxed): جــووتە ئەستێرەیەكە، دووبرا.

**فــرقــدان**- ا.ع(فــەرغــەدان- ferxedan): ئەستێرەی دوو برا.

**فرقه**- ا.ع(فیرغە- firxe): دەسـتە، گـروپ، تاقم، تیپ.

**فركال**- ا(فەركال- ferkal): پرگال.

**فـركـانس**- ا.فـر(فـیــریكـانس- firikans): فریكانس، زەبزەبە، لەرە.

**فـركن**- ا(فـەركـەن- ferken): جـۆگـەی تازە، ئاودڕ، كارێز.

**فركند**- ا(فەركەند- ferkend): ئاودڕ، كـارێز، جۆگەی تازە.

**فـركندن**- مص.م(فـەركـەندەن- ferkenden): هەڵكەندن، هەڵكەندنی جۆگەی ئاو، كۆنەكردن.

**فــركنده**- ا.مف(فــەركــەندە- ferkende): هەڵكەندراو، كۆنەبوو، رزیو، ستۆكو سواو.

**فرگرد**- ا(فەرگەرد- fergerd): پاژێكی كتێب، فەسڵی كتێب.

**فـرم**- ا.(فـەرەم- ferem): خـەم، خـەفـەت، پەژارە، دڵتەنگی.

**فرم**- ا.فر(فۆرم- form): فۆرم، شێوە، قاڵب.

**فرمالیتە**- ا.فر(فورمالیتە- formalîte): رواڵەت سازی، فۆرمگەرایی، تەشریفات.

**فرمالیسم**- ا.فر(فۆرمالیسم- formalism): فۆرمو قاڵبێک کە هونەرمەند مەبەستی خۆی پێ دەربڕێ، شێوەگەرایی.

**فرمان**- ا(فەرمان- ferman): فەرمان، دەستوور، ئەمر، حوکم، ئیمزای پاشا.

**فرمان بردن**- مص.ل(فەرمان بوردەن- ferman burden): جێبەجێ کردنی فەرمان.

**فرمان دادن**- مص.م(فەرمان دادەن- ferman daden): ئەمرکردن، حوکم کردن.

**فرمانبر**- ص.فا(فەرمانبەر- fermanber): گوێڕایەڵ، کەسێک فەرمان بۆ یەکێکی دی ببات، کەسێک فەرمانی لە کەسێکی لە خۆی گەورەتر جێبەجێ بکات.

**فرمانبردار**- ص.فا(فەرمان بوردار- ferman burdar): گوێڕایەڵ، جێ بەجێکاری فەرمانان.

**فرمانبرداری**- ا.مص(فەرمان بورداری- ferman burdarî): گوێڕایەڵی.

**فرمان پذیر**- ص.فا(فەرمان پەزیر- ferman pezîr): گوێڕایەڵ، فەرمان پەزێر.

**فرمان پذیری**- ا.مص(فەرمان پەزیری- ferman pezîrî): گوێڕایەڵی، قبوڵی فرمان.

**فرماندار**- ا.ص(فەرماندار- fermandar): حوکمڕانی شار، حاکمی شار، بەڕێوەبەری شارەوانی کە سەر بە پارێزگارە.

**فرماندارنظامی**- ا.ص(فەرمانداری نیزامی- fermandari nizamî): حوکمڕانی سوپایی، حاکمی عەسکری کە لە کاتی پێویستدا لەلایەن سوپاوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شار دادەنرێ.

**فرماندە**- ص.فا(فەرمان دیە- fermandih): فەرماندە، ئەفسەرێک کە فەرمان بە تاقمە سەربازێک بدات.

**فرماندەکل قوا**- ا.مر(فەرماندیهی کولی غیڤا- fermandihi kuli xiva): فەرماندەی گشتی سوپا، سەرکردە.

**فرماندهی**- ا.مص(فەرمان دیهی- ferman dihî): فەرماندەیی، سەرکردایەتی.

**فرمانروا**- ص.مر(فەرمان رەڤا- ferman reva): فەرمانڕەوا، کەسێک کە فەرمانی بڕواو دەستوری جێبەجێ بکرێ.

**فرمانفرما**- ص (فەرمانفەرما- -fermanfer ma): فەرمانڕەوا، حاکم، حکومڕان.

**فرمان گذار**- ص.فا(فەرمان گوزار- ferman guzar): فەرماندە، سەرکردە، حوکمڕان، فەرماندە.

**فرمان گزار**- ص.فا(فەرمان گوزار- ferman guzar): فەرمان پەزیر، کەسێک فەرمان ئەنجامبدات، گوێڕایەڵ.

**فرمان نیوش**- ص.فا(فەرمان نییوش-ferman-nîyûş): فەرمان ژنەو، ئەوەی فەرمان بژنەوێ و ئەنجامی بدات.

**فرمان یافتن**- مص.ل(فەرمان یافتەن-ferman-yaften): فەرمان وەرگر، مردن.

**فرمایش**- ا.مص(فەرمایش- fermayîş): فەرماییش، فەرموودە، دەستوور، ئەمر.

**فرم بند**- ا.ص(فۆرم بەند- form bend): تەنزید، ئامادەکردنی فۆرمان لەلایەن کرێکاری چاپخانەوە.

**فرمش**- ا.ص(فەرموش- fermuş): فەرامۆش، لەهوبرچوون.

**فرمگین**- ص(فەرەم گین- ferem gîn): غەمگین، دڵتەنگ.

**فرمناک**- ص(فەرەمناک- feremnak): غەمناک.

**فرمودن**- مص.م(فەرمودەن- fermûden): ئەمرکردن، فەرمان دان، دەستووردان، فەرمووکردن، خوڵک کردن.

**فرمایش**- ا.مص(فەرمایش- fermayiş): ئەمر، حوکم، فەرمان، دەستوور، قسەی پیاوی گەورە.

**فرماینده**- ا.فا(فەرمایندە- fermayinde): فەرماندەر، ئەمرکار.

**فرموده**- ا.مف(فەرموودە- fermûde): فەرموودە، وتراو، ئەمرکراو.

**فرموش**- ا.ص(فەرمووش- fermûş): فەرامۆش، لەبیرکراو.

**فرموشیدن**- مص.م(فەرمووشیدەن- fermûşîden): فەرامۆش کردن، لەبیرکردن، لە یادبردن.

**فرموک**- ا(فەرمووک- fermûk): مزراح، گلۆڵە دەزوو یان بەنی لەسەر تەشی هەڵکراو.

**فرمول**- ا.فر(فورموول- furmûl): دەستوور، ڕێسا، سەرمەشق، نموونە، شێواز، ڕەمز.

**فرمولر**- ا.فر(فورموولیر- furmûlir): کۆی ئەو ڕێسایانەی بۆ دروستکردنی دەرمان بەکاردێ.

**فرن**- ا.ع(فورن- furn): فرنی.

**فرناد**- ا(فەرناد- fernad): بوار، بەشی تەنکاوی ڕووبار یان دەریا.

**فرناس**- ص(فەرناس- fernas): غافڵ، نەزان، خەواڵوو.

**فرناس**- ا.ص.ع(فیرناس- firnas): زۆر ئازا، شێر، گەورەو سەرۆکی جووتیاران.

**فرنج**- ا(فورونج- furunc): دەم و قەپۆز.

**فرنج**- ا(فەرەنج- ferenc): مۆتەکە، مێردزمە، پیرەهەڤۆک، شەوگ.

**فرنج**- ا(فیرینج- firinc): چاکەتی سوپایی.

**فرنجک**- ا(فەرەنجەک- ferencek): کابوس، مۆتەکە، مێردزمە، پیرەهەڤۆک، شەوگ.

**فرنجمشک**- ا(فەرەنج مووشک- ferenc muşk): جۆرە گیایەکی بۆن خۆشە لە نەعنا دەچێت.

**فرند**- ا.ع(فیریند- firind): شمشێری جەوهەردار، حەریر، جۆرە قوماشێکی ئاوریشمی شەپۆلدارە.

**فرنگ**- ا(فەرەنگ- fereng): فەرەنگ، ئەورووپا.

**فرنگی**- ص.ن(فەرەنگی- ferengî): ئەورووپی، فەرەنسی، ئەجنەبی.

**فرنود**- ا(فەرنوود- fernûd): بەڵگە، هەنجەت، بیانوو، بەهانە.

**فرنی**- ا(فیرنی- firnî): فرنی، جۆرە محەلەبییەکە.

**فرنی**- ا.ع(فورنی- furnî): کولیرە، زەلامی زلو نا هەموار.

**فرو**- پیش(فوروو- furû): پێشگرە، مانای نشێوو نزمو خوارەوە دەدات وەک: فروباریدن: داباریین.

**فرو**- ا.ع(فەرڤ- ferv): فەرو، جۆرە پەستەکێکە لە پێستی گیانلەبەرانی وەکو ڕێویو سمۆرە دروست دەکرێ.

**فروار**- ا(فەرڤار- fervar): باڵەخانەو ماڵی هاوینە.

**فروامدن**- مص.ل(فوروونامەدەن- furû ameden): داڕووخان، هاتنە خوارەوە، ئاوابوون، هەرەسهێنان.

**فرو اوردن**- مص.م(فوروو ئاڤەردەن- furû averden): هێنانە خوارەوە.

**فروباریدن**- مص.ل(فووروو باریدەن- furû barîden): داباریین، دارژان.

**فروبردن**- مص.م(فوروو بوردەن- furû burden): قووت دان، بردنە خوارەوە، هەڵ لووشین.

**فروبستن**- مص.م(فوروو بەستەن- furû besten): داخستن.

**دم فروبستن**-مص(دەم فوروو بەستەن- dem furû besten): دەم داخستن، دەم لێک نان.

**چشم فرو بستن**- مص(چەشم فوروو بەستەن- çeşm furû besten): چاو نووقاندن.

**فروپوشیدن**- مص.م(فورووپوشیدەن- furû pûşîden): داپۆشین، ڤەشێرتن، پەنهان کردن.

**فروتابیدن**- مص.ل(فورووتابیدەن- furû tabîden): هەڵاتنی ڕۆژ.

**فروتن**- ص.مر(فورووتەن- furû ten): بێ هەوا، خاکی، بێ فیزو دەعیە.

**فروث**- ا.ع(فورووس- furûs): گو، ڕیخ.

**فروج**- ا.ع(فورووج- furûc): قوزان، کونان، شەرمان.

**فروجستن**- مص.ل(فورووجەستەن- furûcesten): بازدان، بازدانە خوارەوە.

**فروچکیدن**- مص.ل(فورووچەکیدەن- furûçekîden): داچۆڕان، چۆڕانەوە، تکانەوە، چکانەوە.

**فروچیدن**- مص.م(فورووچیدەن- furû çîden): ڕیزکردن، تەرتیب کردن، سازدان.

**فروخ**- ا.ع(فورووخ- furûx): جوجەڵان، بێچووان.

**فروخت**- ا.مص(فورووخت- furûxt): فرۆخت، فرۆش.

**فروختار**- ص.فا(فورووختار- furûxtar): فرۆشیار.

**فروختن**- مص.م(فورووختەن- furûxten): فرۆشتن.

**فروشنده**- ا.فا(فورووشەندە- furûşende): فرۆشیار.

**فروخته**- ا.مف(فورووختە- furûxte): فرۆشراو.

**فروختن**- مص.م(فەرووختەن- ferûxten): هەڵکردن، هەڵایسان، بەرزکردنەوە.

**فروخواندن**- مص.م(فورووخاندەن- furû xanden): خوێندنەوە، خوێندنەوەی نووسراوێک.

**فروخوردن**- مص.م(فورووخوردەن- furû xûrden): خواردن، قووتدان، هەڵ لوشین.

**فرود**- ا.(فورود- furûd): ژێر، خوار.

**فرود امدن**- مص.ل(فورووود ئامەدەن- furûd ameden): دابەزین، هاتنە خوارەوە، نشێوو بوونەوە، نیشتنەوە.

**فروداوردن**- مص.م(فورووود ئاڤەردەن- furûd averden): هێنانە خوارەوە، دابەزاندن.

**فرود**- ا(فورووود- furûd): جەمسەری سالب، جەمسەری ساردی کارەبا.

**فرود**- ص.ع(فەروود- ferûd): تەنیا، تاقانە.

**فروداشت**- ا.مص(فورووداشت- furûdaşt): تەخسیرو درێغی، ئەنجامو کۆتایی کار.

**فرودست**- ص.مر(فورووودست- furûdest): ژێر دەست، کەساسو زەبوون.

**فرودگاه**- ا.مر(فورووودگاه- furûdgah): جێی دابەزین، فرۆکەخانە.

**فروردین**- ا(فەرڤەردین- ferverdîn): مانگی یەکەمی ساڵی هەتاوی.

**فرودین**- ص.ن(فوروودین- furûdîn): ژێرین، خوارین.

**فرور**-ا(فەرڤەر- ferver): نوری ئاهورامەزدایی.

**فرور**- ص.ع(فەروور- ferûr): فیرارکار، کەسێک زۆر ڕابکاو فیرار بکات.

**فروردگان**- ا.مر(فەرڤەردگان- ferverd gan): ناوی جەژنێکە ئێرانیانی کۆن لە پێنج ڕۆژی هەوەڵی ساڵ یان لە پێنج ڕۆژی کۆتایی ساڵ دەیانگێڕا.

**فروردیان**- ا.مر(فەرڤەردییان-ferverdîyan): هەمان مانای فەرڤەردگان-ی هەیە.

**فروردین**- ا.(فەرڤەردین- ferverdîn): مانگی یەکەمی ساڵی هەتاوی، مانگی یەکەمی بەهار.

**فروردنیگان**- ا.مر(فەرڤەردینگان- ferverdîngan): دە ڕۆژی کۆتایی ساڵ.

**فرورفتن**- مص.ل(فوروورەفتەن- furû ref-ten): رۆچوون،

**فروریختن**- مص.ل(فورو ریختەن- furû rîxten): دارژان، رژان، دارژان بەسەر کەسێکدا.

**فروز**- ا(فورووز- furûz): رۆشنایی.

**فروزان**- ص.فا(فورووزان- furûzan): رۆشنا، داگیرساو، تابان، درەخشان.

**فروزاندن**- مص.م(فورووزاندەن- furûzanden): روشن کردن، داگیرساندن، درەوشاندن.

**فروزانفر**- ص.مر(فورووزانفەر- furûzan fer): فەرِوشکۆی دیار.

**فروزش**- ا.مص(فورووزیش- furûziş): هەڵکردن، هەڵایسان، رۆشنایی.

**فروزشگر**- ص.فا(فورووزیشگەر- furûzişger): هەڵایسێنەر، داگیرسێنەر.

**فروزینه**- ا(فورووزینە- furûzîne): دەستەچیلە.

**فروس**- ا.ع(فورووس- furûs): ئەسپان.

**فروستردن**- مص.م(فورووسوتوردەن- furû suturden): سرِینەوە، پاک کردنەوە.

**فروسیت**- مص.ع(فورووسییەت- furû siyet): سواری کردن، مەعلان بوون لە سواری و ناسینی ئەسپدا، سوارچاکی.

**فروش**- ا(فورووش- furûş): فرۆش.

**فروشدن**- مص.ل(فورووشودەن- furûşuden): ئاوا بوون، دیار نەمان، غەرق بوون، خنکان، رۆچوون، نابوت بوون.

**فروشستن**- مص.م(فورووشوستەن- furû şusten): شوشتن، پاک کردنەوە، لابردن، مەحوکردنەوە.

**فروشک**- ا(فورووشەک- furûşek): گەنمە کوتراو، ساوەر، ساڤار، ساوار.

**فروشگاه**- ا.مر(فورووشگاه- furûşgah): فرۆشگا، فرۆشگە، بازار.

**فروشیدن**- مص.م(فورووشیدەن- furûşîden): فرۆتن، فرۆشتن.

**فروع**- ا.ع(فورووء- furû’): لق و پۆپان.

**فروغ**- ا(فورووغ- furûx): پرتەو، رۆشنایی، تیشک، پرشنگ.

**فروغمند**- ص(فورووغمەند- furûxmend): بەتیشک، نورانی.

**فروغمندی**- ا.مص(فورووغمەندی- furûx mendî): نورانی، تیشکدار، پرشنگدار.

**فروفرستادن**- مص.م(فورووفیریستادەن- furû firistaden): ناردنە خوارەوە، دابەزاندن.

**فروق**- مص.ع(فورووغ- furûx): ئاشکرابوونی ریگە، روون بوونەوەی کارێک، خۆیابوون.

**فروق**-ص.ع(فەرووغ-ferûx): پیاوی ترسنۆک.

**فروق**- ا.ع(فورووغ- furûx): تیپ، دەستە.

**فروقه**- ص.ع(فەرووغە- ferûxe): زۆر ترسنۆک.

**فروکردن**- مص.م(فورووکەردەن-furû kerden): تێ کردن، تێ بردن.

**فروکش**- ص.فا(فورووکەش- furûkeş): دابەزین و مانەوە لە شوێنێک، وەستان.

**فروکش کردن**- مص.ل(فورووکەش کەردەن- furûkeş kerden): وەستان و مانەوە لە شوێنێک، جڵەو راکێشان و وەستان.

**فروکشتن**- مص.م(فورووکوشتەن- furûkuşten): کوژانەوەی ئاگر یان چرا، کوژاندنەوە.

**فروکشیدن**- مص.م(فورووکەشیدەن- furûkeşîden): راکێشانی جڵەوی ولاخ و دابەزین.

**فروکشنده**- ص.فا(فورووکەشەندە- furû keşende): شەرکەر.

**فروکوفتن**- مص.م(فورووکوفتەن- furû kuften): بەزەویدا دان، داکوتین، تەپڵو دۆڵ کوتان.

**فروگذار**- ا.مص(فورووگوزار- furû guzar): پشت گوێ خستن، تەخسیرکردن، دریغی کردن، سستیو بێ پەروایی.

**فروگذارکردن**- مص.ل(فورووگوزارکەردەن- furû guzar kerden): دریغی کردن، پشت گوێ خستن، تەخسیرکردن.

**فروگذاشتن**- مص.م(فورووگوزاشتەن- furû guzaşten): لەدەست دان، چاوپۆشی کردن، ئازادکردن، ئیهمال کردن، دریغی کردن.

**فروگرفتن**- مص.م(فورووگیریفتەن- furû giriften): دەستگیرکردن، گرتن، داگیرکردن، دابەزاندن، هێنانە خوارەوە، گەمارۆدان.

**فرومالیدن**- مص.م(فوروومالیدەن- furû malîden): تەمێ کردن، ئاگادارکردن، گوشین، پێکەوە پێچاندن.

**فروماندن**- مص.ل(فوروومانەدەن- furû manden): چاوەڕوانکردن، ماندووبوون، هەژاربوون، بێنەوابوون، نائومێدبوون، ڕەنجان، دڵشکان.

**فرومایه**- ص.مر(فوروومایە- furûmaye): ناکەس بەچە، هەتیوچە، خوێڕی، بێ هونەر، زەلیلو زەبوون، سپڵە، بەرەڵڵا، پیسکە، بەغیل.

**فرومایگی**- ا.مص(فوروومایەگی- furû mayegî): بەرەڵڵایی، هەتیوچەیی، ناکەس بەچەیی، سپڵەیی.

**فرومردن**- مص.ل(فوروومووردەن- furû murden): کوژانەوەی ئاگر یان چرا.

**فرومولیدن**- مص.ل(فوروومولیدەن- furû mûlîden): ماتەڵبوون، دواکەوتن، خزینە خوارەوە.

**فرونت**- ا.فر(فوروونت- furûnt): پێشەوە، نێوچەوان، بەرەی جەنگ.

**فروند**- ا(فەرڤەند- fervend): مەیدان، قەڵا، حەسار.

**فروند**- ا(فەرڤەند- fervend): پشتکۆڵ، سوکانی کەشتی، یەک دانە، وەک: یەک دانە فرۆکە، دوو دانە فرۆکە.

**فرونشاندن**- مص.م(فوروونیشاندەن- furû nişanden): کوژاندنەوە، ئارام کردنەوە، دانیشاندن، دامرکاندنەوە.

**فرونشستن**- مص.ل(فوروونیشیستەن- furû nişisten): بن نانەوە، کوژانەوە، دامرکانەوە.

**فرونگرستن**- مص.ل(فوروونیگیریستەن- furû nigiristen): ڕوانینە خوار.

**فرونگر**- ص.فا(فوروونیگەر- furû niger): کەسێک بڕوانێتە خوارێ، بێ باشارو بێ هیمەت.

**فرونهادن**- مص.م(فوروونەهادەن- furû nehaden): هێنانە خوارەوە، لە خوارەوە دانان، کەنارخستن.

**فروهر**- ا (فەرڤەهەر- ferveher): گەردیلەیەکی نوری ئاهورامەزدایە.

**فروهشتن**- مص.م(فوروهیشتەن- furû hişten): لەسەر زەوی دانان، هەڵواسین، کەوتنە خوار، سست بوون.

**فروهشته**- ص.مف(فوروهیشتە- furû hişte): هەڵواسراو، لە خوارەوە دانراو، شۆڕەوە بوو.

**فروهلیدن**- مص.م(فوروهیلیدەن- furû hiliden): ڕەها کردن، تەرک کردن، لەزەوی دانان.

**فروهیختن**- مص.م(فوروهیختەن- furû hîxten): داکشاو، بۆ خوارەوە ڕاکێشان، داکێشان.

**فروهیده**- ص(فەرووهیدە- ferû hîde): ئاقڵ، بە ئاوەز، زانا، خودان فەرو شکۆ.

**فرویدیسم**- ا.فر(فرۆیدیسم- furoydism): فرۆیدیزم، ڕێساکانی باوەڕێن زیگموند فرۆیدی دەروونناسی نەمساوییە.

**فــرویز**- ا(فــەرڤــیــز- fervîz): پەراوێز، ئەو پەراوێزەی بۆ سەڵتەو عەباو ئەو شتانەی دەکەن، کەنارەی جلکو پەراوێزی کتێب.

**فــرویش**- ا.(فــەرڤــیش- fervîş): درەنگ، خەمساردیو بێ موبالاتی لە کارێکدا، غافڵو پشتگوێ خەر، کەمتەرخەمی.

**فره**- ص(فیریه- firih): زۆر، گەلەک، مشە، فرە، زیاد.

**فره**- ا(فەرە- ferre): شانو شەوکەت، هێزو توانا.

**فـره**- مص.ع(فـەرەه- fereh): هاتنە جـۆش، لەنجەولارکـردن، لووتبـەرزی، نازو فـیـزکـردن، فڕناخی.

**فــره**- ص.ع(فــەریه- ferih): بەلارولەنجــە، بەنازو فیز، فڕنلخ.

**فرهانج**- ا(فەرهانەج- ferhanec): شـەوگ، مۆتەکە، لمۆز، لمبۆز.

**فــرهخت**- ا.مص(فــەرهەخت- ferhext): پەروەردەو تەربیەتدان.

**فرهختن**- مص.م(فەرهەختەن- ferhexten): تەربیەت دان، پەروەردەکردن.

**فرهختــه**- ص.مف(فەرهەختــە- ferhexte): تەربێتدراو، پەروەردەکراو.

**فرهد**- ا.ع(فەرهەد- ferhed): منداڵی قەڵەوو جوان.

**فــرهست**- ص(فــەرهەست- ferhest): زۆر، مشە، فرە، گەلەک، سیحرو جادوو.

**فـرهمند**- ص(فـەرەهمـەند- fereh mend): بەشکۆ، بەشانو شەوکەت، زاناو هوشیار.

**فرەمند**- ص.مـر(فـەرەمـەند- ferremend): شکۆمەند، یەزدانی مەزن.

**فــرهنج**- ا(فــەرهەنج- ferhenc): تەربێتو پەروەردەو زانست، کۆی کەلەپووری رۆشنبیریو زانســتیو زانیــاریو هونەرێن یەک مــیللەت (کەلەپووری شارستانی). قاموس.

**فــرهنجــه**- ص(فــەرهەنجــە- ferhence): بە ئەدەب، ئاکارچاک.

**فــرهنجــیــدن**- مص.م(فــەرهەنجــیــدەن- ferhencîden): تەربێتدان، پەروەردەکردن.

**فــرهنجنده**- ا.فــا(فــەرهەنجــەندە- ferhen- cende): تەربێتدەر، پەروەردەکەر، ئێوەتکەر.

**فــرهنجــیــده**- ص.مف(فــەرهەنجــیــدە- ferhencîde): تەربێت دراو، پەروەردەکراو.

**فــــرهنــگ**- ا(فـــــەرهەنـگ - ferheng): کــەلەپووری زانســتیو رۆشنبــیــریو ئەدەبی میللەتێک، قاموسی زمان.

**فــرهنگســتــان**- ا.مـر(فـەرهەنگیــســتــان- ferhengistan): ئەکادیمیا، ئەنجوومەنی باڵای هزرڤانانو نووسەرانی گەورە.

**فــرهنگ نویس**- ص.فــا(فــەرهەنگ نیــڤیس- ferheng nivîs): قــــامــــووس نووس، فەرهەنگساز.

**فــرهود**- ا.ع(فــورهوود- furhûd): بەرخــۆلە، بێچووی بزنە کێوی.

**فــرەوش**- ا(فــەرەڤــەش- fereveş): نوری ئاهورامەزدا...

**فرهومند**- ص(فەرهومـەند- ferhû mend): نزیک.

**فــرهی**- ا.مص(فــەرەهی- ferrehî): شــانو شەوکەوت، فەرو شکۆ.

**فرهیختن**- مص.م(فەرهیختەن- ferhîxten): پەروەردەکردن، تەربێت دان، فێرکردن.

**فری**- (فەری- ferî): ئافەرین، دەست خۆش.

**فــری**- ص.ع(فــەری- ferî): عــەجیب، مــایەی سەرسامی.

**فــریاد**- ا(فــەریاد- feryad): بانگو هاوار، هاوارو کۆمەک خوازی.

**فــریاد براوردن**- مص.ل(فــەریاد بەر ئاڤــەردەن- feryad ber averden): هــاوارکــــــردن، هاوارهێنان.

**فریادخواستن**- مص.م(فەریاد خاستەن- feryad-xasten): کۆمەک خواستن، پەنا بۆ هێنان.

**فریاد رسیدن**- مص.م(فەریاد رەسیدەن- feryad resîden): بە فریا کەوتنی کەسێک، فریا کەوتن، یارمەتی دان.

**فریادرس**- ص.فا(فەریاد رەس- feryad res): فریارەس، کەسێک بە دادی کەسێکدا بگات.

**فریادرسی**- ا.مص(فەریاد رەسی- feryad resî): یارمەتی و دەستگیری.

**فریب**- ا(فەریب- ferîb): خەڵەتان، فریوو، خاپاندن.

**فریب خوردن**- مص.ل(فەریب خوردەن- ferîb xûrden): فریو خواردن، خەڵەتان.

**فریب دادن**- مص.م(فەریب دادەن- ferîb da-den): فریو دان، تەفرەدان، خاپاندن، خەڵەتاندن.

**فریبا**- ص(فەریبا- ferîba): دڵڕفێن، جوان.

**فریبانیدن**- مص.م(فەریبانیدەن- firibanîden): فریواندن، تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن.

**فریب خوردن**- مص.ل(فەریب خوردەن- ferîb xûrden): فریو خواردن، خەڵەتان.

**فریب خورده**- ص.مف(فەریب خوردە- ferîb xûrde): فریو خواردوو، خەڵەتاو.

**فریب دادن**- مص.م(فەریب دادەن- ferîb daden): فریودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن، خاپاندن.

**فریب دهنده**- ص.فا(فەریب دەهەندە- ferîb dehende): فریودەر، خاپینۆک.

**فریبرز**- ا.ص(فەریبورز- ferîburz): باڵابەرز، بەژنو باڵا جوان، ناوە بۆ پیاوان.

**فریب ساز**- ص.فا(فەریب ساز- ferîb saz): حیلەکار، گزیکەر، فریودەر.

**فریبش**- ا.مص(فەریبیش- ferîbiş): فریودان، خەڵەتاندن، خاپاندن.

**فریبکار**- ص.فا(فەریبکار- ferîbkar): فریوکار، حیلەباز، خاپینۆک.

**فریبکاری**- ا.مص(فەریبکاری- ferîbkarî): فریوکاری، حیلەبازی، فێڵبازی.

**فریب ناک**- ص(فەریبناک- ferîb nak): فریودەر، خاپینۆک.

**فریبیدن**- مص.م(فەریبیدەن- ferîbîden): فریودان، دەست برین، خەڵەتاندن.

**فریج**- ا(فیریج- firîc): فریز، چەمەن، چیمەن.

**فرید**- ص.ع(فەرید- ferîd): بێ وێنە، گەوهەری یەک دانەو گرانبەها، تاک.

**فریده**- ص.ع(فەریدە- ferîde): دەگمەن، تاک، بێ وێنە، گەوهەری یەک دانە.

**فریرون**- ص(فەریروون- ferîrûn): زۆر چاک، نایاب، راست، داوێن پاکو دروستکار، راستگۆ، چاکەکار.

**فریز**- ا (فیریز- firîz): فریز، چیمەن، چەمەن.

**فریس**- ص.ع(فەریس- ferîs): کوژراو، کوشتە، نێچیر.

**فریس**- ا.ع(فەریس- ferîs): چەمەرە، چەمەرەیەکی دارینە بەسەری گوریسەوەی دەبەستن بۆ بەستنی بار، ئاڵقە، گەو، کەمە.

**فریسه**- ص.ع(فەریسە- ferîse): نێچیر، کوشتە.

**فریش**- (فەریش- ferîş): ئافەرین، دەست خۆش.

**فریش**- ص(فەریش- ferîş): پەریشان، پەراگەندە، هێرشو پەلامارو تاڵانو برۆ.

**فریش**- ا(فیریش- firîş): پێخەف، نوێن، رایەخ.

**فریش**- ا.ع(فەریش- ferîş): فریز، چەمەن، چیمەن.

**فریش**- ا.ع(فەریش- ferîş): ماینی تازەزاو.

**فریشته**- ا(فیریشتە- firîşte): فریشتە، پەری.

**فریضه**- ا.ع(فەریزە- ferîze): فەرز، واجب.

**فریفتار**- ص.فا (فەریفتار- ferîftar): فریوباز، حیلەباز.

**فریفتگار**- ص.فا (فەریفتگار- ferîftgar): فریوباز، حیلەباز.

**فریفتگاری**- ا.مص (فەریفتگاری- ferîftgarî): فریوبازی، حیلەبازی.

**فریفتن**- مص.م (فەریفتەن- ferîften): فریودان، خەڵەتاندن، دەست برین.

**فریبندە**- ا.فا (فەریبەندە- ferîbende): دڵبەر، فریودەر، فریوباز، خاپینۆک، تەفرەدەر.

**فریفتە**- ص.مف (فەریفتە- ferîte): فریوخواردوو، شەیدابوو.

**فریق**- ا.ع (فەریغ- ferîx): گروپ، دەستە، تیپ، جماعەت.

**فریقە**- ا.ع (فەریغە- ferîxe): کۆمەڵە مەڕێکی ئاوەکی، مەڕێن دابڕاو لە مێگەڵ.

**فریقین**- ا.ع (فەریغەین- ferîxeyin): دوو گروپی شیعەو سوننە.

**فریواندن**- مص.م (فەریڤاندەن- ferîvanden): فریواندن، خەڵەتاندن.

**فریە**- ا.ع (فیریە- firye): درۆو بوختان.

**فریە**- ا (فەریە- ferye): نەفرەت، لەعنەت.

**فزار**- ا (فەزار- fezar): ئەوزار.

**فزایش**- ا.مص (فەزاییش- fezayîş): زیاد بوون.

**فزاییدن**- مص.ل (فەزاییدەن- fezayîden): زیادبوون، زۆربوون.

**فزع**- ا.ع (فەزەء- feze’): تۆقین، زنۆقچوون، هەترەشچوون. ترس، هاوار، ناڵەناڵ.

**فزودن**- مص.م (فوزودەن- fuzûden): زیادبوون، زۆر بوون.

**فزون**- ص (فوزون- fuzûn): زۆر، مشە، فرە، گەلەک.

**فژ**- ا (فەژ- fej): چڵکو کێم، کێمو زوخ، زووخاو.

**فژ**- ا (فوژ- fûj): یاڵی ئەسپ.

**فژاک**- ص (فەژاک- fejak): چڵکن، پیس، گەمار.

**فژاگن**- ص.مر (فەژاگین- fejagîn): چڵکن، پیس.

**فژگن**- ص (فەژگین- fejgin): چڵکن، پیس، گەمار، کێمو زوخ.

**فژە**- ص (فەژە- feje): گەمار، چڵکن، پیس.

**فساحت**- مص.ع (فەساهەت- fesahet): بەرین بوون، بەرینی، پانی.

**فساد**- مص.ل.ع (فەساد- fesad): گەندەڵ بوون، لەناو چوون، خراپ بوون، رزین، رابواردن، فیتنەو ئاژاوە.

**فسار**- ا (فەسار- fesar): هەوسار.

**فساط**- ا.ع (فوسسات- fussat): خێوەت، سەراپەردە.

**فسافس**- ا.ع (فوسافیس- fusafis): پێشکە، مێشوولە، پەخشە.

**فساق**- ا.فا (فوسساغ- fussax): فاسقان، گوناحکاران، زیناکاران.

**فسالە**- ا.ع (فوسالە- fusale): وردە ئاسن، ئەو وردەیەی لە کاتی برینەوە یان سوینەوە لە ئاسن دەوەرێ.

**فسان**- ا (فەسان- fesan): هەستان، هەسان، سان، بەردەسان.

**فسانە**- ا (فەسانە- fesane): ئەفسانە، حیکایەت، چیرۆکی خەیاڵی.

**فسانیدن**- مص.م (فەسانیدەن- fesanîden): لە هەسان دان، سووین.

**فساییدن**- مص.م (فەساییدەن- fesayîden): ئەفسوون کردن، جادووکردن.

**فساینده**- ا.فا (فەسایندە- fesayînde): ئەفسونگەر، ئەفسون خوێن، رامکەر.

**فستق**- ا.ع (فوستوغ- fustux): فستق، پستە.

**فستيوال**- ا.فر(فيستيڤال- fistîval): فيستيڤاڵ، ميهرەجان.

**فسحت**- ا.مص.ع(فوسهەت- fushet): مەيدان، بەرين، بەرينى، راستانى.

**فسخ**- مص.م.ع(فەسخ- fesx): هەڵوەشاندنەوە، شكاندن، سڕينەوە، وێرانكردن.

**فسرانيدن**- مص.م(فوسورانيدن- fusuranîden): ژاكاندن، جەمەداندن، بەستن.

**فسردن**- مص.ل(فوسوردەن- fusurden): ژاكان، سەهۆڵ بەستن، سيس بوون.

**فسرده**- ص.مف(فەسوردە- fesurde): ژاكاو، سيس بوو، پژمردە.

**فسطاط**- ا.ع(فوستات- fustat): خێوەت، سەراپەردە.

**فسفات**- ا.فر(فوسفات- fusfat): فۆسفات، ئەسيدى فسفۆر.

**فسفر**- ا.فر(فوسفور- fusfur): فسفۆر.

**فسق**- مص.ل(فيسغ- fisx): دەرچوون لە فەرمانى خوا، لادان لە رێى هەق، كردنى كارى ناشيرينو ناڕەوا، زيناكردن.

**فسقه**- ص.ا(فەسەغە- fesexe): فاسقان، بەدكاران، گوناحكاران، زيناكاران.

**فسكل**- ا.ص(فيسكيل- fiskil): قرە، ئەسپێک لە مەيداندا لە دواى هەموو ئەسپانەوە رابكات، پياوى خوێريلە، سپڵە، پاشكەوتوو.

**فسن**- ا(فەسەن- fesen): بەردەسان.

**فسنجان**- ا(فيسينجان- fisincan): شلەيەكە بەگۆشتى مريشک يان مەڕو كاكڵە گوێزو روبەنار لێدەنرێ.

**فسوس**- ا(فوسووس- fusûs): ئەفسوس، مەخابن، داخ، ريشخەن، تەوس و توانج.

**فسوق**- مص.ل.ع(فووسوغ- fusûx): لە هەق لادان، ياخى بوون لە فەرمانى خوا، گوناح كردن.

**فسون**- ا(فوسوون- fusûn): حيلە، فێڵ، نێرەنگ، ورتەورتێ كە جادوگەران لە كاتى جادوكردندا دەيكەن.

**فسونگر**- ص.فا(فوسوونگەر- fusûnger): جادووگەر، سيحرباز، ئەفسوونكار.

**فسونگرى**-ا.مص(فوسوونگەرى- fusûngerî): جادووگەرى، سيحربازى.

**فسيح**- ص.ع(فەسيح- fesîh): بەرين، شوێنى پانو بەرين.

**فسيل**- ا.ع(فەسيل- fesîl): گەلە، مێگەل، رەوە ئەسپ.

**فسيل**- ا.فر(فوسيل- fusîl): ئێسكە پەيكەر.

**فسيله**- ا(فەسيلە- fesîle): گەلە، رەوە، مێگەل.

**فسيل**- ا.ع(فەسيل- fesîle): خەڵف، خەڵفەخورما.

**فش**- (فەش- feş): پاشگرە، ماناى (وەک) دەگەيەنێ: وەک ئەژديهافش: ئەژديها ئاسا.

**فش**- ا(فوش- fuş): قژ، كاكۆڵ، ياڵى ئەسپ.

**فش**- ا.ع(فەشش- feşş): پياوى گەوج، جلى زبر، پەلاس، دوو زمانى.

**فشار**- ا(فيشار- fişar): گوشار.

**فشارخون**- ا.مر.(فيشارى خوون- fişari xûn): گوشارى خوێن.

**فشار خون سنج**- ا.مر(فيشارى خوون سەنج- fişarî xûn senc): ئامێرى ئەندازەگيرى خوێن.

**فشاردن**- مص.م(فيشاردەن- fişarden): گوشين.

**فشارسنج**- ا.مر(فيشار سەنج- fişar senc): گوشارپێو.

**فشارنگار**- ا.مر(فيشارنيگار- fişar nigar): بارۆگراف، ئامێرێكە بۆ وێنەگرتنى گوشارى هەوا.

**فشاغ**- ا.ع(فوشاغ- fuşax ): جۆرە گيايەكە.

**فشافش**- (فەشافيش- feşafiş): دەنگى دەرچوونى پەيتاپەيتاى تير لە كەمان، فيشكە فيشک.

**فشاندن**- مص.م(فەشاندەن- feşanden): رشتن، پەراگەندەکردن، بلاوکردنەوە.

**فشردن**- مص.م(فەشەردەن- feşerden): گوشین.

**فشست**- ا(فیششەست- fişşest): فیشکەی مار، هاشاندنی مار.

**فش فش**-ا (فیش فیش- fiş fiş): فیشکەی مار، هاشاندنی مار، دەنگی فیشەکە شێتە، فیچقەی ئاو.

**فشفشه**- ا(فیش فیشە- fiş fişe): فیشەکە شیتە.

**فشل**- مص.ل.ع(فەشەل- feşel): سست بوون، ترسان.

**فشل**- ص.ع(فەشل- feşl): پیاوی ترسنۆکو بێ زاخ، تەمەڵو خاو.

**فشل**- ا.ع(فیشل- fişl): پەردەی کەژاوە.

**فشنگ**- ا(فیشەنگ- fişeng): فیشەک.

**فص**- ا.ع(فوسس- fuss): نقێمی موستیلە، بیلبیلەی چاو، جمگە، ئەسڵو هەقیقەت.

**فصاح**- ص.ع(فیساه- fisah): زمان سوار، تەڕزمان، قسە خۆش، زمان رەوان.

**فصاحت**- مص.ل.ع(فەساهەت- fesahet): زمان سواری، زمان رەوانی.

**فصاد**- مص.ع(فەسساد- fessad): حەجامات کێش، خوێن بەردەر.

**فصاص**- ا.ع(فیساس- fisas): نقێمان، نگینان، قاشان.

**فصاص**- ا.ص.ع(فەسساس- fessas): نقێمساز، نگین فرۆش، کەسێک نقێم لەسەر موستیلە دابنێ.

**فصال**- ا.مص.ع(فیسال- fisal): لەشیر برینەوەی منداڵ.

**فصح**- ا.ع(فیسه- fish): لای جولەکەکان دەکاتە جەژنی یادەوەری دەرچوونی جولەکە لە میسر، لای مەسیحیان دەکاتە رۆژی یادی سەرکەوتنی حەرزەتی عیسا، جەژنی پاک.

**فصحاء**- ص.ع(فوسەهاء- fuseha’): تیژزمانان، سوار زمانان، رەوان زمانان، تەڕ زمانو قسەزان.

**فصد**- مص.م.ع(فەسد- fesd): خوێن بەردان، حەجامات کێشان.

**فصل**- مص.م.ع(فەسل- fesl): جیاکردنەوە، جیاکردنەوەی هەقو ناهەق، سوڵح کردن.

**فصل**- ا.ع(فەسڵ- fesl): وەرز، لەمپەری نێوان دوو شت، بەشێک لە کتێبێک.

**فصوص**- ا.ع(فوسوس- fusûs): نقێمان، نگینان.

**فصول**- ا.ع(فوسول- fusûl): فەسڵان، وەرزان.

**فصیح**- ص.ع(فەسیه- fesîh): بە زمان، سوار زمان، زمان رەوان، قسەزان.

**فصید**- ص.ع(فەسید fesîd): دەماری خوێن لێگراو.

**فصیده**- ا.ع(فەسیدە- fesîde): خورمای شێلراوی بە خوێن ئاوێتە.

**فصیل**- ا.ع(فەسیل- fesîl): جیاکردنەوەی بێچووە وشتر یان گوێرەکە لە دایکی، دیواری نزمی ناو حەسار.

**فضاء**- ا.ع(فەزاء- feza’): مەیدان، زەوی پانو بەرین، هاماج.

**فضائح**- ا.ع(فەزائیه- fezaih): عەیبو عاران، ریسواییان، بەدناوی.

**فضائل**- ا.ع(فەزائیل- feza’il): بالایی لە زانستو زانیاریدا.

**فضاح**- ا.مص.ع(فیزاه- fizah): ریسوایی، بەدناوی، ناوزڕاوی، روسیایی.

**فضاح**- ص.ع(فەززاه- fezzah): ئابڕوبەر، حەیابەر.

**فضاحت**- ا.مص(فەزاهەت- fezahet): ریسوایی، رووسیایی، ناوزڕاوی، بەدناوی.

**فضاض**- ا.ع(فوزاز- fuzaz): وردەی شکانی شتێک.

**فضال**- مص.ع(فیزال- fizal): فەخرکردن بەسەر یەکدا لە رووی زانستەوە.

**فضال**- ص.ع(فەززال- fezzal): کەسێک خودان زانستی زۆربێ.

**فضاله**- ا.ع(فوزاله- fuzale): پاشماوە، پاشەڕۆک.

**فضانورد**- ص.فا(فەزانەڤەرد-fezaneverd): ئاسمانەوان، ئەوەی بە کەشتی ئاسمانی سەفەر بکاتو لە سنووری کێشی زەوی دەربچێ.

**فضل**- ا.مص.ع(فەزل- fezl): چاکی، بالآیی، کەماڵ.

**فضلاء**- ص.ع(فوزەلاء- fuzela'): فازیلان، زانایان، ناودارانی مەیدانی زانستان.

**فضلات**- ا.ع(فەزەلات- fezelat): پاشماوەو زڕو زبڵو پیسی.

**فضل پرور**- ص.فا(فەزل پەرڤەر- fezl perver): زانست پەروەر، کەسێک کە دەخزمەتی ئەهلی فەزڵدابێ.

**فضل فروش**- ص.فا(فەزل فورووش- fezl furûş): کەسێک خۆی بە زانستو فەزڵەوە بنوێنێ، زانست فرۆشی.

**فضلومند**- ص.مر(فەزلوومەند- fezlûmend): خودان زانستو فەزیلەت، دەوڵەمەند لە زانستدا.

**فضله**- ا.ع(فەزەله- fezele): پاشماوەو پیسی.

**فضوح**- ا.مص.ع(فوزووه- fuzûh): ریسوایی، روسیایی، بەدناوی، ناوزڕاوی.

**فضول**- ا.ع(فوزوول- fuzûl): فەزڵ.

**فضول**- ا.ع(فوزوول- fuzûl): پاشماوەی ماڵی زیادە لە پێویستی، ئەوەی بەشێوەی سروشتی لە بەدەن دێتە دەرەوە.

**فضولی**- ص.ع(فوزولی- fuzûlî): خۆهەڵقورتان لە کاری خەڵکی، ئەوەی کاری نابەجێو بێفایدە بکات، فزول، فزولی، هەرزەوێژ.

**فضه**- ا.ع(فیززه- fizze): زیوو،

**فصیح**- ص.ع(فەزیه- fezîh): رسوا، رووسیا، ئابڕوتکاو، ئابڕونەماو، ناوزڕاو.

**فضیحت**- ص.ع- ا.ع(فەزیهەت- fezihet): عەیب، ریسوایی، بەدناوی.

**فضیل**- ص.ع(فەزیل- fezîl): زانا، خودان فەزڵ و ماریفەت.

**فضیلت**- ا.ع(فەزیلەت- fezilet): زانیاری، زانست.

**فضیلت گستر**- ص.فا(فەزیلەت گوستەر- fezilet guster): برەودەری زانستو ماریفەت، هزرڤان، زانا.

**فطام**- ا.ع(فیتام- fitam): منداڵ بڕینەوە لەشیر.

**فطانت**- مص.م.ع(فەتانەت- fetanet): دەرک کردن، تێ گەییشتن، زیرەک بوون، زیرەکیو بالآدەستی لە کارێکدا.

**فطر**- مص.ل.ع(فیتر- fitr): رۆژوشکان، فتارکردنەوە، جەژنی رەمەزان.

**فطر**- ا.ع(فوتر- futr): قارچک، کارگ.

**فطرت**- ا.ع(فیترەت- fitret): سروشت، تەبیعەت.

**فطره**- ا.ع(فیتره- fitre): سەر فیترە، زەکاتێکە لە رۆژی جەژنی رەمەزاندا دەدرێ.

**فطن**- ص.ع(فەتین- fetin): هوشیار، زیرەک، لێزان.

**فطنت**- ا.مص.ع(فیتنەت- fitnet): زیرەکی، هوشیاری، دانایی، زانایی.

**فطور**- مص.ل(فوتوور- futûr): رۆژو شکاندن، فتارکردنەوە.

**فطور**- ا.ع(فەتور- fetûr): خواردنی فتار.

**فطیر**- ا.ص.ع(فەتیر- fetîr): شتێ زوو دەرک بکرێ، شتێ زوو بەدەست بێ، نانی هەڵنەهاتە، جەژنی پاک (تایبەتە بە جولەکە لەو رۆژەدا نانی فەتیر دەبرژێنن).

**فظاظت**- مص.ل.ع(فەزازەت- fezazet): بەدزمان بوون، توندە تەبیعەت بوون، بەدزمانی، درشت رەفتاری.

**فظيع**- ص.ع(فـــەزیٔ- fezî’): کـــاری زۆر ناشیرین، کاری لە رادەبەدەر ناشیرینو خراو.

**فظيع**- ا.ع(فــــەزیٔ- fezî’): ئاوی زولاڵو سازگار.

**فعال**- ا.ع(فیئال- fial): کرداران، کردەوان.

**فعال**- ا.ع(فەئال- feal): کاری چاک، کەرەم، دەستکراوە، دڵاوا، جوامێریو سەخاوەت.

**فعال**- ص.ع(فەئئال- fe’al): کارا، پڕکار.

**فـعـاليت**- ا.مص(فـەئالـیـیـەت- fe’alîyet): چالاکی، چەڵەنگی، کۆششو کاری زۆر.

**فعل**- ا.ع(فیئل- fi’l): کار، کردار.

**فعله**- ا.ع(فەئەلە- fe’ele): عەمەلە، کرێکار، پالە.

**فغ**- ا(فوغ- fux): بت، ماشوقە، دلبەر.

**فغاک**- ص(فەغاک- fexak): نەزان، گەوج، زۆڵ، بیژ، حەرامزادە.

**فغستان**- ا.مر(فەغیستان- fexistan): بتخانە، حەرمسەراو کەنیزەکانی جوان.

**فغفور**- ا.مر(فەغفوور- fexfûr): خوا، بت، کوڕی خوا؛ کە لە کۆنا لەقەبی پاشایانی چین بوو.

**فغند**- ا(فەغەند- fexend): رەقس، سەما.

**فغواره**- ص(فەغڤارە- fexvare): بت ئاسا، کەسێک لە زۆر خەمباریدا یان لە لوتبەرزیا قسە نەکات.

**فغیاز**- ا(فەغیاز- fexyaz): شاگردانە، بەخشیش، مژدە.

**فقاح**- ا.ع(فوغغاه- fuxxah): چەکەرە، شکۆفە، پونگە.

**فقار**- ا.ع(فەغار- fexar): مۆرەغەی پشت، بڕبڕەی پشت.

**فقاره**- ا.ع(فەغارە- fexare): مۆرەغە، بڕبڕە.

**فقاع**- ص.ع(فەغغاء- fexxa’): دڵڕەش، گڵاوو پیس.

**فقاع**- ا.ع(فوغغاء- fuxxa’): بیرە.

**فقاع گشودن**- مص.ل(فوغغاء گوشودەن- fuxxa’ guşûden): کردنەوەی سەری بیرە، قرقێنەلێدان.

**فقاعی**- ا.ص(فوغغائی- fuxxa’î): بیرەفرۆش.

**فقاهت**- مص. ع(فەغاهەت- fexahet): زانا بوون لە بواری بنەماکانی شەریعەتدا.

**فقد**- مص.م(فەغد- fexd): گومکردن، بزرکردن، لە دەستدان.

**فقدان**- مص.م.ع(فوغدان- fuxdan): لەدەستدان، گومکردن، بزرکردن.

**فقر**- ا.مص.ع(فەغر- fexr): هەژاری، دەستکورتی، نەداری، فەقیری.

**فقر**- ا.ع(فیغەر- fixer): مۆرەغە، بڕبڕەی پشت.

**فقراء**- ص.ا.ع(فوغەراء- fuxera’): هەژاران، سۆفیان، دەروێش و قەلەندەران.

**فقرات**- ا.ع(فیغەرات- fixerat): مۆرەغەی پشت، بڕبڕەی پشت.

**فقره**- ا.ع(فیغرە- fixre): یەک مۆرەغە، پەرەگراف، باشترین بەیتی قەسیدە.

**فقط**- ق.ع(فەغەت- fexet): تەنیا.

**فقع**- ا.ع(فیغیٔ- fix’): جۆرە قارچکێکە.

**فقود**- مص.م(فوغوود- fuxûd): گومکردن، لەدەست دان.

**فقه**- مص.م.ع(فیغە- fixh): زانین، پسپۆڕبوون لە شتێکدا، شارەزایی لە بنەماکانی شەرعدا.

**فقهاء**- ا.ع(فوغەهاء- fuxeha’): زانایانی بواری شەرع.

**فقید**- ص.ع(فەغید- fexîd): لەدەست چوو، گوم بوو.

**فقير**- ص.ع(فەغیر- fexîr): هەژار، دەستکورت، بێنەوا.

**فقيرانه**- ق.ص(فەغیرانە- fexîrane): هەژارانە.

**فقیره**- ص.ع(فەغیره- fexîre): هەژار.

**فقیه**- ص.ع(فەغیه- fexîh): زانا، پسپۆر لە بواری زانستێن فیقه. شارەزا لە ئەحکامی شەرع، شەرع زان، مەلا.

**فقیهه**- ص.ع(فەغیهه- fexîhe): ژنی شارەزاو پسپۆر لە شەرعدا.

**فک**- مص.م.ع(فەکک- fekk): کردنەوە، جیاکردنەوەی دوو شت لێکدی، رزگارکردنی دیل، ئازادکردن.

**فک**- ا.ع(فەکک- fekk): شەویلاگە، کاژێرە، شەویلە.

**فک**- ا.فر(فوک- fuk): بەرازی ئاوی.

**فکاهت**- مص.ل.ع(فەکاهەت- fekahet): سوعبەتچیاتی، حەنەکچیاتی، سوعبەتچی و دەم بە پێکەنین و قسەخۆش.

**فکر**- ا.ع(فیکر- fikr): ئەندێشە، بیر، هزر، فیکر.

**فکز**- ا(فەکز- fekz): دووکەڵکێش، دووکەڵکێشی موبەق یان سۆپا.

**فکل**- ا.فر(فوکول- fukul): کەراویت، بۆینباخ.

**فکور**- ص(فەکوور- fekûr): پیاوی بەهزرو بیر، هزرمەند، هزرڤان.

**فکه**- ا.ع(فەککە- fekke): کاسەو سفرەی دەرویشان، کاسەو سفرەی هەتیوان، کاسەو سفرەی هەژاران.

**فگار**- ص(فەگار- fegar): ماندوو، زامدار، دڵبرین.

**فگانه**- ا(فەگانە- fegane): منداڵی نەبەکامی لەبارچوو، منداڵێک بە مردوویەتی لەدایک ببێ.

**فل**- ا(فول- ful): نیلوفەر، داری درەختی بەهێ.

**فل**- ا.ع(فولل- full): گوڵێکی سپی بۆنخۆشە.

**فلات**- ا(فەلات- felat): تان، رایەڵی تەون.

**فلات**- ا.ع(فەلات- felat): بیابان، سارا، دەشت.

**فلاته**- ا(فولاتە- fulate): باسوق.

**فلاح**-ا.مص.ع (فەلاه- felah): سەرکەوتن، رزگاری.

**فلاح**- ا.ص.ع(فەلاه- falah): فەلاح، جووتیار، جوتکار، وەرزێر.

**فلاحت**- ا.مص.ع(فەلاهەت- felahet): جوتیاریی، فەلاحەت، کاری جوت بەندە.

**فلاخن**- ا(فەلاخەن- felaxen): قەڵماسنگ، بەردەقانی، قۆچەقانی، کەهنیک.

**فلاده**- ص.(فەلادە- felade): بێهودە، بێ سوود، قسەی قۆرو پووچ.

**فلاسفه**-ا.ع(فەلاسیفە-felasife): فەیلەسوفان.

**فلاسک**- ا.فر(فیلاسک- filask): زەمزەمی ئاو، یەخچاڵی بچووکی شوشەیی.

**فلاشری**- ا.فر(فەلاشیری- felaşirî): نەخۆشییەکە تووشی کرمی ئاوریشم دەبێ، بە تایبەتی لە دوا قۆناغی تەمەنیدا، کرمەکە دەمرێو رەش دەبێتەوە. رەشە مەرگ.

**فلاکت**- ا(فەلاکەت- felaket): فەلاکەت، بەدبەختی، دەستکورتی و کوێرەوەری، زۆر دژوار، ئەوپەڕی تەنگانە.

**فلامک**- ا(فەلامەک- felamek): جۆرە ئەڵماسێکە.

**فلان**- ا.ع(فولان- fulan): فلان، کاورا، یارۆ، (راناوی نادیارە).

**فلانل**- ا.فر(فیلانیل- filanil): فانیلە.

**فلانه**- ا.ع(فولانە- fulane): فلان (بۆ ئافرەتی نادیار).

**فلج**- ا(فەلج- felc ): قفڵ، کیلۆنی دەرگا.

**فلج**- مص.ل.ع(فەلەج- felec): ئیفلیج بوون، لە کارکەوتنی دەست یان پێ یان نیوەی بەدەن، زەمین گیربوون.

**فلخ**- ا(فەلەخ- felex): سەرەتا، هەوەڵی کار، دەستپێک.

**فلخ**- مص.ع(فـــەلخ- felx): روونکردنەوەو ئاشکراکردنی کارێک.

**فلخم**- ا (فــەلەخم- felexm): بەردەقــانی، قەڵماسنگ.

**فلخم**- ا(فەلخەم- felxem): مشـتـە، کـوتکی هەلاجی.

**فلخـمــان**- ا(فــەلەخــمــان- felexman): قۆچەقانی، بەردەقانی، قەڵماسنگ.

**فلخـمــیــدن**- مص.م(فــەلخــەمــیــدەن- felxemîden): شـیکردنەوەو هەلاجی کـردنی لۆکە.

**فلخـودن**- مص.م(فــەلخــوودەن- filxûden): هەلاجی کردنی پەموو.

**فلخوده**- ا.مف(فەلخوودە- felxûde): شیکراوە، هەلاجی کراو، پەمووی پاککراوو شیکراوە.

**فلد سپات**- ا.مر(فـیلد سپات- fild spat): جۆرە بەردێکە.

**فلد مــارشــال**- ا.فــر(فــیلد مــارشــال- fild marşal): سـوپاسـالار، بالاترین پلەی سـوپایی لە ئەڵمانو ئینگلستانو هەندێ وڵاتانی دی.

**فلذ**- مص.م.ع(فـەلز- felz): جـیــاکــردنەوە، جیاکردنەوەی بەشێک لە ماڵ بۆ کەسێک.

**فلز**- ا.ع(فیلز- filz): جگەر.

**فلذه**- ا.ع(فـیلزە- filze): پارچەیەک لە جگەر یان لە گۆشت، بەشێک لە زێڕو زیوو.

**فلرز**- ا(فەلەرز- felerz): پریاسکە.

**فـلرزنـگ**- ا(فـــــەلەرزەنـگ- felerzeng): پریاسکەیەک کە خواردنو شتی تێ بکەنو لەگەڵ خۆدا بیبەن، توێشەبەرە.

**فلز**- ا.ع(فیلیزز- filizz): کانزا، ئاسنجاو.

**فلس**- ا.ع(فــــەلس- fels): دراوێکی کـــەم بەهایە، پولەکە (ماسی).

**فلسفه**- ا.ع(فەلسـەفە- felsefe): فەلسـەفـە، حـیکمـەت، بیـرکـردنەوەو رامـانو قـووڵبـوونەوە لە بوونو هەقیقەتی شتانو هۆی بوونیان.

**فلش**- ا.فر(فیلش- filş): تیر، نێزە.

**فلشک**- ا(فـــیـلیــــشـک- filişk): کـــۆزەی بچووک، کۆزەیەک کە بۆ منالان بنەخشێنرێ.

**فلغند**- ا(فـــەل غــەند- felxend): پەرژین، شورەی بەدرووچیل.

**فلفل**- ا(فیلفیل- filfil): بیبەر، ئیسوت.

**فلفل بری**- ا.مـر(فـیـل فـیـلی بەڕی- fil fili berî): جۆرە رووەکێکە.

**فلفل سبـز**- ا.مـر(فـیل فـیلی سـەبز- fil fili sebz): جۆرە رووەکێکە.

**فلفل سفید**- ا.مر(فیل فیلی سەفید- fil fili sefîd): جۆرە رووەکێکە.

**فلفل فرنگی**- ا.مر(فـیل فـیلی فـەرەنگی- fil fili ferengî): جۆرە رووەکێکە.

**فلفل کبیـر**- ا.مـر(فـیل فـیلی کـەبیـر- fil fili kebîr): جۆرە درەختێکە.

**فلفل مــویه**- ا(فــیـل فــیـل مــویە- fil fil mûye): دەوەنێکی خۆ هەڵواسە.

**فلق**- مص.م.ع(فەلغ- felx): شەق کردن، دوو فلیقانەکردن.

**فلق**- ا.ع(فەلغ- felx): شەق، درز.

**فلق**- ا.ع(فەلەغ- felex): سپێدە، شەق، درز، قلیشی چیا.

**فلقه**- ا.ع(فـەلغـە- felxe): نیـوەی شـتـێک، لەت، پاژ، بەش.

**فلک**-ا (فەلەک- felek): فەراقە، فەلاقە.

**فلک**- ا.ع(فەلەک- felek): گەردون، مـەداری هەر یەکێک لە هەسارەکان.

**فلک زده**- ص.مــــر(فـــــەلەک زەدە- felek zede): دامـاو، کـلـۆڵ، بێ بەخت، بێ تالح، هەژار، بەستەزمان.

**فلکه**- ا.ع(فـەلەکـە- feleke): فلکە، بازنە، تایە، پێـچکە، هەر شـتـێکی بازنەیی بەدەوری خۆیدا بسووڕێتەوە.

**فلکی**- ص.ن(فەلەکی- felekî): ئەستێرەناس، پسپۆڕو زانا لە بواری گەردونناسیدا.

**فلماخن**- ا(فەلماخەن- felmaxen): قەڵماسەنگ، بەردەقانی، قۆچەقانی.

**فلنجمشک**- ا(فەلەنج موشک- felenc muşk): جۆرە گیایەکە.

**فلنجه**- ا(فەلەنجە- felence): جۆرە گیایەکە بۆ دەرمان دەشێت.

**فلوات**- ا.ع(فەلەڤات- felevat): دەشتان، بیابانان.

**فلوئور**- ا.مر(فولوئوور- fulûur): جۆرە گازێکی زەرد رەنگە.

**فلوت**- ا.فر(فولووت- fulût): فلووت، ئامێرێکی مۆسیقایە وەکو نای لێدەدرێ.

**فلوت**- ا.فر(فلووت- flût): هێزی دەریایی وەڵاتێک، کۆی کەشتیانی جەنگی وڵاتێک.

**فلورن**- ا.فر(فولوورن- fulûrn): دراوێکی هۆڵەندیو هەندێ وڵاتی تری ئەوروپایە لە هەر وڵاتێکدا بەهایەکی جیاوازی هەیە.

**فلوره**- ا.فر(فلووره- flûre): جۆرە شمشێرێکی تایبەتی شمشێربازییە.

**فلوس**- ا.ع(فولووس- fulûs): جۆرە دراوێکی کەم بەهایە.

**فلس**- ا.ع(فولوس- fulus): جۆرە درەختێکی زەلامە، لە وڵاتانی گەرمەسێری وەکو عەرەبستانو میسرو هندوستاندا دەروێ.

**فلوکس**- ا.مر(فلوکس- flûks): جۆرە گوڵێکە، بۆ جوانی لە باخچاندا دەیروێنن.

**فله**- ا(فەلە- fele): ژەک، فرۆ.

**فلیو**- ص(فەلیڤ- felîv): بێهودە، بێ فایدە، بێ کەڵک.

**فم**- ا.ع(فەم- fem): زار، دەم.

**فمینیسم**- ا.فر(فیمینیسم- fimînîsm): لایەنگری لە ئافرەت، لایەنگری لە مافێن ئافرەت، ژن تەبیعەت، تەبیعەت ژنانی.

**فن**- ا.ع(فەنن- fenn): جۆر، بەش، هونەر، فێڵ، حیلە، سنعەت.

**فناء**- مص.ل.ع(فەناء- fena'): نەمان، فەنابوون، لەناوچوون.

**فناء**- ا.ع(فیناء- fina'): حەوشە، مەیدان، گۆڕەپان.

**فناپذیر**- ص.فا(فەناپەزیر- fena pezîr): فانی، ناپایەدار، ڕەوتەنی.

**فناتیسم**- ا.فر(فەناتیسم- fenatîsm): لایەنگری توند لە مەسەلەێن ئاینی یان ئەخلاقی یان کۆمەڵایەتی یان سیاسی، توندڕەوی، دۆگماتیزم.

**فناتیک**- ص.فر(فەناتیک- fenatîk): پابەندیی کوێرانە، دۆگماتیک.

**فنادق**- ا.ع(فەنادیغ- fenadîx): هۆتیلان، میوانخانان.

**فنار**- ا.ع(فەنار- fenar): مەشخەڵ، فانۆس.

**فناستین**- ا.فر(فیناستین- finastîn): حەبی ئارامبەخش.

**فناکده**- ا.مر(فەناکەدە- fenakede): دنیای فانی، فەناخانە.

**فنان**- ص.ع(فەننان- fennan): خودان هونەر، هونەرمەند، کەری کێوی.

**فنج**- ا.ص(فەنج- fenc): فتق، قۆڕی، گەورەوزل.

**فنجا**- ا(فەنجا- fenca): لەرز.

**فنجان**- ا(فینجان- fincan): فینجان.

**فنجریون**- ا(فەنجەرییون- fenceriyûn): جۆرە رووەکێکە.

**فنجنوش**- ا(فەنجنوش- fencnûş): ژەنگی ئاسن.

**فنجیدن**- مص.ل(فەنجیدەن- fencîden): باوێشکدان بەدەم خومارییەوە، خەوالوبی.

**فنجیون**- ا(فەنجییوون- fencîyûn): گیایەکی ژەهرداری گوڵزەردە.

**فند**- ا(فـەند- fend): فـێڵ، حـیلە، فـریو، تەفرە، درۆ، نێرەنگ، فەندو فێڵ.

**فند**- ا.مص(فـەند- fend): ناشـوکـری، نمەک حەرامی، سپڵەیی، پێنەزانی، داماوی، هەژاری.

**فندق**- ا(فـیندوغ- findu x): بوندق، فـوندق، میوەیەکی خڕی رەشی ئامال سورە لە تیرەی بادەم و پستەیە.

**فندق**- ا.ع(فوندوغ- fundu x): کاروانسەرا، هوتێل، میوانخانە.

**فندک**-ا (فـــەنـدەک- fendek): چەرخ، چەخماخ.

**فنر**- ا(فـەنەر- fener): فـەنەر، سـپـرینگ، دەبڵی ئوتومبیل.

**فنطاس**- ا.ع(فینتاس- fintas): بۆشکەی ئاو خواردنەوە لە کەشتیدا، بەرمیل.

**فنک**- ا(فـەنەک- fenek): جـۆرە گـیانداریکە لە رێوی دەچێ.

**فنگ**- ا(فـەنگ- feng): کرمـێکی سەوزە پتر لە سـەر گـەڵای گـیـا پەیدا دەبێ، زەروو، زالو، بێنەوا، دەستکورتو هەژار.

**فنگ**- ا(فـــەنگ- feng): کـــوژاڵـک، تەحلەسێڤ، کاڵەکە مارانە.

**فنل**- ا.فـر(فـینول- finul): جـۆرە مـادەیەکی کیمیاییە.

**فنن**- ا.ع(فەنەن- fenen): لق، لقی درەخت.

**فنودن**- مـص.ل(فـــــنودەن- funûden): خەڵەتان، دەستخەرۆبوون.

**فن وفن**- ا(فینو فین- finn û fin): فـینگە فینگی کەپوو.

**فنومن**- ا.فـر(فـینومین- finûmîn): دیاردە، رووداو، شتی نایابو دەگمەن.

**فنومنیــــــسم**- ا.فــــر(فــــینومنیـــــسم- finûminism): دیاردەگەرایی (ظاهراتی).

**فـنـون**- ا.ع(فـنـون- funûn): هـونـەران، سنعەتان.

**فـوائد**- ا.ع(فـەڤـائیـد- fevaid): سـوودو قازانجان، فایدان.

**فـوات**- مص.ل.ع(فـەڤـات- fevat): مـردن، بەسەرچوونی وەختی کارێک.

**فواتح**- ا.ع(فەڤاتیـه- fevatih): سەرەتاکان، سەرەتاکانی سورەتێن قورئان.

**فـواحش**- ص.ا.ع(فـەڤـاهیش- fevahiş): خـراپکاریان، رووسـپـیـان، ژنانی بەدکـار، سۆزانییان.

**فـوار**- ص.ع(فـەڤـڤـار- fevvar): لە کـوڵو جۆش، هەڵقوڵیو بە توندی، ئاوی بە فوارە.

**فـوارس**- ص.ا.ع(فـەڤـاریس- fevvaris): ئەسپ سواران، سواران.

**فوارە**- ص.ع(فەڤڤارە- fevvare): فوارە.

**فـواصل**- ا.ع(فـەڤـاسیل- fevasil): مـاوەی نێوان دوو شت یان زیاتر.

**فواضل**- ا.ع(فەڤازیل- fevazil): زانایان.

**فواق**- ا.ع(فوڤاغ- fuva¨x): نزگرە، نزگەرە.

**فـواقع**- ا.ع(فـەڤـاغـیئ- feva xi’): بەڵا، تەنگانە، ناڕەحەتی.

**فـواکـه**- ا.ع(فـەڤـاکـیـه- fevakih): مـیـوە، فیقی.

**فوب**- ا(فووب- fûb): فوو کردن بەدەوری خۆتا یان بە دەوری کەسێکی دیدا بۆ چاوی بەد.

**فوت**- ا(فـووت- fût): فـووکردن؛ بۆ هەڵکردنو خـۆشکردنی ئاگـر یان کـوژانەوەی چرا، فـووکـردن بەدەوری کەسێکدا بۆ چاوەزار.

**فوت**- مـص.ل.ع(فەوت- fewt): مردن.

**فوت**- ا.ا نگل (فووت- fût): پێ، فووت.

**فوتبال**- ا. انگل(فووتبال- fûtbal): فـوتبۆڵ، یاری تۆپی پێ.

**فوتک**- ا(فووتەک- fûtek): نای بچووک.

**فوتنج**- ا(فووتەنج- futenc): پونگە.

**فوتو**- ا.فر(فووتو- fûtû): فۆتۆ، وێنە.

**فـوتوالکـتریـک**- ا.فر(فـووتوئیلیکـتریک- fûtû iliktrîk): دینەمۆی دروستکردنی کارەبا.

**فوتو تلسکوب**- ا.فر(فوتو تیلیسکوب- fûtû tiliskûb): تەلیسکۆب.

**فوتوژن**- ص.فر(فووتووژین- fûtû jin): بلاجیکتۆر.

**فوتوسفر**- ا.فر(فووتوو سفیر- fûtû sfir): رۆشنایی، گۆی رۆشنایی.

**فوتوشیمی**- ا.فر(فووتووشیمی- fûtû şîmî): لقێکی زانستی کیمیایە لە کارگەی روناکی لە کارلێکی کیمیایدا دەکۆڵێتەوە.

**فوتوفوبی**- ا.فر(فووتووفوبی- fûtûfûbî): ترس لە رۆشنایی.

**فوتوکپی**- ا.فر(فووتووکوپی- fûtûkupî): فۆتۆکۆپی، لەبەرگرتنەوە.

**فوتوگراف**- ا.فر(فووتووگراف- fûtûgraf): فۆتۆگراف، وێنەگر.

**فوتوگرافی**- ا.فر(فووتووگرافی- fûtûgrafî): وێنەگری.

**فوتومتر**- ا.فر(فووتوومیتر- fûtûmitr): رۆشنایی پێو.

**فوته**- ا(فووته- fûte): پەشتەماڵی حەمام، خاولی.

**فوج**- ا.ع(فەوج- fewc): فەوج، بەشێک لە سوپا.

**فوح**- مص.ل.ع(فەوه- fewh): جۆشانو سەر رێژبوونی مەنجەڵ، رشتنی خوێن لەبەر برین، بڵاوبوونەوەی بۆنی گوڵ یان میسک.

**فود**- ا(فوود- fûd): پۆ، تێوەدانی تەون، هاوەڵی رایەڵ.

**فودج**- ا.ع(فەودەج- fewdec): کەژاوە، کەژاوەی بووک.

**فودنج**- ا(فوودەنج- fûdenc): پونگە.

**فور**- ا(فوور- fûr): سووری کاڵ، سووری ئامال زەرد.

**فور**- ا (فوور- fûr): وافور، سەبیلی تلیاک کێشان.

**فور**- مص.ل.ع(فەور- fewr): هەڵقوڵینی ئاو لە سەرچاوەوە، هاتنەکوڵی مەنجەڵو سەررێژبوونی.

**فور**- ا.ع(فەور- fewr): خێرا، زوو، بێ درەنگ، بەلەز، یەکسەر.

**فورامن**- ا.فر(فوورامین- fûramin): کڵاو رۆژنە، وردەکونی سەر بەدەنی گیانلەبەران.

**فوران**- مص.ل.ع(فەڤەران- feveran): هەڵچوون، هەڵقوڵین، جمانی خوێن لە دەماردا.

**فورت**- ا.مص.ع(فەورەت- fewret): هەرەتی هەڵچوونو تورەبوون، هەرەتی گەرما، هەڵچوون.

**فوردگان**- ا(فەڤەردەگان- feverdegan): ناوی جەژنێکی کۆنی ئێرانیانە.

**فوردیان**- ا(فەڤەردییان- feverdiyan): ناوی جەژنێکی کۆنی ئێرانییە کە خەڵکی ئێران لە پێنج رۆژی یەکەمی ساڵ یان لە پێنج رۆژی کۆتایی ساڵدا دەیانگێڕا.

**فوردین**- ا(فەڤەردین- feverdîn): ناوی مانگێکی ئێرانییە، فەروەردین.

**فورموی**- ص.مر(فوورمووی- fûrmûy): موو زەرد.

**فوریه**- ا.فر(فیڤرییە- fivriye): دووەم مانگی ساڵی فەرەنگی.

**فوز**- ا(فووز- fûz): لمۆز، دەمو لمۆز.

**فوز**- مص.ل.ع(فەوز- fewz): سەرکەوتن، رزگاربوون.

**فوژان**- ا(فووژان- fûjan): هاوار، نەعرەتە.

**فوطه**- ا.ع(فووتە- fûte): پەشتەماڵ، خاولی، فۆتە، سەربەست.

**فوفل** ا(فوفیل- fûfil): جۆرە درەختێکە لە تیرەی دارخورما.

**فوق**- ق(فەوغ- few x): باڵا، سەرو، باشتر.

**فوقانی**- ص.ن.ع(فەوغانی- few xanî): باڵایی، سەرویی.

**فوقس**- ا.فووغوس- fû xus): جۆرە قەوزەیەکە لە قوڵایی دەریادا پەیدا دەبێ.

**فوکا**- ا(فووکا- fûka): جۆره بییەکە.

**فوکستروت**- ا. انگل(فۆکستروت- foks trût): ڕێ‌و ڕۆیشتنی ڕێوی، جۆره سەمایەکە.

**فوکوس**- ا.فر(فووکووس- fûkûs): جۆره قەوزەیەکە لە قولایی دەریادا پەیدا دەبێ.

**فوگان**- ا(فووگان- fûgan): بلێق.

**فول**- ا.ع(فوول- fûl): پاقلە.

**فول**- ا.ا.نگل(فوول- fûl): فاوڵ.

**فولاد**- ا(فوولاد- fûlad): پۆڵا.

**فولکلور**- ا.فر(فۆلکلۆر- folklor): فۆلکلۆر، کەلەپوور.

**فوم**- ا.ع(فووم- fûm): سیر، دانەوێڵە، هەر دانەوێڵەیەک بکرێ بەنان.

**فون**- ا.فر(فوون- fûn): یەکەی ئەندازەگیری تونی دەنگ.

**فونتیک**- ص.فر(فونیتیک- fonitîk): فۆنەتیک، دەنگ سازی.

**فوندمانت**- ا.فر(فوندیمانیت- fondimanit): پایە، بناخە، بونیاد.

**فونوگراف**- ا.فر(فوونووگراف- fûnûgraf): فۆنۆگراف، ڕیکۆردەر.

**فوه**- ا.ع(فووڤە- fuvve): ڕووەکێکە ڕەگەکەی لە ڕەنگ ڕێژی‌و خمگەریدا بەکاردێ.

**فوهل**-ا (فووهیل- fûhil): شۆڕاخ، شامات، شۆرەزار.

**فه**- ا(فەه- feh): کەردوو، سەوڵ.

**فه**- ص.ع(فەهه- fehh): پیاوێ لە قسەکردندا بێ توانابێ.

**فهارس**- ا.ع(فەهاریس- feharis): پێرستان.

**فهامت**- مص.م.ع(فەهامەت- fehamet): فامین، حاڵی بوون، تێگەییشتن، دەرک کردن.

**فهامه**- ص.ع(فەههامە- fehhame): زۆر زاناو زیرەک، زۆرفام.

**فهانه**- ا(فەهانە- fehane): پواز، پشتکوڵ، قالبی پێڵاو.

**فهد**- ا.ع(فەهد- fehd): پڵێنگ.

**فهر**- ا.ع(فوهر- fuhr): جەژنێکی جولەکەیە.

**فهرس**- ا.ع(فیهریس- fihris): پێرست.

**فهرست**- ا(فیهریست- fihrist): پێرست.

**فهل**- ص(فەهل- fehl): پەل، پان، کراوە، بەرین.

**فهلوی**- ص.ن(فەهلەڤی- fehlevî): پەهلەوی. زمانی پەهلەوی.

**فهلویات**- ا(فەهلەڤییات- fehleviyat): شێوەزارە جیاوازەکانی زمانی فارسی.

**فهم**- مص.م.ع(فەهم- fehm): زانین، دەرک کردن.

**فهم**- ص.ع(فەهیم- fehim): زیرەک، زانا، تیژفام، لەزفام.

**فهماء**- ص.ع(فوهەماء- fuhema’): زانا، زیرەک‌و ژیر، بەفام.

**فهماندن**- مص.م(فەهماندەن- fehmanden): فاماندن، حاڵی کردن، تێگەیاندن.

**فهمیدن**- مص.ل(فەهمیدەن- fehmîden): دەرک کردن، تێگەییشتن، پەی بردن.

**فهمیده**- ا.مف(فەهمیدە- fehmîde): فامیدە، حاڵی، دانا، تێگەییشتوو.

**فهود**- ا.ع(فوهوود- fuhûd): پڵنگان.

**فهه**- ا(فیهە- fihe): سەوڵی کەشتی ڕانی.

**فهیم**- ص.ع(فەهیم- fehîm): زانا، زیرەک، بەفام، فامیدە، تێگەیشتوو.

**فیء**- ا.ع(فەیء- fey’): سایە، سێبەر، پۆلی مەلان، دەستکەوت.

**فیار**- ا(فییار- fîyar): کار، پیشە، بژێوو، مەگیرانی.

**فیاض**- ص.ع(فەییاز- feyyaz): جۆگە یان کانی فرە ئاو، پیاوی بەخشندەو دڵاوا.

**فیافی**- ا.ع(فەیافی- feyyafî: بیابان، دەشتی ڕاستانی‌و هەموار.

**فیال**- ا (فەیال- feyal): سەرەتا، زەوییەک بۆ یەکەمجار بچێنرێ.

**فیال**- ا.ع(فەییال- feyyal): فیلەوان، خودان فیل.

**فیاوار**- ا(فەیاڤار- feyavar): کار، پیشە.

**فیبر**- ا.فر(فیبر- fibr): فەیبەر، فایبەر.

**فیبرین**- ا.فر(فیبرین- fîbrîn): ماددەیە کە لە خوێندا کە یارمەتی مەیینی خوێن دەدات.

**فیج**- ا.ع(فەیج- feyc): دەستەیەک لە خەڵکی، پەیک، قاسید، تەتەر، غوڵام.

**فیجن**- ا.ع(فەیجەن- feycen): جۆرە رووەکێکە.

**فیح**- مص.ع(فەیەح- feyh): هاتە ساڵ، رۆیشتنی خوێن لە برین، جۆشانی مەنجەڵ.

**فیحاء**- ص.ع(فەیهاء- feyha’): بەرین، بڵاو، سەرای گەورە، مەیدان.

**فیدل**- ص.فر(فیدل- fidl): وەفادار، بە ئەمەک، راستو دروست، دروست پەیمان، پایەدار.

**فیر**- ا(فییر- fîyîr): ئەفسوس، مەخابن، ریشخەن.

**فیروز**- ص(فیرووز- firûz): سەرکەوتوو.

**فیروزج**- ا.ع(فیرووزەج- firûzec): پیرۆزە.

**فیروزه**- ا(فیرووزە- fîrûze): پیرۆزە، بەردێکی شینی بەنرخە بەزۆری بۆ نقێمی موستیلان بەکاردێ.

**فیروزەفام**- ص(فیرووزەفام- fîrûze fam): پیرۆزەرەنگ، شینباو.

**فیرون**- ص(فیروون- fîrûn): بەرز، باڵا، راست، خواناس، داوێن پاک.

**فیریدن**- مص.ل(فیریدەن- fîrîden): رۆیینی بەلارولەنجە، تەوس کردن، ریشخەن کردن.

**فیرنده**- ا.فا(فیرەندە- fîrende): لارو لەنجە، عیشوەو نازکەر، بەنازو فیز.

**فیزسین**- ا.ص.فر(فیزیسین- fîzîsîn): پسپۆری فیزیا، فیزیازان.

**فیزیک**- ا.فر(فیزیک- fîzîk): فیزیا.

**فیزیکدان**- ا.ص.فر(فیزیکدان- fîzîkdan): پسپۆری بواری فیزیا.

**فیزیوترابی**- ا.فر(فیزیوتیراپی- fîzîyutirapî): پزیشکگەری فیزیکی.

**فیزیوکرات**- ص.فر(فیزیووکرات- fîzyûkrat): لایەنگرانی فیزیوکراسی.

**فیزیوکراسی**- ا.فر(فیزیووکراسی- fîzyûkrasî): تیۆرییەکی ئابوورییە کەلایەنگرانی پێیان وایە سەروەتو سامانی راستەقینە یان تاقە سەرچاوەی سامانی وڵات ئاوو زەویو بەرووبوومی کشتوکاڵییەو زێرو زیو بە سەروەتی حەقیقی نایەتە ژمارەو تەنیا هۆن بۆ ئاسانکاری ئاڵوویڵو سەودا.

**فیزیولۆژی**- ا.فر(فیزیولۆژی- fîzyûlûjî): فیزیولوژی، زانستێکە دەربارەی تەرزی کاری ئەندامو دەزگاکانی بەدەنی گیانلەبەرانو پەیوەندییان بە یەکترەوە.

**فیزیولوژیست**- ص.فر(فیزیولوژیست- fîzyûlûjîst): زانا لە زانستی فیزیادا.

**فیزیونومی**- ا.فر(فیزیوونوومی- fîzyûnûmî): ناوچەوان، روخسار، دیمەن، سیماناسی.

**فیس**- ا(فیس- fîs): فیز، غرور، دەحیە، دەعیە، تاووس.

**فیسور**- ا.فر(فیسوور- fîsûr): شەقی بچووک، درز.

**فیش**- افر(فیش- fîş): فیش، فیشە.

**فیشیه**- ا.فر(فیشیە- fîşîye): فیشەدان.

**فیصل**- ا.ص(فەیسەل- feysel): حاکم، قازی، شمشێری تیژ، داوەری لە نێوان هەقو نا هەقدا.

**فیصل دادن**- مص.م(فەیسەل دادەن- feysel daden): حەلو فەسڵ کردنی (کاروباران).

**فیض**- مص.ع(فەیز- feyz): سەرکردنی ئاو و

ڕۆییشتنی، ئاوی زۆر، شتی زۆر، بەخشش، سەخاوەت.

**فیضان**- مص.ع(فەیەزان- feyezan): لافاو، هەستانی ئاو، سەرکردنی ئاوو لەبەر ڕۆییشتنی.

**فیفاء**- ا.ع(فەیفاء- feyfa’): بیابانی بێ ئاو، دەشتی هەموارو بەرین.

**فیکس**- ص.فر(فیکس- fîks): بەرقەرار، پایەدار، نەگۆڕ.

**فیل**- ا(فیل- fîl): فیل.

**فیلبان**- ا.ص(فیلبان- fîlban): فیلەوان، شوانی فیل.

**فیلپا**- ا.مر(فیلپا- fîlpa): جۆرە نەخۆشییەکە.

**فیلتر**- ا.فر(فیلتەر- fîlter): فیلتەر.

**فیل دریایی**- ا.مر(فیلی دەریایی- fîli deryayî): جۆرە حەیوانێکی وشکاوییە.

**فیلسته**- ا.مر(فیلوستە- fîluste): ئێسقانی فیل، عاج.

**فیلسوف**- ا.ص(فەیلەسووف- feylesûf): فەیلەسوف، شارەزاو پسپۆڕی بواری فەلسەفە .

**فیلک**- ا(فەیلەک- feylek): تیری دوو لقە.

**فیلگوش**- ا(فیل گووش- fîl gûş): گوڵی زەنبەق، سۆسەنی سپی.

**فیلگوش**- ص(فیل گووش- fîl gûş): هەر شتێ وەکو گوێی فیل بێ، گوێ پان وەکو گوێچکەی فیل.

**فیلم**- ا.فر(فیلم- fîlm): فیلمی وێنەگرتن.

**فیلم بردار**-ص.فا(فیلم بەردار- fîlm berdar): کەسێک فیلم بگرێ، کەسێک فیلمی هەواڵی یان سینەمایی بگرێ بۆ نیشاندان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن یان سینەما.

**فیلوار**- ا.ص(فیلڤار- fîlvar): فیل ئاسا، وەکو فیل.

**فیلون**- ا.فر(فیلوون- fîllûn): جۆرە ڕووەکێکە.

**فیله**- ا.ع (فیلە- fîle): فیلی مێیە، مێچکە فیل.

**فیله**- ا.ع(فییەلە- fîyele): فیلان.

**فیله**- ا.فر(فیلە- fîle): تۆڕ، داو، پەت، سۆندە، پشتە مەغزە.

**فینال**- ا.ص.فر(فینال- fînal): کۆتایی، دوا پێشبڕکێی وەرزشی.

**فینه**- ا(فینە- fîne): جۆرە کڵاوێکی سادەی سپی یان سوورە کە هەندێ لە خەڵکی میسر لە سەری دەکەن، تەربوش.

**فیوز**- ا.انگل(فیووز- fîyûz): فیوزی کارەبا.

**فیوض**- ا.ع(فویووز- fuyûz): زیادە، زۆر، فەرو بەرەکەت، زانستو فەیزان.

**فیول**- ا.ع(فویوول- fuyûl): فیلان..

# ق

**ق- حر** (ق- X):
پیتی بیست و چوارەمی ئەلفبای فارسییەو بە (قاف) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (۱۰۰) ئەم پیتە لە زمانی فارسی پەتیدا نییەو لەو وشانەدا بەکار دێ کە لە عارەبی یان تورکییەوە وەرگیراون و لە هەندێ وشەی فارسیدا لە جێی غەینو کاف بەکار هاتووە.

**قاان**- ا.(غائان- xaan): شاهنشا، پاشای گەورە، پاشایانی مەغۆل.

**قائد**- ا.فا.ع(غائید- xaid): فەرماندە، سەردار، پێشەوا.

**قائف**- ا.فا.ع(غائیف- xaif): قەیافەناس.

**قائل**- ا.فا.ع(غائیل- xail): پەیڤدار، قسەکەر، پێژەر.

**قائم**- ا.فا.ع(غائیم- xaim): پایەدار، قایم، بەرقەرارو جێگیر، وەستاو، بەرپا.

**قائم کردن**- مص.م(غائیم کەردەن- xaim kerden): قایم کردن، ڤەشارتن، مەحکەم کردن.

**قائم شدن**- مص.ل(غائیم شودەن- xaim şuden): پەنهان بوون، قایم بوون، مکوم بوون.

**قائم**- ا.ص.ع(غائیم- xaim): نازناوی ئیمامی دوازدەیەمی شیعەیان، ئیمامی قائیم، ئیمامی زەمان.

**قائم مقام**- ا.ص.مر(غائیم مەغام- xaim mexam): جێگر، کەسێک بخرێتە جێی کەسێکی دیو کارەکانی ئەو ئەنجام بدات، قایمقام.

**قائمه**- ا.ع(غائیمە- xaime): هەر یەکێک لە چوارپەلی چوارپێیان، دەسکی شمشێر.

**قاب**- ا.ع(غاب- xab): ئەندازە، نیوەی کەوان، نێوان دەسکی کەوانو گۆشەی کەوان.

**قاب قوسین**- ا.مر(غابە غەوسەین- xabe xewseyn): ئەندازەی دوو کەوان، نزیکی.

**قاب**- ا(غاب- xab): قاپ، قاپی گەورەی لێوار پەل، چوارچێوە، وەک چوارچێوەی عەینەک، وێنە و ئاوێنە.

**قاب**- ا(غاب- xab): قاپ، جگ.

**قاب باز**- ص.فا(غاب باز- xab baz): قاپێن چی، کەسێک گەمەی قاپێن بکات(جگ).

**قاب بالان**- ا.مر(غاب بالان- xab balan): ئەو مێروانەی دوو جوت باڵیان هەیە، جووتەکەی سەرەوە لە قەپاغ دەچێت وەکو باڵی خاڵخاڵۆکە.

**قابس**- ا.فا(غابیس- xabis): ئاگرخۆر.

**قاب شور**- ا.مر(غاب شور- xab şûr): قاپ شۆر، ئیسفەنج یان پارچە پەڕۆی ئامان شتن.

**قابض**- ا.فا.ع(غابیز- xabiz): دەرمانی قەبزی، دەرمانێ ببێتە مایەی قەبزی، وەرگر، بگیر.

**قابل**- ا.فا.ع(غابیل- xabil): شایستە، قەبوڵکار.

**قابل قبول**- ا.مر(غابیلی غوبول- xabili xubûl): باوەڕ کەردەنی، جێی قبوڵکردن.

**قابلمه**- ا(غابلەمە- xableme): قاپلەمە، مەنجەڵ.

**قابله**- ا.فا.ع(غابیلە- xabile): ژنی شایستە، مامان.

**قابلیت**- ا.مص.ع(غابیلیەت- xabilîyet): شایستەیی، ئامادەیی.

**قابوس**- ا.ص.ع(غابووس- xabûs): پیاوی قۆزی بە رەنگو بۆ.

**قاپان**- ا(غاپان- xapan): قەپان.

**قاپو**- ا.ت(غاپوو- xapû): قاپی، دەروازە.

**قاپوچی**- ا.ص.ت(غاپووچی- xapûçî): دەرگاوان.

**قاپوق**- ا.ت(غاپووغ- xapûx): سێدارە، قەنارە.

**قاپیدن**- مص.م(غاپیدەن- xapîden): رفاندن، قۆستنەوە.

**قاپیده**- ا.فا(غاپەندە- xapede): رفێنەر، کەسێک شتێک لە دەستی کەسێک یان لە شوێنێک بە گورجی برفێنێ.

**قاپیده**- ا.مف(غاپیدە- xapîde): رفێنراو.

**قاتق**- ا.ت(غاتیغ- xatix): پێخۆر.

**قاتل**- ا.فا.ع(غاتیل- xatil): بکوژ، کوژەر، پیاوکوژ.

**قاتمه**- ا.ت(غاتمە- xatme): گوریس، پەت.

**قاجار**- ا.ت(غاجار- xacar): تیرژەو، تایفەیەکن لەترکمانان کە جماعەتێکیان لە سەردەمی شا عەباسی یەکەمدا لە ئەستەرئابادا ئاکنجی بوون، بنەماڵەی حوکمرانی قاجارییە لەم تایفەیە بوونە.

**قاچ**- ا.ت(غاچ- xaç): قاژ، کوز.

**قاچاق**- ا.ت(غاچاغ- xaçax): قاچاغ، کارێک بە دزییەوە بکرێ، کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلی یاساغ.

**قاچاقچی**- ا.ص.ت(غاچاغچی- xaçaxçî): قاچاخچی.

**قادات**- ا.ع(غادات- xadat): سەرکردەکان.

**قادح**- ا.فا.ع(غادیه- xadih): سەرزەنشتکار، ئیرادگیر، رەخنەگر، زەمکەر.

**قادحه**- ا.فا.ع(غادیهە- xadîhe): کرمی دان، مۆریکە، خۆرە.

**قادر**- ص.فا(غادیر- xadir): بەهێز، توانادار، بەتوانا.

**قادم**- ا.فا.ع(غادیم- xadim): پێشڕەو، گەڕاوە لە سەفەر.

**قادمه**- ا.فا.ع(غادیمە- xadime): شاباڵی مەل، پێش، پێشڕەو، شاپەڕ.

**قاده**- ا.ع(غادە- xade): سەرکردان.

**قاذوره**- ا.ع(غازوورە- xazûre): کاری پیس، گوناحی گەورە، زینا، تۆپیو، پیسی.

**قار**- ا.ع(غار- xar): قیر، زفت.

**قار**- ا.فا.ع(غار- xar): بەرقەرار، پایەدار، جێگیر.

**قاراسیا**- ا(غاراسییا- xarasîya): ئاڵوباڵو، هەڵوژە.

**قارب**- ا.ع(غاریب- xarib): بەلەم، قەیاغ.

**قارچ**- ا(غارچ- xarç): کارگ، قارچک.

**قارح**- ا.فا.ع(غاریه- xarih): بریندارکەر، چوارپێیەک ددانی تەواوبێ.

**قارع**- ا.فا.ع(غاریء- xari’): لێدەر، لە دەرگادەر، دەرکوت، قورعە راکێش، فاڵگرەوە بە قورعە.

**قارعه**- ا.فا(غاریئە- xari’e): بەشی سەرەوەی رێگە، لارێگە، قیامەت، رۆژی

پەسلانێ، بەڵاو نەگبەتی، قەوماوی زەمانە.

**قارقار**- ا(غارغار- xarxar): قغەقغی قەلەڕەش.

**قاروره**- ا.ع(غارووره- xarûre): شووشە، شووشەی شەراب، شووشەیەک کە میزی نەخۆشی تێ بکرێ بۆ پشکنین.

**قاره**- ا.ع(غاره- xare): قاڕە، کیشوەر، قاڕەی ئاسیاو، ئەورووپاو.

**قاری**- ا.فا.ع(غاری- xarî): خوێنەر، قاری، قورئان خوێن.

**قازغان**- ا.ت(غازغان- xazxat): قازان، مەنجەڵی گەورە.

**قاس**- ا.ع(غاس- xas): ئەندازە.

**قاس**- ا.ت(غاس- xas): برۆ، هەور، بۆق، قورباقە.

**قاسانی**- ص.ن(غاسانی- xasanî): کاشانی.

**قاسر**- ا.فا.ع(غاسیر- xasir): بەرهەڵست.

**قاسط**- ا.فا.ع(غاسیت- xasit): ستەمکار، زاڵم، هەڵگەڕانەوە لە هەق.

**قاسم**- ا.فا.ع(غاسیم- xasim): دابەشکەر، بەخشەرەوە.

**قاسی**- ص.ع(غاسی- xasî): بێ ڕەحم، دڵڕەق.

**قاش**- ا.(غاش- xaş): قاژ، کوز، درز، قەڵپوزی زین.

**قاش قاش**- ا.مر(غاش غاش- xaş xaş): قاژ قاژ، بەش بەش، پارچە پارچە.

**قاشانی**- ص.ن(غاشانی- xaşanî): کاشانی.

**قاشق**- ا.(غاشووغ- xaşûx): کەوچک، مراک.

**قاشقک**- ا(غاشوغەک- xaşuxek): کەوچکی چکۆڵە.

**قاص**- ا.فا.ع(غاسس- xass): حیکایەت بێژ، چیرۆکبێژ.

**قاصد**- ا.فا.ع(غاسید- xasid): پەیک، تەتەر، قاسید، نامەبەر.

**قاصر**- ا.فا.ع(غاسیر- xasir): دریغیکەر، تەخسیرکار.

**قاصرات**- ص.ع(غاسیرات- xasirat): ئەو ژنانەی جگە لە مێردی خۆیان چاویان لە دوی پیاویتر نەبێ.

**قاصره**- ا.فا.ع(غاسیره- xasire): ژنێ کە جگە لە پیاوی خۆی چاوی لە پیاوی دی نەبێ.

**قاصف**- ا.فا.ع(غاسیف- xasif): شکێنەر، بای توند کە دارو درەخت بشکێنێ، هەورە گرۆڵە.

**قاصی**- ا.فا.ع(غاسی- xasî): دوور، دوورخەرەوە.

**قاصیه**- ا.فا.ع(غاسییه- xasîye): کەنار، ڕۆخ، لێوار.

**قاضب**- ص.ع(غازیب- xazib): تیغی بڕندە، شمشێری زۆرتیژ.

**قاضی**- ا.فا.ع(غازی- xazî): قازی، حاکمی شەرع.

**قاطبه**- ا.ع(غاتیبه- xatibe): هەموو، گشت، تەڤ.

**قاطر**- ا(غاتیر- xatir): قاتر، هێستر.

**قاطر**- ا.ع(غاتیر- xatir): سەمغو شیلەی درەخت، هەر شتێک دڵۆپ دڵۆپ بچکێ.

**قاطرچی**- ا.ص(غاتیرچی- xatirçî): هێسترەوان.

**قاطع**- ا.فا.ع(غاتیع- xati’): بڕەر، تیژ.

**قاطعه**- ا.فا.ع(غاتیعه- xati’): بڕەر، تیژ.

**قاع**- ا.ع(غاء- xa’): دەشت.

**قاعد**- ا.فا.ع(غائید- xaid): دانیشتوو.

**قاعدگی**- ا.مص.(غائیدەگی- xaidegî): بێ نوێژی ژن.

**قاعده**- ا.فا.ع(غائیده- xaide): بنەما، بناغە، بنکە، یاساو ڕێسا، پایتەخت یان گەورەترین شاری وڵاتێک، هێم.

**قاعه**- ا.ع(غائه- xa’e): حەوشە، هۆڵ، ساڵۆن.

**قـاف**- ا(غـاف- xaf): ناوی کـێـوێکی ئەفسانەییە کە سیمرغ هێلانەی لەسەر کردووە، هەندێ کەس بە سووک کراوەی قەفقازی دەزانن‌و هەندێکێ دی لەگەڵ وشەی (کوف)ی پەهلەویدا کە مانای کێو دەگەیەنێ، بەهاو ریشەی دەزانن.

**قاف تا قاف**- ا.مر(غاف تا غاف- xaf ta xaf): سەرانسەری جیهان.

**قافل**- ا.فا(غافیل- xafil): گەڕاوە لە سەفەر.

**قافله**- ا.فا.ع(غافیله- xafile): قافلە، کاروان.

**قافله سالار**- ص.مر(غافیله سالار- xafile salar): سەر قافلە.

**قافیه**- ا.ع(غافییە- xafiye): پشت مل، کۆتایی شتێک، سەروا، قافیەی شیعر.

**قافیه سنج**- ص.فا(غافییه سەنج- xafiye senc): ئەندازەگری قافییە، هۆزانڤان.

**قاق**- ا.ص.ع(غاغ- xax): قرە، پیاوی گەوج‌و رووح سووک، پیاوی باریک‌و بنێس، ووشک وتورت.

**قاقله**- ا.ع(غاغوللە- xaxulle): جۆرە درەختێکە.

**قاقم**- ا.ع(غاغوم- xaüm): گیانلەبەرێکی بچووکە، لە سقۆرە دەچێت‌و پێستەکەی نەرم‌و سپییەو لە پێستی سمۆرە گرانترە، بۆ پێستەکەی راو دەکرێ.

**قال**- مص.ل.ع(غال- xal): گوتن، پەیڤین.

**قالب**- ا.ع(غالیب- xalib): قاڵب، بۆتە، قاڵبی قۆندەرە، لەش‌و بەدەن.

**قالبتهی کردن**- مص.ل(غالیب توهی کەردەن- xalib tuhî kerden): مردن.

**قالپاق**- ا.ت(غالپاغ- xalpax): کڵاو.

**قالوس**- ا(غالووس- xalûs): ناوی نەوایەکی کۆنی مۆسیقای ئێرانییە.

**قالی**- ا(غالی- xalî): قاڵی، مافوور، فەرش.

**قالی باف**- ص.فا(غالی باف- xalî baf): مافوورچن.

**قالیچه**- ا(غالیچە- xalîçe): قالی بچووک، ئۆرتە.

**قالیچهء سلیمان**- ا.مر(غالیچەی سلیمان- xalîçey sliman): قالیچەیەک بووە کە گوایە سلێمانی کوڕی داود لەسەری دادەنیشت‌و با دەیبرد بە حەوادا.

**قالی شو**- ص.فا(غالی شوو- xali şû): قالی شۆر.

**قامات**- ا.ع(غامات- xamat): بەژن و بالایان.

**قامت**- ا.ع(غامەت- xamet): بەژن و باڵا.

**قامع**- ا.فا.ع(غامیئ- xami’): سەرکوتکار، برندە.

**قاموس**- ا.ع(غامووس- xamûs): دەریا، دەریای گەورە، لۆغەتنامە، فەرهەنگی زمان.

**قانت**- ا.فا.ع(غانیت- xanit): گوێڕایەڵ‌و خواناس، خاکی‌و نوێژکەر.

**قانته**- ا.فا(غانیتە- xanite): ژنی گوێڕایەڵ و خواناس.

**قانص**- ص.ع(غانیس- xanis): راوچی، نێچروان، شکارچی.

**قانط**- ص.ع(غانیت- xanit): نائومێد، ئومێدبراو.

**قانع**- ا.فا.ع(غانیئ- xani’): قایل، بە قەناعەت، رازی بە بەشی خۆی.

**قانون**- ا.ع(غانوون- xanûn): قانون، یاسا.

**قانوندان**- ص.ا(غانووندان- xanûn dan): یاسازان.

**قانون گذار**- ص.فا(غانوون گوزار- xanûn guzar): یاسادانەر، یاسارێژ.

**قانی**- ص.ع(غانی- xanî): سوور، زۆر سوور.

**قاورد**- ا(غاورد- xaverd): جۆرە حەڵوایەکە.

**قاووت**- ا(غاڤووت- xavût): قاویت.

**قـاهر**- ا.فـا.ع(غـاهیـر- xahir): بالادەست، زاڵ، بەزێنەر، بەرزو بڵند، بەزێن.

**قـاهرە**- ا.فـا.ع(غـاهیـرە- xahire): زاڵ، بالا دەست، بەزێن.

**قـاهقـاه**- ا(غـاه غـاه- xah xah): قـاقـا، پێکەنین بەدەنگی بەرز.

**قایق**-ا(غایغ- xayix): بەلەم، قایغ.

**قـایقـچی**- ا.ص.ت(غـایغـچی- xayixçî): بەلەمچی، بەلەمەوان، قایاغەوان.

**قـایق ران**- ص.فـا(غـایغ ران- xayixran): بەلەمەوان، بەلەمهاژۆ، قایغران.

**قـایم انداز**- ص.فـا(غـایم ئەنداز- xayim endaz): شـــــەترەنج باز یان نەردبازی بێ هاوتا.

**قـایم باشک**- ا.مـر(غـایم باشـەک- xayim başek): چاوشارکێ.

**قب**- ا.ع(غــەبب- xebb): فــەحل، نێــر، سەرۆک‌و پێشەوای قەوم.

**قباء**- ا.ع(غەباء- xaba’): جبە، عەبا، کەوا، قاپووت.

**قبائح**- ا.ع(غەبائیە- xebaih): ناشیرین، نا پەسند، قەباحەت.

**قبائل**- ا.ع(غەبائیل- xebail): تیرەو هۆزان.

**قــبـاب**- ا.ع(غــیـبــاب- xibab): قــوببــە، گومەزان.

**قــبـاپوســتین**- ا.مــر(غــەباپووســتین- xeba pûstîn): فەروە.

**قباچە**- ا.مر(قەباچە- xebaçe): کورتەک.

**قــبـاح**- ا.ع(غـیـبـاه- xibah): ناشـیـرین، ناپەسند.

**قــباحت**- مص.ل.ع(غـەباهەت- xebahet): قەباحەت، ناشیرین بوون، ناشیرینی لە قسەدا یان لە کردەوەدا.

**قبازرە**- ا.مر(غەبازیریە- xebazirih): زرێی کەوا ئاسا.

**قــبــال**- ا.ع(غـیـبــال- xibal): بەرانبــەر، رووبەڕوو.

**قــبــالە**- ا.ع(غــەبالە- xebale): قــەواڵە، سەنەد، ژننامە، زەوجیننامە.

**قباله پیچ**- ا.مر(غەبالەپیچ- xebale pîç): قەواڵەپێچ، تورمەیەک یان قوماشێکی گران بەها کـە قــەواڵەی بووکی تێـوە بپێـچنو لە شـەوی زەماوەندا بۆی بنێرنە ماڵەوە.

**قبب**- ا.ع(غوبەب- xubeb): گومەزان.

**قــبح**- مص.ل.ع(غــوبە- xubh): ناشــیــرین بوون، ناشیرینی، دزێوی، کرێتی.

**قبر**- ا.ع(غەبر- xebr): قەور، گۆڕ، ئارامگە، گڵکۆ.

**قبراق**- ص.ت(غـیـبراغ- xibrax): چوست‌و چالاک، گورج‌و گۆڵ.

**قبرستان**- ا.مـر(غەبریسـتـان- xebristan): قەورستان، گۆڕستان.

**قبرغە**- ا.ت(قەبروغە- xebruxe): قەبرغە، کەللەکە، خالیگە، تەنیشت.

**قــبــرکن**- ص.فــا(غــەبرکــەن- xebrken): گۆڕکەن، قـەورکەن، کەسێک قـەبر بۆ مـردووان لێبدا.

**قبرە**- ا.ع(غـوببـەرە- xubbere): کڵاوکوڕە، کڵاونە.

**قبس**- مص.ل.ع(غەبس- xebs): ئاگر گرتن لە شتێکەوە، سوودبینین.

**قــبس**- ا.ع(غـەبەس- xebes): شـولەی ئاگـر، بڵێسەی ئاگر، مەشخەڵ.

**قــبض**- مص.م.ع(غـەبز- xebze): گــرتن، بەدەست گرتن.

**قــبــضــە**- ا.ع (غــەبزە- xebza): دەسکی شمشێر، یەک چنگ.

**قــبط**- ا.ع(غــیــبت- xibt): تایفـەیەکن لە خەڵکی میـسر، خـەڵکی ئەسڵی میـسری کـۆن، قیبتییەکان.

**کفچ**- ا(کەفچ- kefç): کەفی ئاو، کەفی سابوون، ئاوی زار.

**کفچ**- ا(کەفچ- kefç): کەفگیر.

**کفچلیز**- ا(کەف چەلیز- kefçelîz): سەرەمێکوتە، کەفگیری بچووک.

**کفچە**- ا(کەفچە- kefçe): کەوگیر، چەمچە.

**کفچەمار**- ا.م(کەفچەمار- kefçemar): توولەمار.

**کف دریا**- ا.مر(کەف دەریا- kef derya): کەفی دەریا.

**کفر**- مص.م.ع(کوفر- kufr): کوفرکردن، لەدین دەرچوون.

**کفران**- مص.م.ع(کوفران- kufran): کوفرکردن، باوەڕ نەبوون.

**کف روان**- ا.مر(کەف ڕەڤان- kefrevan): ئەو گیانلەبەرانەی بەلەپی پێ دەڕۆن، وەکو ورچ.

**کفره**- ا.ع(کەفەرە- kefere): کافران.

**کفری**- ا.ع(کوفرا- kufurra): شکۆفەی خورما، خونچەی خورما.

**کفش**- ا(کەفش- kefş): قۆندەرە، پێڵاو، کەوش.

**کفشدار**- ا.ص(کەفشدار- kefşdar): کەوشوان، پاسەوانی کەوشان بە تایبەتی لەمەزارگەکان یان لە کۆڕی گشتیدا.

**کفشدوز**- ا.مر(کەفش دووز- kefşdûz): کەوشدروو.

**کفشدوز**- ا.مر(کەفشدووز- kefşdûz): خاڵخاڵۆکە.

**کفشگر**- ا.ص(کەفشگەر- kefşger): کەوشدرو و پێڵاوساز.

**کفشیر**- ا(کەف شیر- kefşîr): لەحیم، چەسپ.

**کفک**- ا(کەفەک- kefek): کەف، کەڕوو.

**کفگیر**- ا.مر(کەفگیر- kefgîr): کەفگیر.

**کفگیرک**- ا(کەف گیرەک- kefgîrek): نەخۆشییەکی پێستە.

**کفل**- ا.ع(کەفەل- kefel): کەفەڵ، سمت و ڕان.

**کفلیز**- ا(کەف لیز- keflîz): کەفگیر.

**کفن**- مص.ع(کەفن- kefn): کفنکردنی مردوو.

**کفن**- ا.ع(کەفەن- kefen): کفن، کراسی مردوو، خامێ کە لەمردوویەوە دەپێچن بۆ ناو قەبر.

**کفو**- ا.ع(کوفڤ- kufv): وەک، هاوتا، هاوسەر.

**کفور**- ص.ع(کەفوور- kefûr): خوانەناس، ناشوکور، کافر.

**کفوف**- ا(کوفوف- kufûf): دەستان.

**کفه**- ا.ع(کەففە- keffe): تاکی تەرازوو.

**کفی**- ص.ع(کەفی- kefî): بەس، بەسیەتی.

**کفیدن**- مص.ل(کەفیدەن- kefîden): تەرەکین، تروکان، شەقبردن، درزبردن، زەنگبردن.

**کفیده**- ا.مف(کەفیدە- kefîde): شەقبردگ، تەرەکیو، ترووکاو، درزبردگ.

**کفیز**- ا(کەفیز- kefîz): قەفیز، پەیمانە.

**کفیل**- ص.ع(کەفیل- kefîl): کەفیل، زامن.

**کک**- ا.فر(کوک- kuk): خەڵووزی بەردین.

**ککچە**- ا(کەکچە- kekçe): لۆکە، ناوکی لۆکە.

**ککژ**- ا(کەکیژ- kekij): تەڕەتیزە.

**ککش**- ا(کەکیش- kekiş): تەڕەتیزە.

**کک مک**- ا(کەک مەک- kek mek): دەموچاو شملاوی.

**ککه**- ا(کەکە- keke): کخە، گوو.

**کل**- ص(کەل- kel): کەچەڵ.

**کل**- ا(کەل- kel): کەڵ، نێری، تەگە، ساورێن، حەیوانی نێری لە بابەتی گاو بەران و بزنە کێوی و کەڵە ئاسک.

**کل**- ص(کول- kul): کەچ، خوار، چەماوە، چەفت.

**کل**- ق.ع(کولل- kull): هەموو، سەرانسەر، سەرجەم، تەڤ.

**کل**- مص.ل.ع(کەلل- kell): ماندوو بوون، تەنگانەو مسیبەت.

**کلا**- ا(کەلا- kela): بۆق، قورباقە.

**کلا**- ا.ع(کەللا- kella): نا نەخێر، وانییە، نەء.

**کلائت**- مص.ع(کیلائەت- kilaet): پاراستن، ئاگاداریکردن.

**کلائو**- ا(کەلائوو- kelaû): بۆق، قورباقە.

**کلاب**- ا.ع(کیلاب- kilab): کسۆکان، سەیەل، سەگان.

**کلا برگ**- ا(کولابەرگ- kula berg): هەر گوڵێک پەڕەی زۆربێ وەکو گوڵی گوڵەبەڕۆژە.

**کلابه**- ا(کەلابە- kelabe): کلافە، کلافە دەزوو یان ئاوریشم، گلۆڵە.

**کلاپشت** -ا (کەلاپوشت- kelapuşt): فەرەنجی، کوڵەباڵ.

**کلاپیسه**- ا.مر(کەلا پیسە- kela pîse): قشقەڵە، قەلەڕەشکە، ئەبڵەق بوونی چاو لەتورەیی یان لەخۆشیدا(بۆ وێنە لە کاتی گاندا).

**کلات**- ا (کەلات- kelat): قەڵات.

**کلاته**- ا(کەلاتە- kelate): گوندو قەڵاتی بچووک، مەزاری بچووک.

**کلاجو**- ا(کەلاجو- kelacû): پیاڵە، پیاڵەی شەراب یان قاوە خواردنەوە.

**کلاچ**- ا.انگل(کلاچ- kilaç): کلاچی ئوتومبیل.

**کلارینت**- ا.فر(کیلارینیت- kilarînit): کلارنێت، ئامێرێکی مۆسیقایە.

**کلاژ**- ص(کەلاژ- kelaj): خێل، چاو چەپوخێل.

**کلاژه**- ا(کەلاژە- kelaje): قشقەڵە، قەلەباچکە، قەلەبازکە.

**کلاس**- ا.فر(کیلاس- kilas): پۆل، پلە، ریز، سنف.

**کلاسمان**- ا.فر(کیلاسمان- kilasman): ریزبەندی، پۆلێنکردن، ریکخستن.

**کلاسنگ**- ا(کەلاسەنگ- kelaseng): بەردەقانی، قەڵماسنگ، قۆچەقانی.

**کلاسور**- ا.فر(کیلاسور- kilasûr): فایل، دوو سێ.

**کلاسه**- ا.فر(کلاسە- klase): پۆلێنکردن، ریزبەندیکردن، خانەبەندی کردن.

**کلاسیک**- ص.فر(کیلاسیک- kilasîk): دەرسی، قوتابخانەیی، بەپێی یاساو رێسای پێشینان یەکەمین قوتابخانەو شێوازی ئەدەبی کە لە ئەوروپادا سەری هەڵداو لە ئەدەبیاتدا کەوتنە لاسایی کردنەوەی ئەدەبیاتی یۆنان و رۆم و بەوەیان دەگوت ئەدەبیاتی کلاسیک، واتا ئەدەبیاتێک کە دەبوایە وەکو دەرس و بە دەرس بخوێنرێو بکرێ بەسەر مەشق.

**کلاش**- ص(کەلاش- kellaş): وێڵ، بەرەڵلا، مفتەخۆر، جاڵجاڵۆکە

**کلاشکن**-ا(کەلاش کەن-kelaşken): شەکرلەمە، کێک.

**کلاغ**- ا(کەلاغ- kelax): قەلە باچکە، قەلەبازکە.

**کلاغ پر**- ا(کەلاغ پەر- kelaxper): زەردەپەڕ.

**کلاغ پیسه**- ا.مر(کەلاغ پیسە- kelaxpîse): قەشقەڵە.

**کلاف**- ا(کەلاف- kelaf): کلافە، گلۆڵە.

**کلافه‌شدن**- مص.ل(کەلافە شودەن- kalaf şuden): گێژبوون، سەرگەردان بوون.

**کلاک**- ا(کەلاک- kelak): تەپڵی سەر، ناوەندی سەر، دەشت و بیابان، بیابانێک لە وەرزی بارانا سەوز بێ و لە هاوینا وشک بێ.

**کلاک**- ص(کولاک- kulak): ناو بەتاڵ، پووک، پووت، پووچ.

**کلاک**- ا(کولاک- kulak): شەپۆلی گەورەی دەریا.

**کـلاکـمـوش**- ا.مـر(کـەلاک مـوش- kelak mûş): جرج، رسک.

**کلال**- ا(کەلال- kelal): ترۆپک، تەوقەسەر، ناوەندی سەر.

**کـلال**- ا.ص(کـولال- kulal): گـۆزەگـەر، سوالّەت ساز.

**کـــلال**- مـص.ل.ع(کــــەلال- kelal): ماندووبوون، شەکەتبوون.

**کـــلالت**- مص.ع(کــــەلالەت- kelalet): ماندووبوون، باب مردن، جەرگ سووتان.

**کلالە**- ا(کولالە- kulale): کاکۆڵ، پەرچەم.

**کلام**- ا.ع (کەلام- kelam): قسە، دەستەواژە یان رستەیەک کە مانای تەواو بدات.

**کلان**- ص(کەلان- kelan): زۆر، فرە، گەورە، مەزن، زەلام.

**کـلانتـر**- ص.ت(کـەلانتـەر- kelanter): گەورەتر، کۆمیسەر.

**کلانتر مرز**- ا.مر(کەلانتەری مەرز- kelanteri merz): کۆمیسەری مەرز.

**کلانتری**- ا(کەلانتەری kelanterî): لقێک لە دایەرەی ئەمن.

**کلانسال**- ص.مر(کـەلان سال- kelansal): پیر، زۆر گەورە.

**کـلائو**- ا(کـەلائوو- kelaû): جـرجـە کـوێرە، رسک.

**کـلاوه**- ص(کـەلاڤـە- kelave): گـێـژ، سەراسیمە، حەپەساو، سەرگەردان.

**کلاوه**- ا(کەلاڤە- kelave): کلافە، گلۆڵە.

**کلاه**- ا(کولاه- kulah): کڵاو.

**کـلاهبـردار**- ص.فـا (کـولاه بەردار- kulah berdar): دەستبرو کڵاوچی.

**کـلاهبرداری**- ا.مص(کـولاهبـەرداری- kulah berdarî): دەسبـڕی و کـڵاوچیـتی، بەدەست هێنانی شتێک لە ڕێگەی فرۆفێڵ و خاپاندنەوە.

**کلاهخود**- ا.مر(کولاه خوود- kulah xûd): کڵاو خود، خودە پۆڵایین.

**کـلاهدار**- ص.فـا (کـولاهدار- kulahdar): کڵاودار، پاشا.

**کلاهداری**- ا.مص(کولاهداری- kulah darî): پاشایەتی.

**کـلاهک**- ا(کـولاهەک- kulahek): کـڵاوی بچووک، کڵاوە.

**کلب**- ا(کـەلەب- keleb): دەم، لمۆز، دەنووکی مەل.

**کلب**- ا.ع(کـەلب- kelb): کـسـۆک، سـەگ، صەی.

**کلب**- ا.ع(کــــەلەب- keleb): تینوویەتی، حەسوودی، نەخۆشی هاری (سەگ یان مرۆڤ).

**کلبتـان**- ا.ع(کـەلبـەتان- kelbetan): گـاز، پلایس.

**کلبه**- ا(کولبە- kulbe): دوکان، کوخت.

**کلپـتـره**- ا.ص(کـەلپـەتەرە- kelpetere): قسەی قۆڕو بێ مانا.

**کلت**- ا(کــۆلت- kolt): کــۆڵت، جـــۆرە دەمانچەیەکە.

**کلته**- ص(کەلتە- kelte): حەیوانی پیـری لە کار کەتوو، حەیوانی کلک بڕیاگ، زمانگیر.

**کلثـوم**- ا.ص.ع(کــولســـووم- kulsûm): دەموچاو خرپن.

**کلج**- ا(کیلج- kilc): سەبەتەیەکی گەورەیە کە پەین و تەپاڵەو ڕیخی چوارپێــیــانی پێ گــرد دەکەنەوە بۆ سوتاندن، سەبەتەی حەمامچییان.

**کلج**- ا (کـــولج- kulc): زولفی لوول و پێچ پێچ.

**کلجـان**- ا(کـەلجـان- kelcan): زبلّـدان، سەرەنوێلک، گوفەک، سورکەوان.

**کلچ**-ا(کولچ -kulç): کولّەنجە ،

**کلچنگ** -ا.مـر (کـول چەنگ -kul çeng): قرژانگ، قرژاڵ.

**کلخج**- ا(کەلەخج- kelexc): چلک، چڵکی بەدەن، قرێژی.

**کلدان**- ص.ن(کەلدان- keldan): وڵات و سەر زەمینی کۆنی بەشی باشووری میزوپۆتامیا.

**کلر**- ا.فر(کولور- kulur): کولۆر.

**کلرا**- ا.فر(کولێرا-kulira ): نەخۆشی کولێرا.

**کلرات**- ا.فر(کولۆرات- kulurat): هەموو ئەسیدێکی کولۆریک.

**کلروفرم**- ا.فر(کولوروفورم-kulurûfurm): بەنج.

**کلرو فیل**- ا.فر(کولوروفیل- kulurufîl): مادەی کەسکی گیا.

**کلرومیستین**- ا.انگل(کولورومەیستین- kulurumeysitîn): جۆرە دەرمانێکە بۆ تیفو زۆر کاریگەرە.

**کلز**- ا(کیلز- kilz): ڕەگی درەختی هەناری کێوی.

**کلس**- ا.ع(کیلس- kils): قسڵ.

**کلسترول**- ا.فر(کولیستیرول- kulistirûl): کۆلسترۆڵ، جۆرە چەورییەکە لە مێشک و دەمارو جگەرو خوێن و زراودا پەیدا دەبێ و هەیە.

**کلسیوم**- ا.فر(کەلسیوم- kelsyûm): کالسیۆم.

**کلف**- ا(کەلەف- kelef): دەنووکی مەل.

**کلف**- ا.ع(کەلەف- kelef): ڕەنگی ڕەش و سووری تێکەڵاو، شملاوی.

**کلفت**- ص(کولوفت- kuluft): ئەستوور، درشت، قەبە.

**کلفت**-ا (کەلەفت- keleft): دەنووکی مەل.

**کلفت**- ا(کولفەت- kulfet): کارەکەر،

**کلفت**- ا(کولفەت- kulfet): ڕەنج و زەحمەت، تەنگانە، مەشەقەت.

**کلفە**- ا.ع(کولفە- kulfe): سووری تۆخ، لەکەی سووری تۆخ، ڕەشی بە سوور ئامێتە.

**کلفهشنگ**- ا(کەلەفەهشەنگ- kelefehşeng): چلورە سەهۆڵ، شووشە سەهۆڵ، شووشە سۆڵ.

**کلک**- ا (کیلک- kilk): نەیچە، قەڵەمی قامیش، قەڵەمی نووسین.

**کلک**- ا(کەلەک-kelek): نشتەر، ئاگردان، مەقلێ.

**کلک**- ص(کیلیک- kilik): خێل، چاو چەپ و خێل، خێل و قیچ.

**کلک**- ص(کەلەک- kelek): کەچەڵ، سەر رووتاوە.

**کلک**- ا(کەلیک- kelik): کوندەپەپوو، شووم، نەحس.

**کلک**- ا(کەلەک- kelek): جوانەگا، کەڵەگا.

**کلک**- ا(کەلیک- kelik): جۆرە زەلێکە حەسیری لێدروست دەکەن، لەبان.

**کلک**- ا(کەلەک- kelek): کەڵەک، چەپەری سەر کوندە بۆ پەڕینەوە لە ئاو.

**کلک**- ا(کەلەک- kelek): کەڵەک، فێڵ، نیرەنگ.

**کلکسیون**- ا.فر(کوللیکسیون- kulliksiyon): کۆمەڵە، دەستە، کۆمەڵە تابلۆیەک، کۆمەڵە پولێک.

**کل کل**- ا(کەل کەل- kel kel): چەنەبازی، هەرزە وێژی، لەوچەیی.

**کل کل کردن**- مص.م (کەل کەل کەردەن- kel kel kerden): چەنەبازی کردن و سەر یەشاندنی یەکتر.

**کلکل**- ا.ع(کەلەکەل- kelkel): سینە.

**کلکم**- ا(کەلکەم- kelkem): مەنجەنیق، ڕەنگین کەمان، پەلکە زێرینە.

**کلل**- ا(کەلەل- kelel): پەرێکە پاشایان و سەرداران و دلێران لە بەزما یان لە ڕەزما لە مێزەرەکانیان یان لە کڵاوەکانیان دەدا.

**کلم**- ا(کەلەم- kelem): کەلەرم.

**کلم**- ا.ع(کەلیم- kelim): پەیقان.

**کلمات**- ا.ع(کەلیمات- kelimat): وشە، وتەیان، پەیڤان.

**کلماسنگ**- ا(کەلماسەنگ- kelmaseng): قەلماسنگ، قۆچەقانی، بەردەقانی، کەهنیک.

**کلمرغ**- ا.مر(کەل مورغ- kel murx): سەرگەڕ، سیسارکە کەچەڵە، داڵەکەرخۆرە.

**کلمه**- ا.ع(کەلیمە- kelime): وشە، وتە، پەیڤ.

**کلن**- ا(کولەن- kulen): گلۆڵە پەمووی ئامادەکراو بۆ رستن، گلۆڵە.

**کلنبه**- ا.ص(کولونبە- kulunbe): کولیچە، هەر شتێکی درشت و ناهەموار.

**کلنج**- کیلەنج- kilenc): چلک، پۆخڵ، عوجب و لوتبەرزی، خۆ هەڵکێشان.

**کلنجار**- ا(کیلینجار- kilincar): قرژانگ، قرژاڵ.

**کلنجار**- ا(کەلەنجار- kelencar): شەروشۆڕ، جەنگ.

**کلند**- ا(کولەند- kulend): کلیل و کلۆمی دارین، قازمە، قولنگ.

**کلندر**- ص(کەلەندەر- kelender): زەلامی تۆکمەو زل، داری گەورەی نەتاشراو، پشتکۆڵ.

**کلندیدن**- مص.م(کەلەندیدەن- kelendîden): هەڵکەندنی زەوی.

**کلنگ**- ا(کولەنگ- kuleng): قازمە، قولینگ.

**کلنگ**- ا(کولەنگ- kuleng): قازی قولینگ، قورینگ.

**کلنل**- ا.فر(کولونیل- kulunil): کۆلۆنیل، سەرهەنگ.

**کلنی**- ا.فر(کولونی- kulunî): ولگە، کۆلۆنی، ولاتی داگیرکراو.

**کلوب**- ا.فر(کولوب- kulûb): یانە، ئەنجومەن، کۆمەڵە.

**کلوته**- ا(کولوتە- kulûte): کڵاوی بەلۆکەخنراوی تا سەر گوێچکان شۆڕ، کلێتە.

**کلوچه**- ا(کولوچە- kulûçe): کولیچە.

**کلوخ**- ا(کولووخ- kulûx): کەستەک، سندە، هێرک.

**کلوخ انداز**- ص.فا(کولووخ ئەنداز- kulûx endaz): کەستەک ئەنداز، کەستەک هاوێژ.

**کلوخه**- ا(کولووخە- kulûxe): کەستەک ئاسا.

**کلوس**- ا(کولووس- kulûs): ئەسپێک کە چاو و لمۆزی سپی بێ و بەشوومی دەزانن.

**کلوک**- ا.ص(کەلووک- kelûk): پارچە کەرپوچ، سواڵەت.

**کلوک**- ا.ص(کەلووک- kelûk): منداڵ، کوڕی بچووک.

**کلول**- ا(کەلوول- kelûl): گاگۆز، پۆڵکە.

**کلول**- مص.ل.ع(کولوول- kulûl): شەکەتبوون، ماندووبوون، سستبوون.

**کلون**- ا(کولوون- kulûn): کلیل و کلۆمی دەرگای دار.

**کلوند**- ا.ص(کەلڤەند- kelvend): زرکەتاڵ، خەیار، خەیاری تۆو.

**کلوه**- ا.ع(کولڤە- kulve): گورچیلە.

**کله**- ا(کولەه- kuleh): کلاو.

**کله**- ا(کەللە- kelle): کەللە، کولۆخ، کەپۆڵ، سەر، سەری مرۆڤ.

**کله**- ا(کوللە- kulle): کاکۆڵ.

**کله**- ا.ع(کیللە- kille): پەردە، روپۆش، کوللە.

**کلی**- ا(کولی- kulî): دەف، دایەرە.

**کلی**- ا(کولی- kulî): گولی، خۆرە.

**کلی**- ا.فر(کولی- kulî): بەستە، بەستەیەک بە پۆستدا بنێردرێ.

**کلی**- ص.ن.ع(کوللی- kullî): هەموو، گشتی، تەڤ.

**کلیاس**- ا(کیلیاس- kilyas): دەربار، بەر ماڵان، ئاو دەستی سەربان.

**کلیاوە**- ص(کەلیاڤە- kelyave): کەڕ، گێژ، سەرگەردان، گەوج، ئەحمەق، کەودەن.

**کلیتین**- ا.ع(کولیەتەین- kulyeteyn): جووتە گورچیلە.

**کلیچە**- ا(کولیچە- kulîçe): کولەنجە.

**کلیچە**- ا(کولیچە- kulîçe): کولیچە، نان، کولێرە.

**کلید**- ا(کەلید- kelîd): کلیل.

**کلیدان**- ا(کەلیدان- kelîdan): قفڵ، کولۆم.

**کلیز**- ا(کەلیز- kelîz): زەردەزیرە، ژەنگەسوورە، زەردەواڵە، سێرەمووزە.

**کلیزدان**- ا.مر(کەلیزدان- kelîzdan): شارە زەردەواڵە، شارە سێرەمووزە.

**کلیزە**- ا(کەلیزە- kelîze): گۆزە، جەرە.

**کلیسا**- ا(کیلیسا- kilisa): کڵێسا، پەرستگەی مەسیحیان.

**کلیشە**- ا.فر(کیلیشە- kilîşe): کلێشە.

**کلیک**- ص(کەلیک- kelîk): خێل و قێچ.

**کلیک**- ا (کیلیک- kilîk): تووتە، قامکە چکۆڵەی دەست یان پێ.

**کلیک**- ا(کەلیک- kelîk): کوندە پەپوو، بایەقوش، چوغد.

**کلیل**- ص.ع(کەلیل- kelîl): ماندوو، دڵشکاو، بێ توانا، کەسێک چاوی باش نەبینێ.

**کلیلە**- ا(کەلیلە- kelîle): ناوی ڕێوییەکە کە داستانی وی لە کتێبی کەلیلەو دیمنەدا نووسراوە.

**کلیم**- ص.ع(کەلیم- kelîm): نازناوی حەزرەتی موسایە، هاودەم.

**کلیمی**- ص.ن(کەلیمی- kelîmî): پەیڕەوانی حەزرەتی مووسا، جوولەکە.

**کلینیک**- ا.فر(کیلینیک- kilînîk): نەخۆشخانە، دەرمانخانە، تیمارستان.

**کلیواژ**- ا(کەلیڤاژ- kelîvaj): کوڵارەی جوجگ خۆر.

**کلیون**-ا (کولیون- kulyun): جلی حەوت ڕەنگ، دێوجامە.

**کلیە**- ا.ع(کولیە- kulye): گورچیلە.

**کلیە**- ا.فر(کولیە- kulye): گەردنبەن، ملوانکە، گەردانە، خەناوکە.

**کم**- ص(کەم- kem): کەم، قیچەک، کەمێک، بڕەک.

**کم**- ا.ع(کوم- kumm): قۆڵی کراس.

**کم**- ا.ع(کەمم- kemm): بڕ، ئەندازە، گوژم.

**کما**- ا(کوما- kuma): کەما..

**کما**- ق.ع(کەما- kema): هەروەها، هەروەسا، هەرئەچنەو، هەر ئەلیوا.

**کما**- ا.فر(کوما- kuma): نەخۆشی شەکرە، فێ لێهاتن، بوورانەوە، مەستی و بێهۆشی.

**کمابیش**- ق(کەمابیش- kemabîş): کەم تا زۆر، کەم دابێژێک.

**کمأ**- ا.ع(کەمە‌ء- keme’): دۆمەڵان.

**کماج**- ا(کوماج- kumac): سەموون، کولێرە.

**کماج خیمە**- ا.مر(کوماجی خەیمە- kumacî xeyme): کۆماجی ڕەشماڵ.

**کماجدان**- ا.مر(کوماجدان- kumacdan): مەنجەڵی مسی گەورە، لەنگەری.

**کمادریوس**- ا(کەمادەریوس-kemaderyûs): جۆرە ڕووەکێکە.

**کماس**- ا(کەماس- kemas): گۆزەی سواڵەتی زارپەل، کاسەی دارین، کەشکۆڵ.

**کماشیر**- ا(کوماشیر- kumaşîr): سەمغی کەرەوزی کێوی، کەتیرە.

**کمال**- مص.ل.ع(کەمال- kemal): تەواو بوون، لاپ.

**کمالە**- ص(کومالە- kumale): خوارو خێچ، چەفتوچێڵ.

**کمان**- ا(کەمان- keman): کەوان.

**کمانچولە**- ا.مر(کەمانچوولە-kemançûle): کیفی کەوان.

**کمانچه**- ا(کەمانچە- kemançe): کەوانۆکە، ئامێرێکی مۆسیقایە.

**کماند**-ا.فر(کوماند- kummand): فەرمان، راسپاردن.

**کماندار**- ص.فا(کەماندار- kemandar): تیرەنداز.

**کماندان**- ا.مر(کەماندان- kemandan): تیردان، سەنوقی کەوان.

**کماندان**- ا.فر(کوماندان- kummandan): فەرماندە، سەرکردە، قوماندان.

**کماندو**- ا.فر(کوماندوو- kummandû): کۆماندۆ.

**کمان رستم**- ا.مر(کەمان روستەم- keman rustem): سیمینەو زەرینە، کوڵکەزێرینە، پەلکە رەنگینە.

**کمانگر**- ص.فا(کەمانگەر- kemanger): کەوانساز، وەستای دروستکردنی کەوان.

**کمان گروهه**- ا.مر(کەمان گورووهە- kuman gurûhe): کەوانی گلاهەک.

**کمانگیر**- ص.فا(کەمانگیر- kemangîr): تیرەنداز، کەواندار.

**کمانه**- ا(کەمانە- kemane): کەوان ئاسا.

**کماهه**-ا(کوماهە- kumahe): بازو بەند، دوعا، چاوەزار.

**کمبزه**- ا(کومبوزە- kumbuze): میوەی کاڵ و نەگەییوو، کرچ.

**کمبود**- (کەمبوود- kembûd): کەم بوون، کەمی، کەم هێنان لە ژمارەدا یان لە کێشانەدا.

**کم بها**- ص.مر(کەم بەها- kem beha): بێ نرخ، کەم نرخ.

**کمبیزه**- ا(کومبیزە- kum bîze): زرکە کاڵەک، خەیاری گەورەو زەرد.

**کمپ**- ا.فر(کەمپ- kemp): ئۆردوگا، خێوەتگە، کەمپ.

**کمپانی**- ا.فر(کومپانی- kumpanî): کۆمپانی، کۆمپانیا.

**کمپرس**- ا.فر(کومپریس- kumpris): کەمادە.

**کمپرسور**- ص.فر(کومپریسەر- kumpriser): کۆمپرێسەر، مەنگەنە.

**کمپلت**- ص.فر(کومپلیت- kumplit): کۆمپلیت، تەواو، لاپ.

**کمپلکس**- ص.فر(کومپلیکس- kumpliks): جۆراو جۆر، تێکەڵاو، کۆمەڵێک مادەی نزیک لە یەکدی.

**کمپوت**- ا.فر(کومپووت- kumpût): مرەبای میوەی لەقوتو کراو.

**کمپوزیتور**- ا.فر(کۆمپۆزیتۆر- kompotzîtor): ئاوازدانەر.

**کمپوزیسیون**- ا.فر(کومپۆزیسیون- kompozisyûn): تێکەڵە، پێکهاتەی شتان، داهێنان.

**کمپیر**- ص(کەمپیر- kempîr): پیری بە ساڵاچوو، ژنی زۆر پیر.

**کمپیوتر**- ا.نگل(کەمپیوتەر- kempîyuter): کۆمپیوتەر.

**کمتر**- ص.ت(کەمتەر- kemter): کەمتر.

**کمترین**- ص.ت(کەمتەرین- kemterîn): کەمترین.

**کمثری**- ا.ع(کومەسرا- kummesra): هەرمێ.

**کم خونی**- ا.مر(کەم خوونی- kemxûnî): کەم خوێنی.

**کمدی**- ا.فر(کومودی- kummudi): کۆمەدی، سەندووق.

**کم دل**- ص.مر(کەم دیل- kem dil): ترسنۆک، بێ زات.

**کمدی**- ا.فر(کۆمیدی- komidî): کۆمیدی، نمایشی خەندەدار، نووسینی خەندەدار.

**کمدین**- ص.فر(کۆمیدیەن- komidiyen): ئەکتەرێک کە لە نمایشنامەێن کۆمیدی دا یاری بکات.

**کمر**- ا(کەمەر- kemer): پشت، کەمەر.

**کمرا**- ا(کەمرا- kemra): حەیارە، تەویلەی چوارپێیان، کەمەربەند، گومڕا.

**کمربستن**- مص. ل(کەمەر بەستەن- kemer besten): کەمەر، پشت بەستن، ئامادەبوون بۆ کارێک.

**کمربستە**- ص.مف(کەمەربەستە- kemer beste): نۆکەر، خزمەتکار، تەیار، سازو ئامادەی خزمەت.

**کمربند**- ا.مر(کەمەربەند- kemer bend): پشتێن، قەیوەن.

**کمرچین**- ا.مر(کەمەرچین- kemerçîn): جلێک لە ناوەڕاستدا چیندار بێ.

**کمرشکن**- ص.فا(کەمەر شیکەن- kemer şiken): کەمەرشکێن، پشتشکێن، کاری زۆر قورس، کارێک هێندە قورس بێ بنیادەم لە عۆیەی نەیەت.

**کەمەرکش**-ا.ص(کەمەرکەش-kemerkeş): پیاوی ئازاو عەگیدو بوێر، سەری چیا.

**کمرگاە**- ا.مر(کەمەرگاە- kemergah): جێی پشتێن.

**کم رو**- ص.مر(کەم روو- kemrû): شەرمن، بە شەرم، بێ روو.

**کمری**- ص.ن(کەمەری- kemerî): ئەسپی ناو قەد باریک، ناو قەدی.

**کمزن**- ص(کەمزەن- kemzen): بێ یەغبالْ، کەسێک هەمیشە لە قومارا بدۆڕێ.

**کمسال**- ص.مر(کەم سال- kemsal): لاو، گەنج، خورت، خرت.

**کمسکم**- ا(کەمەسک- kemesk): تۆراخ.

**کمک**- ا(کومەک- kumek): کۆمەک، هاوکاری.

**کم کم**- ق(کەم کەم- kem kem): کەم کەم، نەختە نەختە، تۆزە تۆزە.

**کم کم**- ا(کوم کوم- kum kum): دەنگی قولْینگی بیر هەلْکەن.

**کمل**- ا.ع(کەمەل- kemel): لاپ، تەواو، بێ کەم و زیاد.

**کملکان**- ا(کەمەلکان- kemel kan): جۆگەی بچووک.

**کملی**- ا(کەملی- kemlî): جلی خوری زبر.

**کمند**- ا(کەمەند- kemend): پەت، پەتی درێژ، حەبلی ئەستوورو درێژ کە بۆ گرتنی مرۆڤ یان حەیوان بەکار دێ، کەمەند.

**کمون**- مص،ع(کوموون- kumûn): پەنهانبوون، دیارنەمان، پێواربوون.

**کمون**- ص.فر(کۆمۆن- kommûn): هاوبەش، گشتی، کۆمۆنە.

**کمونیست**- ص.فر(کۆمۆنیست- komûnist): کۆمۆنیست، شیوعی، پەیڕەوی کۆمۆنیزم.

**کمونیسم**- ا.فر(کومونیسم- kommûnîsm): کۆمۆنیزم، ڕێبازی سوسیالیستی.

**کمە**- مص.ل.ع(کەمەھ- kemeh): کوێربوون، نابینابوون، شەوکوێری.

**کمی**- ا(کەمی- kemî): کەمین، بۆسە.

**کمی**- ص.ع(کەمیی- kemî): ئازا، دلێر، عەگید، کەسێک جلی شەڕی لەبەر بێ، خودە لەسەر.

**کمیاب**- ص(کەمیاب- kemyab): هەر شتێ کەم بێ و بە ئاسانی دەستنەکەوێ، دەگمەن.

**کمیت**- ا.ع(کومەیت- kumeyt): ئەسپی کوێت، شەراب، ڕەشی ئامالْ سوور.

**کمیت**- ا.ع(کەمیەت- kemmiyet): چەندی.

**کمیتە**- ا.فر(کۆمیتە- komîte): کۆمیتە، لیژنە.

**کمیچە**- ا(کەمیچە- kemîçe): گولْە ئەستێرە، کەمانچە.

**کمیز**- ا(کومیز- kumîz): پیشاو، میز.

**کـمـیـسـاریا**- ا.فـر(کـومیـسـاریا- kommisariya): کەلانتەری.

**کـمیسر**- ا.فر(کۆمیسەر- kommîser): سەرداروغە، داروغەباشی، کەلانتەر.

**کـمیسیون**- ا.فر(کۆمیسیون- kommisyûm): دەستە، ئەنجومەن.

**کمیک**- ص.فر(کۆمیک- komîk): کۆمیدی، ئەکتەر یان نووسەری کۆمیدی.

**کـمیل**- ا.ع(کـومەیل- kumeyl): کـورت کراوەی کـامیلە، نازناوی یەکـێکە لە یاوەرانی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

**کمین**- ا.ع(کەمین- kemîn): کەمین، بۆسە.

**کمین**- ص.ن(کەمین- kemîn): کەمترین.

**کمینگاه**- ا.مر(کەمینگاه- kemîngah): جێی کەمین.

**کمینه**- ص.ن(کەمینە- kemîne): کەمتر، کەمترین، بێ بەها.

**کن**- ا(کین- kin): تەقەڵ، تەقەڵی درومان.

**کنا**- ا(کەنا- نا-kena): مەرز، سنوور، کەنار.

**کنا**- ص.فا(کونا- kuna) بکەر.

**کنائس**- ا.ع(کەنائیس- kenais): کلێسان.

**کنار**- ا(کەنار- kenar): قەراغ، ڕەخ، کەنار، لێوار.

**کنار**- ا(کونار- kunar): کونار: درەختێکە.

**کنارنگ**- ا.ص(کـونارەنگ- kunareng): حاکم، والی، خونکار، فەرمانڕەوا.

**کناره**- ا(کـەنارە- kenare): کـەنار، ڕەخ، قەراخ.

**کنارەگرد**- ص.فـا(کـەنارەگـەرد- kenare gerd): کەنارەگیر، دوورەپەرێز.

**کنارەگرتن**- مص.ل(کەنارە گیریفتەن- kenare giriften): کەنارگرتن، ، دوورەپەرێزبوون.

**کنارەگیر**- ص.فا(کەنارەگیر- kenaregîr): گۆشەگیر، دوورەپەرێز، تەریک بوون.

**کناز**- ا(کـەناز- kenaz): بن و بێـخی بۆڵی خورما.

**کناس**- ا.ع(کـیناس- kinas): لانەی ئاسک، حەشارگەی ئاسک.

**کناس**- ص.ع(کەنناس- kennas): کوچەماڵ، کەناس، زبڵڕێژ.

**کناغ**- ا(کـوناغ- kunax): داوی ئاوریشم، جۆلاتەنە، داپیرۆشک.

**کناک**- ا(کەناک- kenak): زگ یەشە.

**کنام**- ا(کـونام- kunam): لەوەڕگـەولانە، لانەی گیانلەبەرانی دڕندە.

**کنانه**- ص(کەنانە- kenane): کۆنە.

**کنانه**- ا.ع(کینانە- kinane): تیردان.

**کنایه**- مص.ع(کینایە- kinaye): وشەیەک بۆ مـانای حـەقـیـقی خـۆی بەکـار نەهێنرێ. توانج پۆشی، وەک «سیاکاسە» کە مەبەست لە بەغیل و پیسکەیە.

**کنب**- ا(کـەنەب- keneb): ڕووەکـێکە، شادانە.

**کنبوره**- ا(کەنبورە- kenbûre): فێڵ و حیلە، تەڵەکەبازی.

**کنبیزه**- ا(کونبیزە- kunbîze): زرک، کرچ، کاڵەکی نەگەییوو.

**کنتاک**- ا.فر(کۆنتاک- kontak): تەماس.

**کنترات**- ا.فر(کۆنترات- kontrat): قەرارداد، بەڵێندان، پەیماننامە، قەولنامە، قۆنتەرات.

**کنتـراست**- ا.فـر(کـۆنتـراست- kontrast): کۆنتراست، جیاوازی هەست و بیرو ڕەنگان.

**کنتـرباس**- ا.فـر(کـونتـرباس- kontrbas): چەلۆ، ئامێرێکی مۆسیقایە.

**کنترول**- ا.فر(کۆنترۆڵ- kontrol): کۆنترۆڵ، تەفتیش.

**کنتـرلر**- ا.فـر(کـۆنتـرۆلۆر- kontrolor): مـوفەتیش، تیـتی، بلیت بڕی شانۆ، سینەمـاو قیتار.

**کنج**- ا(کونج- kunc): گۆشە، کونج، قانچە، چرچ و لۆچ، قوژبن.

**کنج**- ا(کەنج- kenc): زمانە چکۆڵەی مرۆڤ.

**کنج**- ص(کەنج- kenc): بەکەلەش، تۆکمەو زەلام.

**کنجار**- ص(کەنجار- kencar): تلپە.

**کنجد**- ا(کونجید- kuncîd): رووەکێکە، کونجی.

**کنجده**- ا(کونجیدە- kuncide): عەنزەرووت.

**کنجک**- ص(کونجەک- kuncek): تازە، نوێ، جوانە.

**کنجک**- ا(کەنجەک- kencek): نارەوەند، درەختێکە.

**کنجکاو**- ص.فا(کونجکاڤ- kunckav): کونجکاو، کنوکۆکار، بە دیقەت و ورد، کۆلەر.

**کنجل**- ص(کونجول- kuncul): کەچوکۆڵ.

**کنجه**- ا(کینجە- kince): جۆرە تکەیەکی گۆشتە.

**کنجه**- ص(کونجە- kunce): کەری کلک بریاگ.

**کنجه**- ا.فر(کۆنجە- konce): مۆڵەت، مادونی، ئیجازە.

**کنجیده**- ا(کونجیدە- kuncîde): تلپە.

**کنخت**- ا(کەنەخت- kenext): جەوهەری شمشێر، شمشێری ئاودار.

**کند**- ص(کوند- kund): هێواش و لەسەرخۆ، چەقۆی تیغکول.

**کند**- ا(کوند- kund): کۆتەرەداری قەوی و گەورە.

**کند**- ص(کوند- kund): ئازا، دلێر، عەگید، قارەمان، پاڵەوان.

**کند**- ا(کەند- kend): قەند.

**کندا**- ص(کوندا- kunda): فەیلەسوف، پیتۆل، زانا، پەندیار، سیحرباز، دلێری و ئازایەتی.

**کنداگر**- ص(کونداگەر- kundager): پیتۆل، پەندیار، زانا، دلێر، ئازا.

**کندامویه**-ا.مر(کوندامویە- kunda mûye): موی مادەرزاد، موویەک لە کاتی لە دایکبوونی منالا لە بەدەنیدابێ.

**کنداور**- ص(کونداڤەر- kunda ver): جەنگاوەر، عەگید، ئازا.

**کنداوری**- ا.مص(کونداڤەری- kundaverî): دلێری، گەورەیی.

**کندر**- ا(کوندور- kundur): جۆرە کەتیرەیەکی بۆنخۆشی هەندێ درەختە.

**کندر**- ا(کەندەر- kender): شار.

**کندررومی**- ا.مر(کوندور رومی- kundur rûmî): خاو رەو، مەستەکی، سەمغێکی بۆنخۆشە لە هەندێ درەخت و رووەکان دەگیرێ.

**کندرو**- ص.فا(کوندرەو- kundrew): خاورەو، پێچەوانەی تیژرەو.

**کندز**- ا(کون دیز- kundiz): کۆنەقەلا.

**کندس**- ا(کوندوس- kundus): جۆرە رووەکێکە.

**کندش**- ا(کوندیش- kundiş): گلۆلە پەموی ئامادە بۆ رستن، دەستپێچکەپەموو.

**کندک**- ا(کوندەک- kundek): ورتکەنان.

**کندلان**- ا(کەندولان- kendulan): خێوەتی گەورە، سەراپەردە.

**کندمند**- ص.(کەندمەند- kendmend): وێرانە، خەرابە، عەمارەتێ داروخابێ و وێران بووبێ.

**کندن**- مص.م(کەندەن- kenden): هەڵکەندن، چەکاندن، لێک کردنەوەی دوو شتی پێکەوە چەسپاو.

**کننده**- ا.فا(کەنەندە- kenende): هەڵکەن، کەسێک شتێک لە شوێنێ هەڵکەنێ.

**کنده**- ا.مف(کەندە- kende): هەڵکەنراو، جێ لەقکراو.

**کندو**- ا(کـــەندوو- kendû): شـــانەی مێشەنگان.

**کندواله**- ص(کوندڤـالە- kundvale): لاوی بەهێز.

**کندوره**- ا(کـەندورە- kendûre): سـفـرەی چەرمی گەورە.

**کندوکاو**-ا٠مص(کەندوکاو-kendûkaw): لێکۆڵینەوە، تۆژینەوە، پشکنین

**کندوکوب**- ا.مص(کەندوکووب-kendûkûb): ئاژاوە، فەرتەنە، هەڵکەندن و کوتانەوە.

**کندوله**- ا(کەندولە- kendûle): شانەی مێش هەنگ.

**کنده**- ا(کـــوندە- kunde): کـــۆتەرەدار، پارچەداری ئەستور.

**کنده زانو**- ا.مـــر(کـــوندەی زانوو- kundey zanû): سەری ئەژنۆ، کەشکەژنۆ، سەری زرانی.

**کنده‌کاری**- ا.مص(کەندەکاری-kendekarî): کەندەکاری، کەندنی نەخش و نیگار لەدار.

**کنده‌ورش**- ا.مـــــر(کـــــەندەڤـــــەرەش- kendevereş): کەندولەند، کەندو قۆرت.

**کنز**- ا.ع(کەنز- kenz): گەنج، خەزنە.

**کنز**- ا (کەنەز- kenez): بن و بێخی هێشوی خورما.

**کنسرت**- ا.فــر(کــونســیــرت- kunsirt): ئاهەنگێکی مۆسیقی کە بەئامێری جیاوازی مۆسیقا بەشێوەی هاوئاهەنگ لێ بدرێ، کۆنسێرت.

**کنسرتو**- ا(کونسیرتوو- kunsirtû): کۆنسێرتۆ، ئاهەنگێکی مۆسیقایە لە بابەتی سەمفۆنیا.

**کنسرسیوم**- ا.فــر(کــونســورســیــوم- kunsursiyum): کۆمپـانیـایەکی گـەورەی لە چەند کۆمپانیایەک پێک هاتوو.

**کنسرو**- ا.فر(کونسیرڤ- kunsirv): مـرەبا، مرەبای قوتو.

**کنسرواتوار**- ا.فــر(کــونســیــرڤــاتوئار- kunsirvatûar): خــوێندنگـەی تایبــەت بە مۆسیقا یان شانۆ.

**کنسک**- ص(کـــینیـــســـک- kinisk): قرچۆک، رەزیل، رژد، پیسکە.

**کنسول**- ا.فر(کونسوول- kunsûl): کونسول، نوێنەری دەوڵەت لە شارێکی بێگانەدا کـە ئەرکی بە کاروباری هاووڵاتیانی خۆیدا گەییشتنە.

**کنســـول گـــری**- ا(کـــونســـول گـــەری- kunsûlgerî): کـونسـولخـانە، ئۆفـیـسی کونسول.

**کنسولتاسیون**- ا.فر(کونسول تاسیون- kunsûl tasyûn): گەنگەشە، راوێژو تەگبیر.

**کنسولیار**- ا.مر(کونسـوڵیـار- kunsûlyar): جێگری کونسول.

**کنش**- ا.مص(کـونیش- kuniş): کـار، کـردار، ئیش.

**کنشت**- ا (کـــونیـــشـت- kunişt): دێر، ئاتەشگەدە، پەرستگەی مەسیحیان، پەرستگەی جولەکان، کلێسا.

**کنشـــتـو**- ا(کــەنەشــتـــوو- keneştû): ئەسپوون.

**کنغاله**- ص(کـینغـالە- kinxale): مناڵباز، هەتیوباز.

**کنف**- ا(کەنەف- kenef): جۆرە رووەکێکە.

**کنف**- ا.ع(کـەنەف- kenef): سـایە، باڵی مەل، قەراخ، کەنار، لێوار، رەخ.

**کنفت**- ص(کینیفت- kinift): چڵکن، پیس، زایە، شەرمەزار.

**کنفدراسیون**- ا.فـر(کـون فـیـدراسـیـوون- kunfidirasyûn): کۆندفیدراسیون، یەکێتیی چەند ناوچەیەک کـە بە هەمـوویان یەک دەوڵەت پێک بهـێنن، بەڵام هەر یەکـێک لەو ناوچانە خۆیبوونی داخلی خۆی هەبێ.

**کنفرانس**- ا.فـر(کـونفـرانس- kunfrans): کـۆنفـرانس، وتاربێــژی، کـۆبوونەوە دەربارەی مەسەلەیەک.

**کنک**- ص(کینیک- kinik): گـوێزی سەخت، رژد، رەزیل ، ئاڵچاخ، پیسکە.

**کنکاش**- ا(کەنکاش- kenkaş): گەنگەشە، راوێژو تەگبیر.

**کنکاشستان**- ا.مر(کەنکاشیستان- kenkaşistan): ئەنجومەنی راوێژکاران، شوێنی راوێژو تەگبیران.

**کنکور**- ا.فر(کونکوور- kunkûr): قەرەباڵغی و خڕبوونەوەی کۆمەڵێک کە بۆ یەک شوێن بچن، هاوئاهەنگی، هاوکاری، پێشبڕکێ، هەڤڕکی، تاقیکردنەوە.

**کنگ**- ا.ص(کەنگ- keng): باڵ، باڵی مەل، چڵ، لقی درەخت، سایە.

**کنگ**- ا.ص(کینگ- king): بێ شەرم، لووسکە، کوڕی بە هەیکەل.

**کنگر**- ص(کونگور- kungur): گەدای پڕ روو، دەرۆزەچی روودار، کوندەپەپوو.

**کنگر**- ا(کەنگەر- kenger): کنگر.

**کنگر فرنگی**- ا.مر(کەنگەر فەرەنگی- kenger-ferengî): جۆرە سەوزەیەکە دەخورێ.

**کنگره**- ا(کونگورە- kungure): مۆرەی سەر دیوار.

**کنگره**- ا.فر(کونگرە- kungre): کۆنگرە.

**کنگری**- ا(کینگیری- kingirî): جۆرە سازێکە لە هندوستاندا باوە.

**کنند**- ا(کەنەند- kenerd): جۆرە بێلێکی سەر کەچە درکی پێ هەڵدەکەنن، پاچ.

**کنو**- ا(کەنەو- kenew): جۆرە رووەکێکە.

**کنوچه**- ا(کەنەوچە- kenewçe): گیایەکی بۆنخۆشە.

**کنود**- ا.مص.ع(کونود- kunûd): ناشوکری کردن، کفری نیعمەت.

**کنود**- ص.ع(کەنوود- kenûd): ناشوکر، یاخی، بەدنمەکی، بەغیل.

**کنودانه**- ا.مر(کەنوودانە- kenûdane): شادانە.

**کنور**- ا(کەنوور- kenûr): کەندووی دانەوێڵە، شانەی مێش هەنگ.

**کنور**- ا(کونوور- kunûr): هەورە تریشقە.

**کنوز**- ا.ع(کونووز- kunûz): گەنج، کەنز، خەزنە.

**کنوزه**- ا(کەنووزە- kenûze): پەمووی خۆشەکراو.

**کنون**- ق(کونون- kunûn): ئێستا، نهۆ، نها، هەنووکە، ئیرەنگە.

**کنه**- ا(کەنە- kene): گەنە.

**کنه**- ا(کونە- kunne): ساباتٍ، سێبەر، ئاسمانەی سەر دەرگای ماڵەوە، پلیتەی چرا.

**کنه**- ا.ع(کونه- kunh): جەوهەر، ئەسڵ، حەقیقەت و ئەنجامی شتێک.

**کنی**- ا.ع(کونا- kuna): کونیە، لەقەب، نازناو.

**کنی**- ا.ص.ع(کەنیی- kenî): هاو لەقەب، دوو کەس لەقب و کونیەیان وەکو یەک بێ.

**کنیاک**- ا.فر(کونیاک- kunyak): کۆنیاک، جۆرە خواردنەوەیەکی گرانبەهایە.

**کنیز**- ا.ص(کەنیز- kenîz): کەنیزەک، کارەکەر، قەرەواش.

**کنیزک**- ا.ص(کەنیزەک- kenîzek): کەنیزی منداڵکار، کەم تەمەن.

**کنیس**- ا.ع(کەنیس- kenîs): پەرستگەی جوولەکان.

**کنیسه**- ا.ع(کەنیسە- kenîse): کڵێسا، پەرستگەی مەسیحییان.

**کنیه**- ا.ع(کونیە- kunye): لەقەب، نازناو.

**کو**- (کوو- kû): ئامرازی پرسیار، کوا.

**کو**- ص(کەو- kew): زیرەک، بە ئاوەز، دلێر، قارەمان.

**کوار**- ا(کەڤار- kevar): سەبەتەی میوە، قەرتاڵە،بەرچنە.

**کوارتت**- ا.فر(کوئارتیت- kuartit): بەرهەمێک کە بۆ چوارساز یان چوار نەواژەن دروستکرابێ.

**کوارتز**- ا.فر(کوئارتز- kuartz): بەردێکە لە بلوور دەچێت.

**کوارث**- ا.ع(کەڤاریس- kevaris): کارەسات، بەڵاو مسیبەت، وەیشوومە.

**کواز**- ا(کەڤاز- kevas): گۆزە.

**کواژ**- ا(کەڤار- kevaj): تانە، سەرزەنشت، شۆخی، سوعبەت، گاڵتە.

**کواسر**- ا.ع(کەڤاسیر- kevasir): باڵندەێن شکاری.

**کواش**- ا(کوڤاش- kuvaş): جۆر، تەرز، تەرح.

**کواعب**- ص.ع(کەڤائیب- kuvaib): ژنانی مەمک هەنار.

**کواکب**- ا.ع(کەڤاکیب- kevakib): ئەستێران، هەسارەکان.

**کوالیدن**- مص.ل(کوڤالیدەن- kuvalîden): نەشوغما کردن، گەشەکردن، پاشەکەوت و کۆکردنەوە.

**کوئیور**- ا.فر(کوئیڤەر- kuiver): مس.

**کوب**- ا.ع(کوب- kûb): گۆزە، جام.

**کوب**- ا(کووب- kûb): ئازار، ئاسیو، شیشی لێخورینی فیل.

**کوب**- ا(کووب- kûb): شەش پالۆ، هەشت گۆشە.

**کوبال**- ا(کوبال- kûbal): برۆکراوەو مل ئەستور، گورز، ئەستوون.

**کوبش**- ا.مص(کوبیش- kûbiş): کوتان.

**کوبل**- ا(کووبەل- kûbel): شکۆفە، خونچە، پونگە.

**کوبن**- ا(کووبەن- kûben): چەکوش.

**کوبە** ا(کووبە- kûbe): چەکوش، کوتەک.

**کوبیدن**- مص.م(کووبیدەن- kûbîden): کوتین، لێدانی شتێک بە چەکوش یان بەرد.

**کوبندە**- ا.فا(کووبەندە- kûbende): کەسێک شتێک بکوتێ، کوتەر، لێدەر.

**کوبیدە**- ا.مف(کووبیدە- kûbîde): کوتراو، لێدراو.

**کوبیسم**- ا.فر(کووبیسم- kûbîsm): کوبیزم، جۆرە نیگارکێشییەکە کە لەلایەن بیکاسۆوە داهێنراوە.

**کوبین**- ا(کووبین- kûbîn): گەڵا کوتک.

**کوپارە**- ا(کووپارە- kûpare): گاگەل.

**کوپال**- ا(کووپال- kûpal): برۆکراوەی مل ئەستوور، ئەستون، گورز.

**کوپک**- ا(کووپیک- kûpik): کۆپیک، پارەی باوی روسی.

**کوپلە**- ا(کووپەلە- kûpele): شکۆفە، کاکۆڵ، قفڵ، قوببە.

**کوپن**- ا.فر(کووپون- kûpun): کۆپین، بەش.

**کوپە**- ا.فر(کووپە- kûpe): جۆرە گالیسکەیەکە، فارگۆن.

**کوت**- ا(کوت- kût): کەڵەکە، کۆمەڵە، کۆمەڵەبەرد.

**کوتار**- ا(کوتار- kûtar): داڵان.

**کوتاە**- ص(کوتاە- kûtah): بچووک، منداڵ، کورت، دریغی و تەخسیر.

**کوتوال**- ا(کوتڤال- kûtval): پاسەوانی قەڵا، دژوان.

**کوتولە**- ص(کوتولە- kûtûle): کولەباڵا، شەمۆلە، گرگن.

**کوتە**- ص(کووتەهـ- kûteh): کورت، کوڵ.

**کوثر**- ا.ع(کەوسەر- kewser): هەر شتێکی زۆرو فرەو کەڵەکەبوو، کەسی گەورەی بەخشندەو خێرخواز، ناوی رووبارێکی بەهەشتە.

**کوچ**- ا(کووچ- kûç): کوندەپەپوو، بایەقوش، جوغد.

**کوچ**- ص(کووچ- kûç): خێل و قیچ.

**کوچ**- ا(کووچ- kûç): کۆچ، تایفەو ماڵبات.

**کوچ**- ا(کووچ- kûç): ناوی تایفەیەک بووە.

**کوچاندن**- مص.م(کووچاندەن- kûçanden): کۆچاندن، دەرکردن، ڕەتاندن، تاراندن.

**کوچک**- ص(کوچەک- kûçek): گچکە، بچووک، بوبچک.

**کوچک ابدال**- ص.مر(کوچەک ئەبدال- kûçek ebdal): لە ناو جماعەتی موریداندا، موریدێ لەوانی تر بچووکتر بێ، دەروێشە چکۆڵە.

**کوچکین**- ص.ت(کووچەکین- kûçekîn): بچووکترین، وردترین.

**کوچولو**- ص(کووچولوو- kûçûlû): زۆر بچووک، منداڵی بچووک، بچکۆڵە.

**کوچه**- ا(کووچە- kûçe): کووچە، کۆڵانی تەسک.

**کوچیدن**- مص.ل(کووچیدەن- kûçîden): کۆچ کردن.

**کوخ**- ا.ع(کووخ- kûx): کوختە، کوخ.

**کود**- ا(کوود- kûd): خەرمان، پەیین.

**کودئین**- ا.فر(کوودیین- kûdîyn): ڕوحی ئەفیوون، جەوهەری ئەفیوون.

**کودتا**- ا.فر(کوودیتا- kûdita): کودەتا.

**کودره**- ا(کوودەرە- kûdere): جۆرە مراوییەکە.

**کودرست**- ا.مر(کوودروست- kûdrust): لەزمانی رووەکناسیدا بەو ڕووەک و گیایانە دەگوترێ کە بەپەین دەڕوێن.

**کودک**- ص(کوودەک- kûdek): منداڵ، کچ یان کوڕی منداڵ.

**کودکانه**- ق.ص(کوودەکانە- kûdekane): منالانە.

**کودکستان**- ا.مر(کوودەکیستان- kûdekistan): زارۆکستان، باخچەی ساوایان.

**کودن**- ص(کەودەن- kewden): کەودەن، گەلحۆ، گەوج، گێل.

**کور**- ص(کوور- kûr): نابینا، کوێر، کۆرە.

**کوراب**- ا.مر(کووراب- kûrab): شۆرەزار، شۆراخ، تراویلکە.

**کورار**- ا.فر(کوورار- kûrar): مادەیەکی ژەهردارە لە هەندێ گیاو ڕووەکان دەگیرێت.

**کورالین**- ا.فر(کوورالین- kûralîn): جۆرێ خەنەتیلکەو قەوزەی دەریاییە.

**کوران**- ص.فر(کووران- kûran): تەزوی کارەبا، هاتنی ئاو، ڕەوان.

**کورانه**- ق(کوورانە- kûrane): کوێرانە.

**کورباطن**- ص.مر(کوورباتین- kûrbatin): دڵڕەش، کاڵفام.

**کوربخت**- ص.مر(کووربەخت- kûrbext): کڵۆڵ، بەخت کوێر، بەدبەخت، بێ شانس، نەگبەت،

**کوردیپلماتیک**- ا.فر(کووردیپلوماتیک- kûrdiplumatîk): کۆی دیپلوماتکارانی وڵات لە پایتەختی وڵاتێکی دی.

**کوردین**- ا(کووردین- kûrdîn): پەلاس، شڕو شیتاڵ.

**کورس**- ا(کەڤەرس- kevers): قژی لوول، چلکی لەش یان جلو بەرگ.

**کورس**- ا.فر(کوورس- kûrs): ڕاکردن، پێشبڕکێ، کێبڕکێ.

**کورک**- ا(کەورەک- kewrek): زیپکە.

**کورکورانه**- ق(کوورکوورانە- kûr kûrane): کوێرانە.

**کورگیاه**- ا.مر(کەڤەر گیاه- kever gîyah): درەختێکە لە دارگوێز دەچێ.

**کورمار**- ا.مر(کوورمار- kûrmar): کوێرەمار، جۆرە مارێکی بێ ژەهرە، مێرووان دەخوات.

**کوروکبود**- ص.مر(کوورو کەبوود- kûrû kebûd): تاریک و نوتەک، ناشیرین و ناپەسند.

**کوره**- ا(کوورە- kûre): کوورە، ئاگردان، کوورەی کەرپوچ و گەج و سواڵەت، کوورەی ئاسنگەران.

**کـــوره**- ا(کـــووره- kûre): ناوچه، شـــار، شارستان.

**کـــورده**- ص.مـــر(کـــوورەدەه- kûredeh): کوێرەدێ.

**کـــورەراه**- ص.مـــر(کـــوورەراه- kûrerah): کوێرەڕێ، تولەڕێی ناهەموارو عاسی.

**کوریدور**- ا.فر(کووریدور- kûrîdûr): دالان، ڕاڕەو.

**کوریزا**- ا.فر(کووریزا- kûrîza): هەلامـەت، پەسیو، سەرمابوون.

**کوز**- ا.ص(کووز- kûz): قەمور.

**کوزر**- ا(کووزەر- kûzer): کۆزەر..

**کوزگک**- ا(کووزەگەک- kûzegek): گۆزیلە، گۆزەی بچووک.

**کوزه**- ا(کوزه- kûze): گۆزە.

**کوژ**- ا.ص(کووژ- kûj): قەموور، کۆم، کووڕ.

**کـوژپشت**- ص.مـر(کـووژ پوشت-kûj puşt): قەموور، پشت کووڕ.

**کوژه**- ا.ص(کووژه- kûje): گوێدرێژی سپی.

**کوس**- ا(کووس- kûs): دەهۆڵ، دۆڵ.

**کوس**- ا(کووس- kûs): کۆست، جەزرەبە.

**کوستن**- مص.م(کـوسـتـەن- kûsten): کـوتان، ئازاردان، ڕەنجاندن، ئەزیەت دان.

**کـوسج**- ص.ع(کـوسـەج- kûsec): پیـاوی کۆسە، کۆسەماسی.

**کوسک**- ا(کەڤیسک- kevisk): پاقلە.

**کـوسن**- ا.فـر(کـووسین- kûssin): سـەرین، بالیف، سەنیا، سەرینگە.

**کوسه**- ص(کووسه- kûse): کۆسە، پیاوێک تەنیـــا چەناگـــەی تەنکە مـــویەکی هەبێ و ڕوومەتەکانی بێ موون.

**کوسەبرنشین**- ا.مر(کووسە بەرنیشین- kûse ber nişîn): ناوی جـەژنێکە لە کـۆنا باوبووە، لە هەوەڵی مـانگی ئازەردا پیـاوێکی کـۆسـەیان سـواری کـەر دەکـردو ئەو پیـاوە باوەشـێنێکی بە دەسـتـەوە دەگرت و خـۆی باوەشـێن دەکـرد و دادو بێدادی لە دەست گـەرما دەکـرد و خـەڵـکی بەفـرو ئاویان پێدا دەکردو لە هەر دوکانێک شتێکی وەر دەگرت، کۆسەوەوی.

**کـــوســـەمـــاهی**- ا.مـــر(کـــووســـەمـــاهی- kûsemahî): کۆسـەماسی، جۆرە مـاسـیـیـەکی گەورەی دڕە.

**کوشا**- ص.فـا(کوشـا- kûşa): کـۆششـکار، هەوڵدەر.

**کوشاد**- ا(کووشاد- kûşad): جۆرە ڕووەکێکە.

**کوشش**- ا.مص(کووشیش- kûşiş): کـۆشش، هەوڵدان.

**کوشک**- ا(کووشک- kûşk): کۆشک ، قەسر.

**کوشنه**- ا(کوشنه- kûşne): قیست.

**کوشیدن**- مص.ل(کـووشـیـدەن- kûşîden): تێکۆشان، هەوڵدان.

**کـوف**- ا(کـووف- kûf): کـوند، کـوندەپەپوو، جوغد، بایەقوش.

**کـــوفت**- ا(کـــووفت- kûft): ئازار، ئەزیەت، نەخۆشی سفلیس.

**کوفتن**- مص.ل(کووفـتـەن- kûften): شـتـێک بە بەرد یان شـتـێکی دی بکوتن و وردی بکەن ئەزیەتدان، ئازاردان.

**کوفته**- ا(کووفته- kûfte): کفتە.

**کوفجان**- ا(کووفجان- kûfcan): قەفەز، جێی تەنگ.

**کـوفـشـانه**- ا.ص(کـووفـشـانه- kûfşane): جۆلا.

**کوفی**- ص.ن(کووفی- kûfî): خـەڵکی شـاری کوفەی عێراق، خەتی کوفی.

**کـوفـیـه**- ا.ع(کـووفـیـیـه- kûfiye): چەفێ، جەمەدانی.

**کـــوک**- ا(کـــووک- kûk): تـەقـــەڵی درشت بەدەست تاپاشان بە مەکینە بیدوورن، کۆک.

**کوک زدن**- مص.م(کووک زەدەن- kûk zeden): تەقەڵ لێدان.

**کوککردن**- مص.م(کووک کەردەن- kûk kerden): کۆک کردن و هاوئاهەنگاندنی ئامێرێن مۆسیقا، کۆک کردن و میقاتکردنی سەعات.

**کوک شدن**- مص.ل(کووک شودەن- kûk şuden): توورەبوون.

**کوک**- ا(کووک- kûk): کاهوو.

**کوکا**- ا.فر(کووکا- kûka): جۆرە درەختێکە.

**کوکائین**- ا.فر(کووکائین- kûkain): مادەیەکە کە لە درەختی کوکا دەگیرێ، کۆکاین.

**کوکب**- ا.ع(کەوکەب- kewkeb): ئەستێرە، هەسارە.

**کوکبە**- ا.ع(کەوکەبە- kewkebe): پۆلە سوارێک، تاقمە خەڵکێک، فەرو شکۆ، ئەستێرە.

**کوکتیل**- ا.انگل(کووکتیل- kûktîl): کۆکتێل، خواردنەوەی تێکەڵ.

**کوکلە**- ا(کەوکەلە- kewkele): شانەبەسەر، پەپوەسلێمانکە، پەپلەسلێمانە.

**کوکن**- ا(کووکەن- kûken): بایەقوش، کوندەپەپوو.

**کوکنار**- ا(کووکنار- kûknar): خەشخاش، گوڵی تلیاک، قۆزاخەی تلیاک.

**کوکو**- ا(کووکوو- kûkû): کوکوختی.

**کوکو**- ا(کووکوو- kûkû): هێلکەو سەوزەو پەتاتەی سورەوەکراو.

**کوکوز**- ا(کووکووز- kûkûz): جۆرە قوماشێکی تەنک و ناسک بووە.

**کول**- ا(کوول- kûl): کۆڵ، شان.

**کول**- ا(کوول- kûl): گۆل، حەوز، گۆلاو، شوێنێ کە ئاوێکی کەمی تیا وەستابێ، کۆل.

**کول**- ا(کەڤەل- kevel): کەوڵ، پۆستین، فەروە.

**کول**- ص(کوول- kûl): کول، ئەسپی خاو، خێل و قیچ، کوندەپەپوو.

**کول**- ا(کەڤەل- kevel): بۆری گەورەی چیمەنتۆ کە دەخرێتە ئاوەڕۆی کەناڵی ئاو تا کەناڵەکە نەنیشێت.

**کولاب**- ا.مر(کوولاب- kûlab): گۆلاو، حەوز، کۆلی ئاو.

**کولاک**- ا(کوولاک- kûlak): تۆفان، شەپۆلی دەریا.

**کولخ**- ا(کوولەخ- kûlex): گوڵخەن، توون، ئاگردان.

**کولر**- ا.انگل(کوولەر- kûler): فێنک کەرەوە، ئامێری فێنک کەرەوەی هەوای ئوتاغ.

**کولک**- ا(کەولەک- kewlek): سەبەتەیەکی بچووکە کە ژنانی دێهاتی لە پای خەرەک دایدەنێن و گلۆڵە بەنی تێ دەکەن.

**کولنج**- ا(کولەنج- kûlenc): قۆڵنج.

**کولنگ**- ص(کوولەنگ- kûleng): لووسکە، حیز، قوندەر.

**کولون**- ا.فر(کوولوون- kûlûn): قۆلۆن.

**کولە**- ا(کوولە- kûle): کۆڵ، کۆڵەبار، چاڵ.

**کولە**- ص(کەولە- kewle): خوارو خێچ.

**کولەخس**- ا.مر(کوولەخەس- kûlexes): رووەکێکە.

**کولی**- ا(کەولی- kewlî): کێوەلی، قەرەج.

**کولیت**- ا.فر(کوولیت- kûlît): نەخۆشی قۆلۆن.

**کولیدن**- مص.م(کوولیدەن- kûlîden): هەڵکەندن، شۆڕکردنی زەوی، هەڵکۆڵینی زەوی.

**کوم**- ا(کووم- kûm): سەوزەی کەناری حەوز یان روبار.

**کومش**- ا.ص(کوومیش- kûmiş): بیرهەڵکەن، کارێزکەن، قومش لێدەر.

**کومە**- ا(کوومە- kûme): کەپری لە لق و پۆپی درەخت دروستکراو.

**کون**- ا (کەڤەن- keven): درەختێکە، گەوەن.

**کون**- ا.ع(کەون- kewn): بوون، گەردون.

**کونده**- ا(کەڤەندە- kevende): ڕەشکەی کاکێشان، زرکەکاڵەک.

**کوه**- ا(کووە- kûh): کێو، کۆ، چیا، شاخ، جەوەڵ.

**کوه**- ا.ع(کووڤە- kûve): کون، کلاو ڕۆژنە.

**کوهان**- ا(کووهان- kûhan): کۆپەوانەی وشتر، کۆپارە، لوور.

**کوهپایه**-ا.مر(کووهپایە- kûhpaye): بناری کێو، پایینی چیا، داوێنی شاخ.

**کوهج**- ا(کووهەج- kûhec): گۆێژ.

**کوهسار**- ا.مر(کووهسار- kûhsar): کۆچار، کۆسار.

**کوهستان**- ا.مر(کووهیستان- kûhistan): کوێستان، شوێنێ کێوی زۆربێ، وڵاتی شاخ وداخ.

**کوه کاف**- ص.فا(کووه کاف- kûh kaf): کێوبڕ، کێوکەن.

**کوهکان**- ا.ص(کووهکان- kûhkan): کێوکەن.

**کوهکن**- ا.ص(کووهکەن- kûhken): کێوکەن، نازناوی فەرهادی ئاشقی شیرینە.

**کوهنورد**- ص.فا(کووە نەڤەرد- kûh neverd): شاخەوان.

**کوهه**- ا(کووهە- khûhe): بەرزی، قەڵپوسی زین، شەپۆلی ئاو.

**کوی**-ا(کووی- kûy): گەڕەک، شارێ.

**کویج**- ا(کووڤیج- kûvic): گۆێژ.

**کویر**- ا(کەڤیر- kevir): شۆراخ، شوێنی شۆرەکات، سەراب، تراویلکە، شۆرەزار.

**کویز**- ا(کەڤیز- kevîz): کونج، قوڕنە، سوچی ماڵ، گۆشە، قانچە.

**کویژ**- ا(کەڤیژ- kevîj): گۆێژ، گوهیژ، بلچ، بلت، گڤیش.

**کویستن**- مص.م(کووڤیستەن- kûvîsten): کوتین، کوتینی دانەوێڵەو شتی دی.

**کویسته**- ا.مف(کووڤیستە- kûvîste): کوتراو.

**کویش**- ا(کەڤیش- kevîs): گادۆش، دەفرێ کە مانگای تیا دەدۆشن.

**که**- ا(کووه- kûh): کێو، شاخ، چیا، جەوەڵ.

**که**- ا(کەه- keh): کا.

**که**- ص(کیه- kih): چکۆلە.

**کها**- ص(کەها- keha): شەرمەزار.

**کهاب**- ا.مر(کەهاب- kehab): زەمادێک لە کاو گیای دەرمانی دروست بکرێ و لە زام و برینی حەیوانات بنرێ.

**کهانت**- ا.مص. ع(کیهانەت- kihanet): غەیب زانی، غەیبگۆیی، پیشەی کاهینی.

**کهبد**- ا.ص(کوهبود- kuhbud): کێونشین، خواپەرستێک لە کێودا ماڵوچکەیەکی بۆ خواپەرستی دروست کردبێ.

**کهبل**- ص(کەهبەل- kehbel): نەزان، گەوج.

**کهتاب**- ا(کەهتاب- kehtab): بڕوانە: (کەهاب).

**کهتر**- ص.ت(کیهتەر- kihter): بچووکتر.

**کهر**- ص(کەهەر- keher): ئەسپی سوری مەیلەو ڕەش.

**کهربا**- ا.مر(کەهروبا- kehruba): کارەبا.

**کهربای سیاه**- ا.مر(کەهروبای سیاه- kehrubay siyah): جۆرە زوخاڵێکی قایم و بریقەدارە.

**کهره**- ا(کەهرە- kehre): کارژۆڵەی شیرخۆر.

**کهسار**- ا.مر(کوهسار- kuhsar): کۆسار.

**کهستان**- ا.مر(کوهیستان- kuhistan): کێویستان، کوێستان، زۆزان.

**کهسله**- ص(کەهسەلە- kehsele): گەوج، نادان، نەزان، گێل.

**کهف**- ا.ع(کەهف- kehf): شکەفت، ئەشکەوت، غار، پەناگە.

**کهکان**- ا.ص(کووهکەن- kûhken): کێوکەن.

**کهکشان**- ا.مر(کەهکەشان- kehkeşan): کاکێشان، کەشکەڵان، ڕێگەی کادز، ڕێی حاجیان.

**کهل**- ص.ع(کەهل- kehl): پیاوێک تەمەنی لە نێوان ٣٠- ٥٠ ساڵ بێ، واتە پیاوی بە ئەزموون.

**کهن**- ص(کوهەن- kuhen): کۆنە، دێرینە.

**کهن دژ**- ص(کوهەن دیژ- kuhen dij): کۆنە قەڵا، دنیا.

**کهنسال**- ص.مر(کوهەنسال- kuhen sal): پیر، بەتەمەن، تەمەندار.

**کهنه**- ا.ع(کەهەنە- kehene): کاهینان.

**کهنه**- ص(کوهنە- kuhne): کۆنە، دێرینە.

**کهور**- ا(کەهوور- kehûr): درەختێکە.

**کهوف**- ا.ع(کوهووف- kuhûf): شکەفتان، ئەشکەوتان.

**کهولت**- مص.ل.ع(کوهوولەت- kuhûlet): پیربوون، پیری.

**کهیر**- ا(کەهیر- kehîr): حەساسیەت، هەو.

**کهین**- ص(کیهین- kihîn): بچووک، بچوکتر.

**کی**- حر(کەی- key): کەی؟.

**کی**- حر(کی- kî): کێ؟.

**کی**- ص(کەی- key): عینوانی پاشایانی کەیانی وەکو کەیخوسرەو، کەی قوباد، کەی کاوس، پاشای گەورە، شاهنشا.

**کی**- مص.م.ع(کەی- key): داغکردن، داغکردنی پێستی بەدەن بە شیشی سورەوەکراو.

**کیا**- ا.ص(کیا- kiya): گەورە، خاوەن، خودان، خوا، پاشا، مەرزەوان، حوکمڕان.

**کیایی**- ص(کیایی- kiyayî): گەورەیی، فەرمانڕەوایی.

**کیاخن**- ا(کەیاخەن- keyaxen): نەرمی، ئارامی.

**کیاده**- ص(کیادە- kiyade): ڕیسوا، بەدناو، ناوزڕاو، بێ ئابرو.

**کیار**- ا(کییار- kiyar): تەمەڵی.

**کیارا**- ا(کەیارا- keyara): خەم و پەژارە، بێزاری، تاسە، بێزوو.

**کیارنگ**- ص(کەیارەنگ- keyareng): پاک، خاوێن، ناسک، ڕەنگی پاک و خاوێن.

**کیازند**- ص(کییازەند- kiyazend): خاوەن شکۆ، پاشای مەزن.

**کیاست**- ا.مص(کییاسەت- kiyaset): زیرەکی، هوشیاری.

**کیاگن**- ص(کەیاگین- keyagin): ناهەموار، درشت.

**کیال**- ص.ع(کەییال- keyyal): پێوانەکەر.

**کیان**- ا(کەیان- keyan): پاشای گەورە، ناوی زنجیرەیەک پاشایانی ئێرانی دوای پێشدادییەکانە.

**کیان**- ا(کویان- kuyan): خێوەت، خێوەتێن خەڵکی سارانیشین.

**کیان**- مص.ل.ع(کییان- kiyan): بوون، تەبیعەت، پەیدابوون.

**کیانا**- ا(کییانا- kiyana): تەبیعەت، جەوهەری هەر شتێک.

**کیبانیدن**- مص.م(کیبانیدەن- kibanîden): خوارکردن، کەچکردن، لادان.

**کیبیدن**- مص.ل(کیبیدەن- kîbîden): لەرێ لادان، کەچڕۆیین، گەڕاندنەوە.

**کیبنده**- ا.فا(کیبەندە- kîbende): لادەر، لە ڕێ دەرچوو، گومڕا.

**کیپ**- ص(کیپ- kîp): پڕ، تەژی،

**کیچ**- ص(کیچ- kîç): پەڕاگەندە، پەریشان، کەم، هێواش.

**کیخ**- ا(کیخ- kîx): ڕیپۆقی چاو.

**کیخسروی**- ص.ن(کەی خوسرەڤی- keyxusrevî): کەیخوسرەوی، یەکێک بووە لەپاشایانی کەیانی و کوڕی سیاوەش بووە، ناوی یەکێک لە سی ئاوازەکەی باربەد بووە.

**کید**- ا.ع(کەید- keyd): حیلە، فێڵ، تەڵەکە.
**کیز**- ا(کیز- kîz): لباد.
**کیس**- ا(کیس- kîs): چرچ و لۆچ.
**کیس**- ا.ع(کیس- kîs): کیسە، توورەکە.
**کیس**- ص.ع(کەییس- keyyis): زیرەک، هوشیار.
**کیسان**- ا.ع(کەیسان- keysan): غەدر، بێوەفایی.
**کیسنە**- ا(کیسەنە- kisene): بەنی لەسەر تەشی هەڵکراو.
**کیسە**- ا(کیسە- kîse): کیسە.
**کیسەبر**- ص.فا(کیسەبور- kîsebur): گیرفانبڕ.
**کیسەداران**- ا.مر(کیسەداران- kîse daran): ئەو گیانلەبەرانەی لە ژێر سکیان کیسە هەیەو بێچووەکانی خۆیانی تیا پەروەردە دەکەن، کیسەداران.
**کیسەی صفرا**- ا.مر(کیسەی سەفرا- kîsey sefra): زراو، کیسەی زەرداو.
**کیسەکشیش**- ا.مر(کیسەکەشیش- kîse keşîş): جۆرە رووەکێکە.
**کیش**- ا(کیش- kîş): دین، ئایین.
**کیش**- ا(کیش- kîş): جۆرە قوماشێکی کەتانە، لەچکی ژن.
**کیش**- ا(کیش- kîş): تیردان.
**کیغ**- ا(کیغ- kîx): ریپۆقی چاو.
**کیف**- ا.ع(کیف- kîf): کیف، جزدان.
**کیف**- ا.ع(کەیف-keyf): چۆن؟
**کیفر**- ا(کەیفەر- keyfer): سزا.
**کیفر**- ا(کەیفەر- keyfer): بەردێکە لە کۆنا لەسەر دیواری بورج یان قەڵا دادەنرا تا کاتێ دژمن نزیک بوایەتەوە بیدەن بەسەریدا.
**کیفر**- ا(کەیفەر- keyfer): قاپی شیرو ماست.

**کیفر خواست**- ا.مر(کەیفەر خاست- keyfer xast): ئیدیعانامەی دادستان.
**کیفیت**- ا.ع(کەیفییەت-keyfiyet ): چۆنیەتی.
**کیک**- ا(کەیک- keyk): کێچ.
**کیک**- ا(کەیک-keyk ): بیلبیلەی چاو.
**کیک**- ا.انگل(کەیک- keyk): کێک.
**کیکیز**- ا(کەیکیز- keykîz): تەڕەتیزە.
**کیل**- ص(کیل- kîl): خوارو خێچ.
**کیل**- ا(کییەل- kiyel): گۆیژ، گڤیش.
**کیل**- ا.ع(کەیل- keyl): پێوانە.
**کیلو**- ا.فر(کیلوو- kîlû): کیلۆ، بە مانای هەزار دێ.
**کیلوگرم**- ا.مر.فر(کیلوگیرام- kîlû giram): هەزار گرام.
**کیلومتر**- ا.فر(کیلومیتر- kîlû mitr): هەزار مەتر.
**کیلە**- ا.ع(کەیلە- keyle): پەیمانە، پێوانە.
**کیماک**- ا(کەیماک- keymak): قەیماغ، سەرشیر، سەرتوێژ، سەرتو.
**کیماک**- ا(کیماک- kîmak): کەژوو، کەژگ.
**کیمخت**- ا(کیموخت- kîmuxt): پێستی خۆشەکراوی ئەسپ یان ولاخ.
**کیمیا**- ا(کیمیا- kîmya): کیمیا.
**کیمیاگر**- ص.فا(کیمیاگەر-kîmyager ): کەسێک خەریکی زانستی کیمیابێ.
**کیمیایی**- ص.ن(کیمیایی- kîmyayî): کیمیایی.
**کین**- ا(کین- kîn): کینە، قین، قینە بەرایەتی، بوغز.
**کین ایرج**- ا.مر(کین ئیرەج- kîn irec): ئاهەنگێکی مۆسیقایە.
**کین سیاوش**- ا.مر(کین سیاڤەش- kîn siyaveş): ناوی یەکێکە لە سی ئاوازەکەی باربەد.

**کینونت**- مص.ل.ع(کەینونەت- keynûnet): بوون.

**کینه**- ا (کیینه- kîne): کەرب و کینه، رق و بوغز.

**کینەتوز**- ا(کینه توز- kîne tûz): رقن، تۆڵەئەستێن.

**کینه ور**- ص(کینەڤەر- kîneveR): بوغزن، بەدخوا.

**کیوان**- ا(کەیڤان- keyvan): کەیوان، ئەستێرەیەکی گەڕۆکە، (زوحەل)

**کیوسک**- ا.فر(کییوسک- kiyusk): دوکانوچکەی سەر شۆستەو قەراخ رێگا بۆ رۆژنامەفرۆشی و ئەو شتانە، کوشک.

**کیهان**- ا(کەیهان- keyhan): جیهان، دنیا، گێتی، رۆژگار.

**کیهان خدیو**- ص.مر(کەیهان خدیڤ- keyhan xdîv): پاشای گەورە، پاشای عالەم.

**کیی**- ص.ن(کەیی-keyî ): پاشایی.

# گ

**گ- حر**(گ- g):
پیتی بیست و شەشەمی ئەلفبای فارسییە کە بە (گـاف) دەخـوێنرێتــەوە، ئەم پیــتــە لە زمــانی عەرەبیدا نییەو، لە حەساوی ئەبجەدا لە جیاتی کاف بە (٢٠) دەژمێردرێ.

**گـاباردین**- ا.فـر(گـاباردین- gabardîn): گەبەردین، جۆرە قوماشێکە.

**گـابارە**- ا(گـابارە- gabare): گـاگـەل، غـارو ئەشکەوتی ناو شاخان.

**گـات**- ا(گـات- gat): کـۆنتـرین و پیـرۆزترین بەشی ئاڤێستا، گاتا، یەکەمین نەزمی ئێرانییە کە لە دێر زەمــانەوە مــاوەتەوەو بەشی ســەرەکی قسـەکانی زەردەشـتەو بریتـییـە لە ١٧ فـەسڵ و ٢٣٨ پارچەیان ٨٩٦ بەیت.

**گار**- (گار- gar): پاشگرەو، دەچێتە سەر وشەو بـە زۆری مــــــانای بـکـەری دەداتـێ، وەک: (پروردگار).

**گار**- ا.فر(گار- gar): وێستگەی قیتار.

**گاراژ**- ا.فـر(گـاراژ- garaj): گـەراج، مـۆڵگە، شوێنی راگرتنی ئوتومبیلان.

**گارد**- ا.فر(گارد- gard): گارد، پاسەوان.

**گـاردن پارتی**-ا.فـر(گـاردین پـارتی- gardin partî): ئاهـەنـگ و ســـەیران لـە باخـــدا، سەیرانگە.

**گـارسن**- ا.فـر(گـارسـون- garsun): گـارسـۆن، پێشخزمەتی میوانخانان، شاگرد، بۆی.

**گـارســـە**- ا(گـــارســـە- garse): کـــاس، سەندوقێکی خانەخانەیە کە لە چاپخاناندا پیتی قورقوشمی تێدا ریز دەکەن.

**گـارمـون**- ا(گـارمـــون- garmûn): جـۆرە سازێکە. ئامێرێکی مۆسیقایە.

**گـاری**- ا(گـاری- garî): گـاری، گـالیـسـکە، پایتۆن، عەرەبانە، ناپایەدار.

**گاز**- ا(گاز- gaz): ددان، گاز.

**گازگرفتن**- مص.م(گازگیریفتەن-gazgiriften): گازگرتن، قەپگرتن، ددان پێدا چەقاندن.

**گاز**- ا(گاز- gaz): گاز، پلایس.

**گاز**- ا(گاز- gaz): پوواز.

**گـاز**- ا.فـر(:از- gaz): شـاشی برین پێـچـان، شاش.

**گـاز**- ا.فـر(گـاز- gaz): هەوا، غـاز، غـازی سوتاندن.

**گـازر**- ا.ص(گـازور- gazur): گـازر، قـەسـار، جلشۆر.

**گـــازرک**- ا.ص (گـــازورەک- gazurek): گازرۆکە، کلک تەقێنە، کلک هەڵتەکێنە.

**گازرگاه**- ا.مر(گازورگاه- gazurgah): جلشۆرخانە، گازرخانە.

**گازوئیل**- ا.فر(گازوئیل- gazu'îl): گازوایل، رۆنی دیزڵ.

**گازولین**- ا.فر(گازولین- gazûlîn): گازۆلین، گازوایل.

**گاستروسکوب**- ا.فر(گاستروسکوپ- gastrûskûp): ئامێرێکە بۆ دیتنی دیواری ناوەوەی گەدە، نازور.

**گاشتن**- ص.م(گاشتەن- gaşten): گێڕاندنەوە.

**گال**- ا.(گال- gal): شەقڵداق، ئەو ریخەی بەژێر دوگی مەڕەوە وشک دەبێتەوە، قۆزاخەی پەموو، چەقەڵ، فریو.

**گال**- ا.فر(گال-gal): نەخۆشییەکی پێستە، گەری.

**گالبنگ**- ا.گالبەنگ- galbeng): گیایەکە لە ناو گەنم و جۆدا دەڕوێ و ژەهرداره.

**گالری**- ا.فر(گالوری- galurî): گالەری، پیشانگای تابلۆو نیگاران، دالانی درێژو سەرگیراو.

**گالش**- ا(گالیش- galiş): گاوان، شوانی چێلان.

**گالش**- ا.فر(گالوش- galuş): پێڵاوی لاستیک، کەوشی لاستیکین.

**گالن**- ا.فر(گالون- gallun): گالۆن.

**گالن**- ا.فر(گالین- galin): سلفۆری قورقوشم.

**گالوانومتر**- ا.فر(گالفانومیتر- galvanûmitr): ئامێرێکە بۆ ئەندازەگیری رادەی تەزووی کارەبا.

**گاله**- ا(گاله- gale): جەواڵ، گلۆلە پەموو.

**گالی**- ا(گالی- galî): پووشی برنج بۆ دروستکردنی سەرکلاوو سەبەتە.

**گالیدن**- مص.ل(گالیدەن- galîden): هەڵاتن، فیرار کردن، دوورکەوتنەوە.

**گالینگور**- ا(گالینگوور- galîngûr): جۆرە مقەوایەکی مشەمایییە پتر بۆ بەرگی کتێبان.

**گالیوم**- ا.فر(گالیووم- galliyûm): جۆرە کانزایەکی دەگمەنە لە ٣٠ پلەی گەرمیدا دەتوێتەوە.

**گام**- ا(گام- gam): پێ، هەنگاو، شەقاو.

**گام**- ا.فر(گام- gam): هەشت نۆتەکەی مۆسیقا بەریز.

**گامبوزیا**- ا.فر(گامبوزیا- gambûzya): جۆرە ماسییەکی بچووکە لەشی دەگاتە پێنج سانتیمەتر.

**گامت**- ا.فر(گامیت- gamit): هەر شانەیەکی زاوزێی روەک یان گیانلەبەران.

**گام زدن**- مص.ل(گام زەدەن- gam zeden): هەنگاونان، رێکردن.

**گامزن**- ا.فا(گامزەن- gamzen): رێبوار، تەتەر، قاسید، ئەسپی تیژڕەو.

**گان**- (گان- gan): پاشگرە دەچێتە سەر وشەو مانای تازە دروستدەکات، وەک: (رایگان- خۆڕایی).

**گاو**- ا(گاڤ- gav): چێڵ، مانگا، چێر.

**گاواب**- ا.مر(گاڤ ئاب- gavab): قەوزە، کڤز، گوی قورباقە.

**گاواهن**- ا.مر(گاڤ ئاهەن- gav ahen): گاسن و هەوجاڕ، قورەمە.

**گاوباز**- ص.فا(گاڤ باز- gav baz): گاباز.

**گاوبان**- ا.ص(گاڤ بان- gav ban): گاوان، شوانی چێلان.

**گاوبند**- ص.فا(گاڤ بەند- gav bend): خودان گاجووت، گابەندی، کەسێک جووتێ گای هەبێ و بەدانی بەشێک لە زەوی یەکێکی دیدا کشتوکاڵ بکات.

**گاوبندی**- ا.مص(گاڤ بەندی- gav bendî): گابەندی.

**گاوپروین**- ا.مر(گاڤی پەرڤین- gavi pervîn): کەلووی گاجووت.

**گاوپیسه**- ا.مر(گاڤ پیسە- gavpîse): گای بەڵەک.

**گاوپیکر**-ص.مر(گاڤ پەیکەر- gav peyker): گاپەیکەر، زەلام وەکو گا، ناوی گورزەکەی فەرەیدوون بووە کە لەسەری گاچووە.

**گاوچران**- ص.فا(گاڤ چەران- gav çeran): گاوان.

**گاوچشم**- ص.مر(گاڤ چەشم- gav çeşm): چاو گەورە، کەسێک چاوی گەش و درشت بێ، جۆرە پونگەیەکە.

**گاوخانی**- ا.مر(گاڤ خانی- gav xanî): حەوزی گەورە، گۆلاوی گەورە.

**گاودل**- ص.مر(گاڤ دیل- gav dil): ترسنۆک، بێ ئەقڵ، بێ ئاوەز.

**گاودم**- ا.مر(گاڤ دوم- gav dûm): بۆقی، شەیپوور.

**گاودوش**- ا.مر(گاڤ دوش- gav dûş): گادۆش، دەفری گەورەی چێڵدۆشین.

**گاورس**- ا(گاڤەرس- gavers): زیوان، مرۆر.

**گاورسه**- ا(گاڤەرسە- gaverse): هەر شتێکی ورد.

**گاورسەکاری**- ا.مر(گاڤەر سەکاری- gaver sekarî): وردەکاری لە زەرِنگەریدا بەتایبەتی لە موستیلەدا.

**گاورنگ**- ا.ص (گاڤ رەنگ- gavreng): گورزی گران، وەکو سەری گا.

**گاوزبان**- ا.مر(گاڤ زەبان- gav zeban): گیایەکە لە زمانە گا دەچێت.

**گاوزمین**- ا.مر(گاڤی زەمین- gavi zemîn): گا لەسەر پشتی ماسییەو زەوی لەسەر شاخی گایە، ئەمە خەیاڵ و باوەڕی پێشینان بووە.

**گاوزهره**- ص.مر(گاڤ زەهرە- gav zehre): ترسنۆک، سلۆک.

**گاوسار**- ا.ص(گاڤ سار- gavsar): گا سەر، گورزی گران، گا ئاسا.

**گاوسر**- ا.ص(گاڤ سەر- gav ser): گورز.

**گاوشنگ**- ا.مر(گاڤ شەنگ- gav şeng): دارگاران.

**گاوشیر**- ا(گاڤ شیر- gavşîr): جۆرە رووەکێکە.

**گاومیش**- ا(گاڤ میش- gav mîş): گامێش.

**گاویال**- ا.فر(گاڤ یال- gavyal): گیانلەبەرێکی دەریایی زەلامە و نەهەنگی هیندی پێ دەگوترێ..

**گاوین**- ا(گاڤی زەن- gavi zen): شتێکە لە زەردێنەی هێلکە دەچێ و لە زراوی چێڵدا دەردەهێنرێ.

**گاه**- (گاه- gah): پاشگرە، ناوی کات و ناوی شوێنی پێ دروست دەکرێ وەک: شامگاه- ئێوارە وەختە، کشتارگاه- کوشتارگە: قەساوخانە.

**گاه**- ا(گاه- gah): کات، وەخت، گاڤ.

**گاه**- ا(گاه- gah): شوێن، تەختی پاشایی، بۆتەی زەرنگەری.

**گاهبار**- ا(گاهبار- gahbar): هەر یەکێک لە شەش جەژنی ساڵ لە ئێرانی کۆندا.

**گاهگیر**- ص.فا(گاهگیر- gahgîr): غافڵگیر، ئەسپێک جار جار بڕەوێتەوە.

**گاهنامه**- ا.مر(گاهنامە- gahname): ساڵنامە.

**گاهنبار**- ا(گاهەنبار- gahenbar): ناوی شەش جەژنە کە لەئێرانی کۆندا لە کاتی جیاوازی ساڵدا بەرپا دەکران، هەروەها دەڵێن ناوی ئەو شەش رۆژەشە کە یەزدان دنیای تیا خوڵقاندووە.

**گاهواره**- ا(گاهڤارە- gahvare): بێشکە، لانکە، گافارە.

**گبر**- ا(گەبر- gebr): زەردەشتی، پەیڕەوی زەردەشت، ئەم ناوە پاش ئیسلام بە زەردەشتییەکان گوتراوە، گاور.

**گبر**- ا(گەبەر- geber): جۆرە بەردێکە مەنجەڵ و کاسەو دیزەی لێدروست دەکەن.

**گبرک**- ا(گەبرەک- gebrek): زەردەشتی، گاور.

**محتکر**- ا.فا.ع(موهتەکیر- muhtekir): مونۆپۆل، کەسێک دانەوێڵەو ئازووقە یان کاڵای دی عەمار بکات و هەڵی بگرێ تا بە نرخی گران بیفرۆشێتەوە.

**محتلم**- ا.فا.ع(موهتەلیم- muhtelim): خەونبین، شەیتانی بوون.

**محتمل**- ا.مف.ع(موهتەمەل- muhtemel): لە گوین، لەگین، لەوەیە، رەنگە، شایەت.

**محتوم**- ا.مف.ع(مەهتووم- mehtûm): هەر دەبێ.

**محتوی**- ا.فا.ع(موهتەڤی- muhtevî): شتێک شتێکی دی تیا بێ، ناوەرۆک، ناواخن.

**محراب**- ا.ع(میهراب- mihrab): سەروی مەجلیس، شوێنی وەستانی پێش نوێژ، میحرابی مزگەوت(مزگەوت رووخاوە میحرابی ماوە).

**محراک**- ا.ع(میهراک- mihrak): جووڵێنەر، ئامێری جووڵاندن و بزواندن.

**محرر**- ا.فا.ع(موهەریر- muherrir): ئازادکەر، نووسەر.

**محرز**- ا.مف.ع(موهرەز- muhrez): بەدەست هێنراو، وەرگیراو.

**محرض**- ا.فا.ع(موهەریز- muherriz): هاندەر، دنەدەر.

**محرف**- ا.فا.ع(موهەریف- muherrif): کەسێک کە قسەیەک بگۆرێ.

**محرف**- ا.مف.ع(موهەرەف- muherref): تەحریفکراو، گۆڕدراو، شێواندراو.

**محرق**- ا.فا.ع(موهریغ- muhrix): سوتێنەر.

**محرق**- ا.فا.ع(موهەریغ- muherrix): سووتێنەر، ئەوەی ببێتە مایەی تینوێتی.

**محرق**- ا.مف.ع(موهەرەغ- muherex): سووتاو.

**محرقه**- ا.مف.ع(موهرەغە- muhrexe): دەستەچیلە، قوربانی سوتاو.

**محرک**- ا.فا.ع(موهەریک- muherik): دنەدەر، هاندەر، جووڵێنەر.

**محرم**- ا.ع(مەهرەم- mehrem): مەحرەم، کەسوکاری بەیەک حەرام، کەسوکاری نزیک کە مارەیان لێکدی نەیەت.

**محرم**- ا.فا.ع(موهریم- muhrim): کەسێک کە ئیحرامی بەستبێ.

**محرم**- ا.ع(موهەرەم- muherrem): موحەرەم، مانگی یەکەمی ساڵی کۆچی، بۆیە موحەرەمی پێگوتراوە چونکە عەرەب شەڕیان لەم مانگەدا بە حەرام زانیوە.

**محرمات**- ا.ع(موهەرەمات-muherremat): مەحرەم، حەرامان.

**محرمانه**- ق.ص(مەهرەمانە-mehremane): بە نهێنی، بە دزی، بە پەنهانی.

**محرور**- ا.مف.ع(مەهروور- mehrûr): گەرم بوگ.

**محروس**- ا.مف.ع(مەهرووس- mehrûs): پارێزراو، ئاگاداری کراو، پاسکراو.

**محروسه**- ا.مف.ع(مەهرووسە- mehrûse): پارێزراو.

**محروق**- ا.مف.ع(مەهرووغ- mehrûx): سوتاو، سوتیاگ.

**محروم**- ا.مف.ع(مەهرووم- mehrûm): مەحروم، بێ بەش، نائومێد.

**محزون**- ا.مف.ع(مەهزوون- mehzûn): غەمگین، خەمین، کەسەردار.

**محسن**- ا.فا.ع(موهسین- muhsin): چاکەکار.

**محسوب**- ا.مف.ع(مەهسووب- mehsûb): ژمێردراو، حەساوکراو، حەساو بۆ کریاگ.

**محسود**- ا.مف.ع(مەهسوود- mehsûd): حەسودی پێ براو.

**محسوس**-ا.مف.ع(مەهسووس- mehsûs): هەست پێکراو.

**محشر**- ا.ع(مەهشەر- mehşer): جێی خڕبوونەوەی خەڵکی، ڕۆژی پەسڵانێ، ڕۆژی حەشر.

**محشور**- ا.مف.ع(مەهشوور- mehşûr): هاودەم، لەیەکدی خڕبوونەوە.

**محشی**- ا.مف.ع(موهەششا- muheşşa): پەراوێز بۆ نووسراو، کتێبێک پەراوێزی بۆ نووسرابێ.

**محصل**- ا.فا.ع(موهەسسیل- muhessil): قوتابی، کەسێک شتێکی بەدەست هێنابێ.

**محصله**- ا.فا.ع(موهەسسیلە-muhessile): قوتابی (بۆ مێ).

**محصن**- ا.مف.ع(موهسەن- muhsen): پیاوی ژندار.

**محصنه**- ا.مف.ع(موهسەنە- muhsene): ژنی شوودار.

**محصور**- ا.مف.ع(مەهسوور- mehsûr): شورە، حەسار بۆ کراو.

**محصول**- ا.مف.ع(مەهسوول- mehsûl): بەرووبووم، بەرهەم.

**محصون**- ا.مف.ع(مەهسوون- mehsûn): پارێزراو.

**محض**- ص.ع(مەهز- mehz): خالیسەو پاکژ، بێ غەش، پاک.

**محضر**- ا.ع(مەهزەر- mehzer): دەرگا، شوێنی نووسینی قەواڵەو سەنەدان، تۆمارگەی قەواڵەو سەنەدان، تۆمارو فتوانامە.

**محط**- ا.ع(مەهەتت- mehett): وێستگە، شوێنی دابەزین و لادان، مەنزڵ، بارئەنازی قافڵەو کاروان.

**محظور**- ا.مف.ع(مەهزوور- mehzûr): قەدەغە، یاساغ، نارەوا، حەرام.

**محظوظ**- ا.مف.ع(مەهزووز- mehzûz): خۆشبەخت، بەختەوەر.

**محفظه**-ا.ع(مەهفەزە- mehfeze): جانتای دەستی، ئەوەی شتی تیا هەڵگیرێ، جزدان.

**محفل**- ا.ع(مەهفیل- mehfil): شوێنی خڕبوونەوەی دۆستان، کۆڕ، ئەنجومەن، جڤات.

**محفور**- ا.مف.ع(مەهفوور- mehfûr): هەڵکەنراو، کلۆر، مافوور.

**محفوظ**- ا.مف.ع(مەهفووز- mehfûz): پارێزراو.

**محفوف**- ا.مف.ع(مەهفووف- mehfûf): دەوردراو، دەورگیراو.

**محفه**- ا.،ع(میهەففە- miheffe): تەختی رەوان، تەختێکە لە کەژاوە دەچێ بۆ دەروژوور پێکردنی نەخۆش.

**محق**- ا.فا.ع(موهیغغ- muhixx): خودان هەق، هەقدار، کەسێک کەهەق بەو بێ.

**محقر**- ا.مف.ع(موهەغغەر- muhexxer): بچووک، سووک.

**محقق**- ا.مف.ع(موهەغغەغ-muhexxex): وەدی هاتگ.

**محقق**- ا.فا.ع(موهەغغیغ- muhexxix): تەحقیقکار.

**محقوق**- ا.مف،ع(مەهغووغ- mehxûx): شایستە، وەدی هاتگ.

**محک**- ا.ع(میهەک- mihek): سەنگی مەحەک، بەردێکە زێرو زیوی پێدا دێنن و عەیارەکەی دیاری دەکەن.

**محکم**- ص.ع(موهکەم- muhkem): مکووم، قایم.

**محکمات**- ا.ع(موهکەمات- muhkemat): ئەو ئایەتانەی کە مانایان روون و ئاشکرایەو پێویستیان بە تەئویل و شرۆڤان نییە.

**محکمه**- ا.ع(مەهکەمە- mehkeme): دادگا.

**محکوک**- ا.مف.ع(مەهکووک- mehkûk): تاشراو، رنراو.

**محکوم**- ا.مف.ع(مەهکووم- mehkûm): مەحکوم، حوکمدراو.

**محل**- ا.ع(مەهەلل- mehell): شوێن، شوێنی لادان و دابەزین.

**محل**- ا.فا.ع(موهیل- muhill): ئەوەی پابەندی حەرام یان ئەهدو پەیمان نەبێ.

**محلات**- ا.ع(مەهەللات- mehellat): شوێن، گەڕەکان.

**محلب**- ا.ع(مەهلەب- mehleb): شوێنی شیر دۆشین.

**محلب**-ا.ع(میهلەب-mihleb): قاپی شیردۆش.

**محلب**- ا.ع(مەهلب- mehleb): جۆرە درەختێکە.

**محلل**- ا.فا.ع(موهەللیل- muhellil): حەلاڵکەر، ئەو کەسەی ژنی سێ تەلاقە مارە دەکاتەوە تاپاشان تەلاقی بدات و مێردی یەکەمی بیخوازێتەوە، مارە بە جاش.

**محلوج**- ا.مف.ع(مەهلووج- mehlûc): پەمووی هەلاجی کراو.

**محلول**- ا.مف.ع(مەهلوول- mehlûl): شتێک لە شلەیەکدا توێنرا بێتەوە.

**محله**- ا.ع(مەهەللە- mehelle): گەڕەک، کۆڵان.

**محلی**- ا.مف.ع(موهەللا- muhella): رازاوە بە خشڵ، خەملێنراو.

**محمد**- ص.ع(موهەممەد- muhemmed): خۆش تەبیعەت، سوپاسگوزار، کەسێک سوخەتێن چاکی فرەبێ، ناوی پەیامبەری ئیسلامە، ستایشکەر.

**محمل**- ا.ع(مەهمیل- mehmil): کەژاوە.

**محمود**- ا.مف.ع(مەهموود- mehmûd): ستایش کراو.

**محمول**- ا.مف.ع(مەهموول- mehmûl): هەڵگیراو، لە کۆڵ کراو.

**محموم**- ا.مف.ع(مەهمووم- mehmûm): تادار، کەسێک تای لێهاتبێ.

**محن**- ا.ع(میهەن- mihen): مەینەتان، بەلاو دەرد.

**محنت**- ا.ع(میهنەت- mihnet): بەلا، خەم و پەژارە، مەینەت.

**محو**- مص.م.ع(مەهڤ- mehv): سڕینەوە، لەنێوبردن، نەهێشتن.

**محور**- ا.ع(میهڤەر- mihver): تەوەر، تیرە.

**محوطه**- ا.ع(موهەڤڤەتە- muhevvete): حەسار، حەوشە، شوورە، شوێنێ دیواری لە دەورکرابێ.

**محول**- ا.فا.ع(موهەڤڤیل- muhevvil): گۆڕینکار، یەکێکە لە سیفەتەکانی یەزدانی مەزن.

**محول**- ا.مف.ع(موهەڤڤەل- muhevvel): گۆڕدراو، هەواڵەکراو.

**محیر**- ا.فا.ع(موهەییر- muheyyir): مایەی سەرسامی، سەرسامکەر.

**محیص**- ا.ع(مەهیس- mehîs): رزگاری، خەلەسین.

**محیط**- ا.فا.ع(موهیت- muhît): بازنە، ژینگە.

**محیل**- ا.فا.ع(موهیل- muhîl): هەواڵەکەر، چارەکەر، حیلەباز.

**محیی**- ا.فا.ع(موهیی- muhyî): زندوو کەرەوە.

**مخ**- اا(موخ- mux): رەشمەی قورس کە بکرێتە سەری ئەسپ و هێستری چەتون و چەموش، ئاگر، زەردەواڵە، داری خورما.

**مخ**- ا.ع(موخ- muxx): مێشک، مۆخ، دەماغ، مۆخی ئێسقان.

**مخابره**- مص.م.ع(موخابەرە- muxabere): قسەکردن بە تەلەگراف یان تەلەفۆن، خەبەردان، خەبەر وەرگرتن.

**مخاتله**- مص.م.ع(موخاتەلە- muxatele): یەکدی فریودان.

**مخادع**-ا.ع(موخادێ- muxadi’): سەندوقخانە.

**مخادع**- ا.فا.ع(موخادێ- muxadi’): حیلەباز، خاپینۆک، فێڵباز.

**مخادعه**- مص.م.ع(موخادەئە- muxade’e): یەکدی خەڵەتاندن.

**مخاذیل**- ا.ص.ع(مەخازیل- mexazîl): زەبوون، کەساس، داماو.

**مخارج**- ا.ع(مەخاریج- mexaric): شوێنی دەرچوون، خەرجییات و سەرفکردن.

**مخاریق**- ا.ع(مەخاریغ- mexarîx): جوامێران، خەڵکی دڵاوا، سەخاوەتمەندان.

**مخازن**- ا.ع.(مەخازین- mexazin): عەمار، مەخزەن، کۆگا.

**مخاصم**- ا.فا.ع(موخاسیم- muxasim): شەڕانی، شەڕکەر.

**مخاصمه**- مص.ل.ع(موخاسەمە- muxaseme): شەڕکردن، دژمنایەتی کردن.

**مخاض**- ا.ع(مەخاز- mexaz): ژانی زایین.

**مخاط**- ا.ع(موخات- muxat): چڵم.

**مخاطب**- ا.مف.ع(موخاتەب- muxateb): دوێنراو.

**مخاطبه**- مص.ل.ع(موخاتەبە- muxatebe): یەکتر دوواندن.

**مخاطر**- ا.فا.ع(موخاتیر- muxatir): کەسێک خۆی بخاتە خەتەرەوە.

**مخاطر**- ا.ع(مەخاتیر- mexatir): خەتەران، مەترسییان.

**مخاطره**- مص.ع(موخاتەرە- muxatere): خۆخستنە خەتەرو مەترسی.

**مخافت**- مص.ل.ع(مەخافەت- mexafet): ترسان.

**مخالب**- ا.ع(مەخالیب- mexalib): چنگ، نینۆکان، چرنۆکان.

**مخالصت**- مص.ع(موخالەسەت- muxaleset): دۆستایەتی کردن، بێ غەل و غەش.

**مخالطه**- مص.ع(موخالەتە- muxalete): تێکەڵبوون، تێکەڵی کردن.

**مخالف**- ا.فا.ع(موخالیف- muxalif): دژ، ناکۆک، نەیار.

**مخالفت**- مص.ل.ع(موخالەفەت- muxalefet): دژایەتی کرن، سەرپێچی کرن.

**مخانق**- ا.ع(مەخانیغ- mexanix): قەڵادە، ملوانکە، گەردانە،

**مخاوف**- ا.ع(مەخاڤیف- mexavif): ئەو شتانەی باعیسی ترس بن.

**مخایل**- ا.ع(مەخایل- mexayîl): هەوری سەر قافڵەی باران، نیشانە.

**مخبر**- ا.فا.ع(موخبیر- muxbir): خەبەردەر، هەواڵدەر، ساڵوخدەر، هەواڵدز.

**مخبر**- ا.ع(مەخبەر- mexber): دەروونی کەس، ناخ.

**مخبط**- ص.ع(موخەببەت- muxebbet): شێتۆکە، کەسێک کە ئەقڵی تەواو نەبێ.

**مخت**- ا(موخت- muxt): ئومێد، تەما، تەماداری، ئومێدەواری.

**مختار**- ص.ع(موختار- muxtar): سەرپشک، ئازاد، خودان ئیختیار، هەڵبژاردە.

**مختال**- ص.ع(موختال- muxtal): لوتبەرز، خۆپەسەند.

**مخترع**- ا.فا.ع(موختەرئ- muxteri’): داهێنەر.

**مخترع**- ا.مف.ع(موختەرەء- muxtere’): داهێنراو.

**مختص**- ا.مف.ع(موختەس- muxtes): تایبەت، پسپۆر.

**مختصر**- ا.مف.ع(موختەسەر- muxteser): کورت و موختەسەر،

**مختفی**- ا.فا.ع(موختەفی- muxtefî): پەنهان، شاراوەو نادیار، کفن دز، پێوار.

**مختل**- ا.مف.ع(موختەلل- muxtell): پەریشان، شێواو، سست و بێ کەڵک.

**مختلس**- ا.فا.ع(موختەلیس- muxtelis): دز.

**مختلس**- ا.مف.ع(موختەلەس- muxteles): دزراو.

**مختلط**- ا.فا.ع(موختەلیت- muxtelit): تێکرژاو، تێکەڵاو.

**مختلف**- ا.فا.ع(موختەلیف- muxtelif): جیاوازیکەر، جۆراوجۆر، رەنگاو رەنگ، جیاواز.

**مختنق**- ا.فا.ع(موختەنیغ- muxtenix): خنکێنەر.

**مختوم**- ا.مف.ع(مەختووم- mextûm): مۆرکراو، ئەنجام دراو، بە ئەنجام گەیشتوو.

**مختون**- ا.مف.ع(مەختوون- mextûn): خەتەنەکراو.

**مخچه**- ا.(موخچە- muxçe): دەماغە چکۆڵە.

**مخدر**- ا.فا.ع(موخەددیر- muxeddir): سڕکەر، بەنجکەر.

**مخدرات**- ا.ع(موخەددەرات- muxedderat): ژنانی پۆشتەو حیجابدار.

**مخدرات**- ا.ع(موخەددیرات- muxeddrat): بەنگ دەرمانی بێهۆشکەر، وەک هرۆیین و کۆکایین..

**مخدره**- ا.مف.ع(موخەددەرە-muxeddere): ژنی پۆشتە.

**مخدع**- ا.ع(مەخدەء- mexde’): ژووری بچووک لە ناو ژووری گەورەدا، سەندوقخانە.

**مخدوس**- ا.مف.ع(مەخدوش- mexdûş): رووشاو.

**مخدوم**- ا.مف.ع(مەخدووم- mexdûm): خزمەتکراو، سەروەر، کەسیک غولام و نۆکەری هەبێ.

**مخده**- ا.ع(میخەددە- mixedde): پشتی، سەرین، بالیف، سەنیا.

**مخذول**- ا.مف.ع(مەخزوول- mexzûl): سەر شۆڕ، نائومێد.

**مخراق**- ص.ع(میخراق- mixrax): پیاوی دلاوا قۆز، جوامێر.

**مخرب**- ا.فا.ع(موخەریب- muxerrib): وێرانکار، خراپکار.

**مخرج**- ا.ع(مەخرەج- mexrec): جێی دەرچوون.

**مخرق**- ا.ع(مەخرەغ- mexrex): بیابانی وشک و برینگ، دەشتی کاکی بە کاکی.

**مخرق**- ا.فا.ع(موخەریغ- muxerrix): زۆر درۆزن.

**مخرقه**- ا.ع(مەخرەغە- mexrexe): درۆ، بوختانچی.

**مخروط**- ا.مف.ع(مەخرووت- mexrût): تاشراو، خەڕاتی کراو، شێوەیەکی ئەندازەییە لە وێنەی کەللە شەکر.

**مخزن**- ا.ع(مەخزەن- mexzen): عەمار، مەخزەن، کۆگا.

**مخزوم**- ا.مف.ع(مەخزووم- mexzûm): کەپوی کونکراو.

**مخصوص**- ا.مف.ع(مەخسووس - mexsûs): تایبەتی.

**مخضرم**- ص.ع(موخەزرەم- muezrem): پیاوی خەتەنە نەکراو، رەشێک کە باوکی سپی بێ، کەسێک هەردوو زەمانی جاهلیەت و ئیسلامی دی بێ، دەوراندیدە،

**مخطط**- ا.مف.ع(موخەتتەت- muxettet): خەت خەت، خەتدار، موقەلەم.

**مخطی**- ا.فا.ع(موختیئ- muxtî’): خەتاکار، کەسێک لەسەر رێگەی هەڵەو باوەڕی نادروست بێ.

**مخفف**- ا.فا.ع(موخەففیف- muxeffif): سووک کەرەوە.

**مخفف**- ا.مف.ع(موخەففەف- muxeffef): سووک کراوە.

**مخفوض**- ا.مف.ع(مەخفوز- mexfûz): دابەزێنراو، دابەزیو، نزم بوو.

**مخفی**- ص.ع(مەخفی- mexfî): شاراوە، پەنهان.

**مخل**- ا.فا.ع(موخیلل- muxill): ئاژاوەگێڕ، گەندەڵکار.

**مخلب**- ا.ع(میخلەب- mixleb): چنگ، چڕنۆک، نینۆکی باڵندان.

**مخلخل**- ا.ع(موخەل خەل- muxel xel): شوێنی خڕخاڵ لە پێدا، کونکراو.

**مخلد**- ص.ع(موخەللەد- muxelled): هەرمان، نەمر، جاویدان، هەمیشە.

**مخلص**- ص.ع(موخلیس- muxlis): دڵسۆز، دۆستی پاک و بێ ریاو بێ غەل و غەش.

**مخلص**- ا.ع(مەخلەس- mexles): ڕێگەی ڕزگاری، ڕێگەی خەلەسان.

**مخلص**- ا.مف.ع (موخلەس- muxles): پاک بووەوە.

**مخلصه**- ا.ع(موخەللەسە- muxellese): جۆرە ڕووەکێکە بۆ دەرمان بەکار دێ.

**مخلع**- ص.ع(موخەللە ء- muxelle’): پیاوی سست و بێ توانا.

**مخلف**- ا.فا.ع(موخلیف- muxlif): ئەوەی کەسێک بکات بەجێ نشینی خۆی، کەسی وەعدە بەخیلاف، ڕووەکێک دووبارە گەڵای دەرکردبێتەوە، کۆتری پەڕ لە پێ، کوڕی جوان.

**مخلف**- ا.مف.ع(موخەللەف- muxellef): لە پاش بە جێماو، پاشمەنە.

**مخلوط**- ا.مف.ع(مەخلووت- mexlût): ئاوێتە، تێکەڵ.

**مخلوع**- ا.مف.ع(مەخلوو ء- mexlû’): کەسێک لە مەقامی خۆی کەوتبێ، لێکەوتوو، هەڵکەندراو.

**مخلوق**- ا.مف.ع(مەخلووغ- mexlûx): خوڵقێنراو، ئافریدە.

**مخلی**- ا.مف.ع(موخەللا- muxella): شوێنی خاڵی، خاڵی کراو.

**مخمر**- ا.فا.ع(موخەممیر- muxemmir): تەخمیرکار، هەوێنکەر.

**مخمر**- ا.مف.ع(موخەممەر- muxemmer): تەخمیرکراو، هەوێنکراو.

**مخمس**- ا.مف.ع(موخەممەس- muxemmes): پێنج خشتەکی.

**مخمصه**- مص.ع(مەخمەسە- mexmese): برسێتی لە ڕادەبەدەر، ڕەنج و زەحمەت، گیرۆدە بوون و گرفتاری، قەرقەش، گێرەوکێشە، دەردو ئەرک.

**مخمل**- ا.ع(مەخمەل- mexmel): مەخمەل، مەخمەر، قوماشێکی نەرمی توکنە.

**مخملک**- ا(مەخمەلەک- mexmelek): نەخۆشییەکی درمە، زیاتر تووشی منداڵان دەبێ.

**مخمور**- ا.مف.ع(مەخموور- mexmûr): مەست، خومار.

**مخنث**- ص.ع(موخەننەس- muxennes): پیاوی ئەتوار ژنانە، نێرەموک، پیاوی خراپ و دڵڕەش، موخەنەت.

**مخنق**- ا.فا.ع(موخەننیغ- muxennix): خنکێنەر.

**مخنق**- ا.فا.ع(موخەننەغ- muxennex): خنکێنراو، شوێنی پەت لە گەردنی لە سێدارەدراو.

**مخنقه**- ا.ع(میخنەغە- mixnexe): ملوانکە، گەردنبەن، مێخەکبەند، خەناوکە.

**مخنوق**- ا.مف.ع(مەخنووغ- mexnûx): خنکێنراو.

**مخوف**- ص.ع(مەخوف- mexûf): ترسناک، مایەی ترس.

**مخیدن**- مص.ل(مەخیدەن- mexîden): خزین، جمین، جووڵان.

**مخیده**- ا.مف(مەخیدە- mexîde): جووڵاو، جماو، خزیو.

**مخیر**- ص.ع(موخەییەر- muxeyyer): خاوەن ئیختیار، هەڵبژاردە.

**مخیز**- ا(مەخیز- mexîz): مامیز.

**مخیط**- ا.ع(میخیەت- mixyet): دەرزی، گوزەرگە، دلیوان، سوژن.

**مخیط**- ا.مف.ع(مەخیت- mexit): دوراو.

**مـخـیله**- ا.ع(مـەخـیله- mexîle): هەورێ بارانی پێوەبێ، خەیاڵ.

**مخیله**- ا.ع(موخەییله- muxeyyile): وزەی خەیاڵ و وێنا.

**مـخـیم**- ا.ع(مـوخـەییـەم- muxeyyem): خێوەتگە، هۆبە.

**مد**- ا(مەد- med): تەل، پرد، رۆژی شەشەمی هەر هەیڤێکی هەتاوی.

**مد**- مص.ع(مەدد- medd): درێژکردن، لافاوو هەستانی ئاوی دەریا.

**مد**- ا.ع (مەدد- medd): نیشانەیەکە لەسەر ئەلفی درێژدادەنرێ.

**مـد**- ا.فـر(مـود- mud): مـۆد، مـۆدی رۆژ، سەلیقە، شێواز، شێوە.

**مداجات**- مص.ع(مـوداجـات- mudacat): مـــوداراو دڵ راگـــرتنی دژمن و شـــاردنەوەی دژمنایەتی.

**مداح**- ص.ع(مەدداھ- meddah): ستایشکار.

**مـداخل**- ا.ع(مـەداخـیل- medaxil): جـێی داخڵ بوون.

**مـداخله**- مص.ع(مـوداخـەلە- mudaxele): خۆ هەڵقورتاندن لە کاری کەسێک.

**مداد**- ا.ع(میـداد- midad): خامە، قەڵەمی رەش، قەڵەم رەساس، میداد.

**مـدار**- ا.ع(مەدار- medar): خـولگە، شـوێنی خولانەوەو سوڕانەوە.

**مـدارات**- مص.ل.ع(مـودارات- mudarat): مدارا، دڵڕاگرتن، رەفتارکرن دەگەڵ کەسێکدا بە نەرمی، نەرمی نواندن.

**مـــدارج**- ا.ع(مـــەداریج- medaric): پلە، پاچینە، قاڵدرمە، نەردەوان، پەیژە.

**مـــدارس**- ا.ع(مـــەداریس- medaris): قوتابخانان.

**مـداعـبـه**- مص.ل(مـودائەبە- muda'ebe): شۆخی کردن، سوعبەتکرن، گەمەکردن.

**مدافع**- ا.فا.ع(مودافیئ- mudafi'): داکۆکیکار، کەسێک شتێک پاڵ پێوەنێ رەتی بکاتەوە.

**مدافعه**- مص.م.ع(مودافەئە- mudafe'e): سینگ لەبەر سینگ نان، یەکتر دوورخستنەوە، لایەنگرتنی کەسێک.

**مـداقـه**- مص.ل.ع(مـوداغـغـە- mudaxxe): وردبینیکردن، وردی و دیقەت لە حیسابدا.

**مدال**- ا.فر(میدال- midal): میداڵ، مەدالیا، نیشانە.

**مـدالسه**- مص.ع(مـودالەسـە- mudalese): تەفرەدان، خاپاندن، فریودان و زوڵم کردن.

**مدام**- ا.ع(مودام- mudam): مەی، شەراب، بارانی بەردەوام، هەمیشە.

**مـداوات**- مص.م.ع(مـوداڤـات- mudavat): دەرمانکرن، مالیجەکردن.

**مـــداولـت**- مـص.ل.ع(مـــوداڤـــەلـەت- mudavelet): گـــەڕانی چەرخی رۆژگـــار، سووڕان.

**مـداوم**- ا.فـا.ع(مـــوداڤـیم- mudavim): بەردەوام.

**مـــداومـت**- مـص.م.ع(مـــوداڤـــەمـــەت- mudavemet): دەوام دان، درێژەدان.

**مداهنه**- مص.ل.ع(موداهەنە- mudahene): فـــریودان، خـــاپاندن، دووڕوویی کـــردن، زمانلووسی.

**مدایح**- ا.ع(مەداییـھ- medayih): مـەدح و ستایشان.

**مـداین**- ا.ع(مـەداین- medayîn ): شاران، ناوی شاری تەیسەفون بووە.

**مدبر**- ا.فا.ع(مودبیر- mudbir): پاشڤەڕۆ.

**مـــدبر**- ص.مف.ع(مـــودبەر- mudber): بەدبەخت.

**مـدبر**- ا.فـا.ع(مـودەببـیـر- mudebbir): تەگبیرکەر، چارەکەر.

**مـــدبوغ**- ا.مف.ع(مـــەدبوغ- medbûx): پێستی خۆشەکراو، پێستی دەباغی کراو.

**مـدت**- ا.ع(مـوددەت- muddet): کـات و وەختی دیاریکراو، کات.

**مـدثر**- ا.فـا.ع(مـودەسـسـیـر- mudessir): پۆشـتـە، کـەسـێـک خـۆی لە عـەباو جل و بەرگـەوە پێچابێ.

**مـدح**- مص.م.ع(مـەدە- medh): سـتـایش کردن، مەحتکردن.

**مـدخل**- ا.ع(مـەدخـەل- medxel): دەرگـا، شوێنی چوونە ژوورەوە، دەروازە.

**مدخل**- ص.ع(مودخەل- mudxel): هەتیوچە، لەگام، زرکوڕ.

**مدخنە**- ا.ع(میدخەنە- midxene): ئاگردان، مەقلّی، کوانگ.

**مـدخـول**-ا.مف.ع(مـەدخـوول- medxûl): تێخراو، کەسێک ئەقلّی تێک چووبێ.

**مـدد**- ا.ع(مـەدەد- meded): کـۆمـەک، یارو یاوەر، هاوکاری، فریارەس.

**مددکـار**- ص.فـا(مـەدەدکـار- mededkar): کۆمەک کار، یار، یاوەر، دۆست و هاوکار.

**مـدر**- ا.ع(مـەدەر- meder): کـلـۆ کـەسـتـەک، گوند.

**مـــدر**- ا.فـــا.ع(مــــودیر- mudirr): دەرمـان یان هەر خـواردنێک کـە پێـشـاو زیاد بکات.

**مـدرب**- ا.مف.ع(مـودەرەب- muderreb): مەشقدراو، ئەزموندار، کارامە، گرفتاری بەلاّ.

**مـــدرج**- ا.ع(مـــــەدرەج- medrec): شـوێنی رۆییـشـتن و تێ پەڕین، رێ و رێبـاز، مەزەب.

**مدرج**- ا.مف.ع(مـودەڕەج- mederrec): پلە پلە.

**مـدرج**- ا.ع(مـودرەج- mudrec): تۆمـار، کتێب، نامە، پێکەوە پێچراو.

**مـدرجـە**- ا.ع(مـەدرەجـە- medrece): هەر رێگەو هۆیەک بۆ وەدەست هێنانی پایەو پلەی بەرزتر بگیرێتەبەر.

**مدرس**- ا.ع(میـدرەس- midres): کـتـێـبێـک دەرسی لەسـەر بگوترێتـەوە، شـوێنی دەرس گوتنەوە.

**مـدرس**- ا.فـا.ع(مـودەریس- muderis): ماموّستا، دەرسکار.

**مـدرسـە**- ا.ع(مـەدرەسـە- medrese): قوتابخانە، شوێنی وانە گوتنەوە.

**مــدرک**- ا.ع(مـــەدرەک- medrek): کـات و شـوێنی دەرک کـردن، بەلّگە، قـەوالّە، سەنەد.

**مدرک**- ا.فا.ع(مودریک- mudrik): زیرەک، هوشیار، زووحالّی،

**مـدرکـات**- ا.ع(مـودریکات- mudrikat): پێنج هەستەکە.

**مـدرکـە**-ا.فـا.ع(مـودریکە- mudrike): دەرککەر، زیرەک، هوشیار، زووحالّی.

**مدرن**- ص.فر(مودیرن- mudirn): نوێ، تازە، هاوچەرخ، مۆدی رۆژ.

**مدرنیسم**- ا.فر(مودیرنیسم- mudirnîsm): شێوازی نوێ.

**مدروس**- ص.ع(مەدروس- medrûs): کۆن و رزیو، شێت و دێوانە.

**مـدعـو**- ا.مف.ع(مـەدئوڤ- med'uv): دەعوەتکراو، بانگکراو.

**مـدعی**- ا.مف.ع(مـوددەئا- mudde'a): ویستراو، ئارەزوو، داواکراو.

**مـدعی**- ا.فـا.ع(مـوددەئی- mudde'î): داواکەر.

**مـدغم**- ا.مف.ع(مـودغـەم- mudxem): دوو پیت بچنە ناو یەک و ببن بە یەک پیت.

**مـدفع**- ا.ع(مـەدفـەء- medfe'): شـوێنی کۆبوونەوەی ئاو، ئاوەڕۆی ئاو، کونج، رەهەند.

**مـدفع**- ا.ع(میـدفـەء- midfe'): تۆپ، مەترەلۆز.

**مدفوع**- ا.مف.ع(مەدفووء- medfû'): گوو، پیسی.

**مدفن**- ا.ع(مەدفەن- medfen): شوێنی ناشتن، گۆڕستان، قەورستان.

**مدفون**- ا.مف.ع(مەدفوون- medfûn): نێژراو، بەخاک سپێردراو.

**مدقق**- ا.فا.ع(مودەغغیغ- mudexxix): بەدیقەت، وردبین.

**مدقوق**- ا.مف.ع(مەدغووغ- medxûx): باریک و بنێس، تێداو، کوتراو.

**مدل**- ا.ع(مودیلل- mudill): دەلیل، ڕێنوێن، کەسێک باوەڕو متمانەی بە خۆی هەبێ.

**مدل**- ا.فر(مودیل- mudil): مۆدێل، نموونە، سەرمەشق.

**مدلس**- ا.فا.ع(مودەللیس- medellis): خاپینۆک، عەوام خەڵەتێن، کەسێک کە عەیبی خۆی یان عەیبی کاڵای خۆی وەشێرێ.

**مدلل**- ا.مف.ع(مودەللەل- mudellel): قسەکردن بە بەڵگەوە.

**مدلول**- ا.مف.ع(مەدلوول- medlûl): ماناو چەمک و دەلالەت، ڕێنوێنی کراو.

**مدلهم**- ص.ع(مودلەهیم- mudlehim): رەش، تاریک، شەوی تاریک، تاریک و نوتەک.

**مدموغ**- ا.مف.ع(مەدمووغ- medmûx): کەسێک سەری شکابێ و زیان بە مێشکی گەیی بێ، گەوج، دەبەنگ، کەودەن، گەلحۆ.

**مدن**- ا.ع(مودون- mudun): شاران.

**مدنگ**- اا(مەدەنگ- medeng): کلیل، پەڕەی قفڵ، پشتکۆڵ، کلۆمی دەرگا، کێلۆن.

**مدنی**- ص.ن.ع(مەدەنی- medenî): شاری، شارستانی.

**مدور**- ص.ع(مودەڤڤەر- medevver): خڕو بازنەیی، جۆرە شیعرێکە کە بە شێوەی بازنەیی دەنووسرێ و دەشێت لە هەر وشەیەکییەوە دەست پێ بکەی و بیخوێنییەوە.

**مدوز**- ا.فر(میدووز- midûz): جۆرە گیانەوەرێکی مەرجانی بزۆزە.

**مدون**-ا.مف.ع(مودەڤڤەن- medevven): کۆکراوەو تۆمارکراو، ئەو شیعرانەی لە دیواندا کۆکرابێتەوە.

**مدهش**- ا.فا.ع(مودهیش- mudhiş): سەرسامکەر، شتێ مایەی سەرسامی بێ.

**مدهوش**- ا.مف.ع(مەدهووش- medhûş): سەرسام، سەرگەردان، گێژ، حەیرماو، بێهۆش.

**مدهون**- ا.مف.ع(مەدهوون- medhûn): چەورکراو، پێستی دەباغی کراو، چەرمی رەنگ کراو.

**مدیاتور**-ا.فر(میدیاتوور- midyatûr): پێناو، میانچی.

**مدیح**- ا.ع(مەدیح- medîh): ستایش، جۆرە شیعرێکە.

**مدیحه**- ا.ع(مەدیهە- medîhe): ستایش. مەحت.

**مدید**- ص.ع(مەدید- medîd): درێژ، ناوی بەحرێکی شیعرییە.

**مدیر**- ا.فا.ع(مودیر- mudîr): بەڕێوەبەر، کەسێک کارێک بەڕێوە ببات.

**مدیست**- ا.فر(مودیست- mudîst): مۆدساز.

**مدینه**- ا.ع(مەدینە- medîne): شار.

**مدیوم**- ا.فر(میدیووم- midyûm): چارە.

**مدیون**- ص.ع(مەدیوون- medyûn): قەردار، قەرزار.

**مذاب**- ا.مف.ع(موزاب- muzab): تواوە.

**مذابح**- ا.ع(مەزابیه- mezabih): قەساوخانە.

**مذاق**- ا.ع(مەزاغ- mezax): تام، چەژ، شوێنی هەستی تامکردن.

**مذاکره**- مص.ع(موزاکەرە- muzakere): گفتوگۆ لەسەر شتێک.

**مذاهب**- ا.ع(مەزاهیب- mezahib): مەزهەبان، ئاینیان.

**مذبح**- ا.ع(مەزبەح- mezbeh): کوشتارگە، جێی قوربانی کردن.

**مذبذب**- ا.فا.ع(موزەبزیب- muzebzib): دوو دڵ و ڕاڕا، بوختانچی و دوو ڕوو.

**مذبوح**- ا.مف.ع(مەزبوح- mezbûh): سەربڕاو.

**مذکر**- ص.ع(موزەککەر- muzekker): پیاو، نێرینە.

**مذکر**- ا.فا.ع(موزەککیر- muzekkir): وەبیرهێنەوە، واعیز، وەعزدادەر.

**مذکور**- ا.مف.ع(مەزکوور- mezkûr): ناوبراو.

**مذل**- ا.فا.ع(موزیلل- muzill): زەلیلکەر.

**مذلت**- مص.ل.ع(مەزەللەت- mezellet): زەلیل بوون، ڕیسوابوون، ڕەزیلبوون.

**مذمت**- مص.م.ع(مەزەممەت- mezemmet): زەم کردن، خراپەگوتنی کەسێک یان شتێک.

**مذموم**- ا.مف.ع(مەزموم- mezmûm): زەمکراو،

**مذنب**- ص.ع(موزنیب- muznib): گوناهکار.

**مذنب**- ص.ع(موزەننەب- muzenneb): کلکدار.

**مذهب**- ا.ع(مەزهەب- mezheb): ڕێ و ڕێباز، ئایینزا.

**مذهب**- ا.مف.ع(موزەههەب- muzehheb): زەرکفت، شتێ لە ئاوی زێڕ گیرابێ.

**مذهبات**- ا.ع(موزەههەبات-muzehhebat): حەوت قەسیدەی عەرەبی بووە کە لە زەمانی جاهیلیەتدا لە دوای حەوت قەسیدە هەڵواسراوەکەوە هاتوون.

**مذی**- ا.ع(مەزیی- mezî): ئاوێ کە لە زاری حەوز یان کارێز بڕوات، ئەو ئاوەی کە بەدەم یاری کردنەوە لەگەڵ ژندا لە کێری پیاو دێت و لەشی پێ پیس نابێ و پێویست بە غوسڵ دەرکردن ناکات..

**مذیل**- ص.ع(موزەییەل- muzeyyel): کراسی شۆڕ، کتێبێ پاشکۆی هەبێ.

**مر**- (مەر- mer): ئامرازی پەیوەندییە

**مر**- ا.(مەر- mer): حەساو، ژمارە.

**مر**- ص.ع(موڕ- murr): تاڵ، شۆکەی درەخت.

**مر**- مص.ع(مەر- merr): تێپەڕین، ڕۆییشتن و تێپەڕین بەسەر شتێکدا.

**مراء**- مص.ل.ع(میراء- mira’): شەڕکردن، بەگژ یەکداچوون.

**مراات**- مص.م.ع(موراَئات- mura’at): نیشاندانی پێچەوانەی واقیع، ڕیا کردن.

**مرائی**- ا.فا.ع(موراَئی- muraî): ڕیاکار، خۆ نوێن.

**مرابحه**- مص.م.ع(مورابەهە- murabehe): پارەدان بە قازانج.

**مرابض**- ا.ع(مەرابیز- merabiz): ئاغەڵی شەوانەی پەزان، ماواو لانەی شێرو گورگ...

**مرابط**- ا.ع(مەرابیت- merabit): شوێنی بەستنەوەی ئەسپ و هێسترو کەرو وشترو...

**مرابطه**- مص.ل.ع(مورابەتە- murabete): ئاگاداری کردن، پەیوەندی هەبوون.

**مرات**-ا.ع(مەڕات- merrat): کەڕەت، جار.

**مراتب**- ا.ع(مەراتیب- meratib): پلەو پایە، کەڕەت و جاران.

**مراتع**- ا.ع(مەراتیع- merati’): لەوەڕگە، پاوەنان.

**مراثی**- ا.ع(مەراسی- merasî): شیوەننامە، سەردولکە، لاوانەوە.

**مراجع**- ا.ع(مەراجیع- meraci’): مەرجەعی ئاینی، ئەو زانا ئاینیانەی کە خەڵکی لە مەسەلە شەرعییەکاندا چاویان لێدەکەن، سەرچاوە..

**مراجع**- ا.فا.ع(موراجیع- muraci’): ژنێک پاش مەرگی مێردەکەی بۆ ماڵ باوکی بگەڕێتەوە.

**مراجعت**- مص.ع(موراجەئەت-murace’et): گەڕانەوە، پێداچوونەوە.

**مراحل**- ا.ع(مەراهیل- merahil): قۆناغان.

**مراحم**- ا.ع(مەراهیم- merahim): میهرەبانیان.

**مراد**- ا.مف.ع(موراد- murad): مراز، مراد، ویستراو.

**مرادف**- ا.فا.ع(موراديف- muradif): ریز، ئەو شتانەی بەریز دێن، وشەێن هاومانا.

**مرار**- ا.ع(میرار- mirar): جار، جاران.

**مرار**- ا.ع(موراز- muraz): جۆرە گیایەکی دڕکنە.

**مرارت**- مص.ل.ع(مەرارەت- meraret): تاڵبوون.

**مراره**- ا.ع(مەرارە- merare): سەفرا، زراو، زاڵی.

**مرازبه**-ا.ع(مەرازیبە- merazibe): مەرزەوان، پاسەوانی سنوور.

**مراس**- مص.م.ع(میراس- miras): چارەکردن.

**مراسله**- مص.ل.ع(موراسەلە- murasele): نامە ناردن بۆ یەکدی، نامەکاری.

**مراسم**- ا.ع(مەراسیم- merasim): ڕێ و رەسمان، دابو نەریتان.

**مراش**- ا.(مەراش- meraş): رشانەوە.

**مراشد**- ا.ع(مەراشید- meraşid): ڕێگەیێن ڕاست و دروست.

**مراصد**- ا.ع(مەراسید- merasid): روانگە.

**مراعات**- مص.ل.ع(مورائات- mura’at): رەچاوکردن، ریعایەتکردنی یەکتر، مەداراکردنی یەکدی، دڵڕاگرتنی یەکدی، پاراستنی شتێک.

**مراعی**- ا.ع(مەرائی- mera’î): پاوان و لەوەڕگە.

**مراغه**- ا.ع(مەراغە- meraxe): شوێنی گەوزینی چارەوێ، گەوزانگە، گەوزینگە.

**مرافعه**- مص.ل.ع(مورافەئە- murafe’e): شکایەت بردنە لای حاکم یان قازی، مورافەعە، شەڕو دەعوا.

**مرافقت**- مص.ل.ع(مورافەغەت- murafexet): بوونە هاوڕێ و رەفیق، هاوڕێ و هاوسەفەر بوون.

**مراقب**- ا.فا.ع(موراغیب- muraxib): چاودێر، نیگابان، پاسەوان.

**مراقبت**- مص.م.ع(موراغەبەت- muraxebet): چاودێری کردن، پاسەوانی کردن.

**مراقد**- ا.ع(مەراغید- meraxid): مەرقەد، مەزار، گڵکۆ، قەور، ئارامگە.

**مراکب**- ا.ع(مەراکیب- merakib): هەرشتێ بۆ سواری بشێ.

**مراکز**- ا.ع(مەراکیز- merakiz): چەق، چەقی بازنە، بنکە، بارەگا، مەڵبەندان.

**مرال**-ا.ت(مەرال- meral): ئاسک، مامز.

**مرام**- ا.ع(مەرام- meram): مراز، ئامانج، ئاوات.

**مران**- ا.ع(موڕان- murran): درەختێکە لقەکانی راست و درێژو گرێگرتییە، نێزەی لێ دروست دەکەن.

**مراوح**-ا.ع(مەراڤیه- meravih): باوەشێن، پانکە.

**مراوده**- مص.ل.ع(موراڤەدە- muravede): هاتوچۆ کردنی کەسێک.

**مراهق**- ا.ع(موراهیغ- murahix): هەرزەکار، کوڕی تازە بالق.

**مراهم**- ا.ع(مەراهیم- merahim): مەرهەم، هەتوان، مەڵحەم.

**مراهنه**- مص.ع(موراهەنە- murahene): گرەو کردن، مەرجکردن لە پێشبڕکێی ئەسپ تاودانێ.

**مرایا**- ا.ع(مەرایا- meraya): ئاوێنە، خۆدیک، گوزگی، نەینک.

**مرء**-ا.ع(مەرء-mer’): پیاو

**مرات**- ا.ع(مەرئات-mer’at): دیمەن

**مـرات**- ا.ع (مـیـرئات-mir’at): گـوزگی، خودیک، ئاوێنە، نەینک.

**مـــــــرأه**-ا.ع(مــــــــەرئـە- mer’e): ژن، ئافرەت.

**مرئوس**- ا.ع(مەرئووس- mer’us): کەسێک لەبەر دەستی کەسێکدا کار بکات، فەرمانبەر، کارمەند.

**مرئی**- ا.ع(مەرئا- mer’a): جێیەک شتێکی لێوە بدینرێ.

**مـرئی**- ا.ع(مـەرئی- mer’î): بینراو، دیار، خویا، بەرچاو.

**مـــــربا**- ا.ع(مــــــوورەبا- murebba): پەروەردەکراو، تەربێت دراو، مـرەبا، میـوەیەک لە شیلەی شەکردا کوڵێنرابێ.

**مـربض**- ا.ع(مـەربیـز- merbiz): شـوێنی حەوانەوەی چارەوێ و گاگەل و پەزان.

**مــربط**- ا.ع(مــەربیت- merbit): جـێی بەستنەوەی چارەوێ.

**مـربع**- ص.ع(مــوورەببــە ء- murebbe’): چوارگۆشە.

**مــربوب**- ا.مف.ع(مــەربووب- merbûb): پەروەردەکراو، بەندەو غولام.

**مــربوط**- ا.مف.ع(مــەربووت- merbût): بەستراو.

**مـربی**- ا.فـا.ع(مــوورەببی- murebbî): پەروەردەکار.

**مــــرتاض**- ص.ع(مـــــورتاز- murtaz): چلەکێشی بە مەبەستی رام کردن و پەروەردەکردنی نەفس، نەفسکوژی بەمەبەستی خواپەرستی و عیبادەت.

**مـرتب**- ا.مف.ع(مـورەتتـەب- muretteb): رێکخراو، رێکو پێککراو.

**مـرتبـان**- اا(مـەرتەبان- merteban): قـاپی چینی.

**مــرتبط**- ص.ع(مــــورتەبیت- murtebit): پێکەوە بەستراو.

**مرتبه**- ا.ع(مەرتەبە- mertebe): پلەو پایە.

**مرتجع**- ا.فا.ع(مورتەجیء- murteci’): کۆنە پەرست.

**مـرتجل**- ا.مف.ع(مـورتەجـەل- murtecel): شـیـعـرێ راسـتـەو خـۆو بێ وەسـتـان بگوترێ، قـسـەیەک بێ بیـرکـردنەوە بکرێ، راسـتـەوخـۆو سەرپێیی.

**مـرتجی**- ا.فـا.ع(مـــورتەجی- murtecî): ئومێدەوار.

**مـرتد**- ص.ع(مــورتەدد- murtedd): لەدین وەرگەڕاو.

**مرتسم**-ا.مف.ع(مـوتەرسەم- murtesem): نەخش و رەسم لەسەر کراو.

**مــرتشی**-ا.فـا.ع(مـــورتەشی- murteşî): بەرتیل خۆر.

**مـــــرتضی**- ص.ع(مـــــورتەزا- murteza): هەڵبژاردە، پەسندکراو، خۆشحاڵو شادومان.

**مـــــرتع**- ا.ع(مــــــەرتە ء- merte’): پاوان، لەوەڕگە، مێرگ، سەوزەزار.

**مـرتعب**- ا.فـا.ع(مـورتەئیب- murte’ib): ترساو.

**مـرتعش**- ا.فـا.ع(مـورتەئیش- murte’iş): لەرزیو.

**مرتفع**- ا.فا.ع(مورتەفیء- murtefi’): بەرز، چیا، بەرزایی.

**مـرتک**- اا(مــورتەک- murtek): جـەوهەری قورقۆشم.

**مـرتکب**-ا.فـا.ع(مـورتەکـیب- murtekib): کـەسـێک کـارێک ئەنجـام بدات یان گـوناحـێک بکات.

**مـرتکز**- ا.فـا.ع(مـورتەکـیـز- murtekiz): جێگیر، بەرقەرار، شتێک لە جێی خۆی بێ.

**مـرتکو**- اا(مـەرتەکوو- mertekû): چۆلەکـە، پاساری، مەلوچک.

**مرتهن**- ا.مف.ع(مورتەهەن- murtehen): بارمتە، رەهنکراو.

**مرثیه**-ا.ع(مەرسییە- mersiye): شیعری شین و لاوانەوە، سەردولکە.

**مرج**- مص.م.ع(مەرج- merc): هەراو هەنگامە بەرپاکردن، گەندەڵی و نیگەرانی بەرپاکردن.

**مرج**- ا.ع(مەرج- merc): میرگ، لەوەڕگە، پاوان، سەوزەزار.

**مرجان**- ا.ع(مەرجان- mercan): مەرجان، زیندەوەرێکی دەریاییە، مرواری.

**مرجانه**- ا.ع(مەرجانە- mercane): یەک مەرجان، مرواری بچووک.

**مرجب**- ص.ع(مورەججەب- murecceb): سامدار، گەورەو شکۆدار، بەشان و شەوکەت.

**مرجح**- ا.مف.ع(مورەججەه- murecceh): تەفزیل پێدان.

**مرجع**- ا.ع(مەرجیئ- merci’): سەرچاوە، شوێنی گەڕانەوە.

**مرجل**- ا.ع(میرجەل- mircel): مەنجەڵ، قازانی گەورە.

**مرجمک**- اا(مەرجومەک- mercumek): نیسک.

**مرجو**- ا.مف.ع(مەرجوڤ- mercuv): ئومێدەوار، هیوادار، ئاواتەخواز.

**مرجوع**- ا.مف.ع(مەرجوء- mercu’): گەڕاوە، وەڵامی نامە، وەڵامنامە.

**مرجوع**-ا.مف.ع (مەرجووم-mercûm): بەردبارانکراو، نەفرەت لێکراو، وەدەرنراو، سەنگ واران کراو.

**مرح**- مص.ل.ع(مەرەه- mereh): شادبوون، ڕژانی فرمێسک لە چاو، لەنجەکردن بە نازەوە.

**مرح**- ص.ع(مەریه- merih): شادمان.

**مرحب**- ا.ع(مەرهەب- merheb): مەرحەبا، پێشوازی گەرم، جێ گوشادە، بە هاتنت سەغڵەت نیم.

**مرحله**- ا.ع(مەرهەلە- merhele): قۆناغ، مەنزڵ.

**مرحمت**- ا.ع(مەرهەمەت- merhemet): میهرەبانی، سۆزو رەحم.

**مرحوم**-ا.مف.ع(مەرهووم- merhûm): مەرحوم، رەحمەتی، خوالێخۆش بوو.

**مرخ**- ا.ع(مەرخ- merx): دارێک زوو ئاگر بگرێ، دەستەچیلە.

**مرخشه**- ص(مەرەخشە- merexşe): نەحس، شوم، بەدێوم.

**مرخص**- ا.مف.ع(مورەخخەس-murexxes): روخسەتدراو، ئازادکراو، مەرەخەس کراو، هەرزانکراو.

**مرخم**- ا.مف.ع(مورەخخەم- murexxem): کلک بریاگ، شتێک کە دواییەکەیان بری بێ، زەوی بە مەرمەڕ فەرشکراو.

**مرد**- اا(مەرد- merd): پیاو، دلێرو ئازاو پیاوانە.

**مرداء**- ا.ع(موردەداء- mureda’): خوازیاران.

**مرداب**- ا.مر(مورداب- murdab): گۆلاوی وەستاو، چلپاو.

**مرداد**- ا.(مورداد- murdad): مانگی پێنجەمی هەتاوی.

**مردار**- ا.ص(مورداد- murdar): مردار، مردارەوە بوو، گیانلەبەری مردار کە سەر نەبڕابێ.

**مردار خور**- ص.فا (مورداد خوور- murdarxûr): مردارخۆر، کەلاکخۆر.

**مردار سنگ**- ا.مر(مورداد سنگ- murdar seng): جەوهەری قورقوشم، مردەسەنگ، مەرداسەنگ.

**مرداس**- ا.ع(میرداس- mirdas): سەر.

**مردافکن**- ص.فا(مەردئەفکەن- merd efken): بەهێزو بازوو.

**مردانه**- ص.ن(مەردانە- merdane): پیاوانە، مەردانە.

**مردد**- ص.ع(موردەدەد- muredded): دوو دڵ، سەرگەردان، ڕاڕا.

**مردک**- ا(مەردەک- merdek): پیاوی چکۆڵە، بۆرە پیاو.

**مردم**- ا(مەردوم- merdum): مەردم، خەڵکی، بیلبیلەی چاو.

**مردم ازار**- ص.فا(مەردوم ئازار- merdum azar): زاڵم، کەسێک خەڵکی ئازار بدات، موزیر.

**مردمخوار**- ص.فا(مەردوم خار- merdum xar): بنیادەم خۆر.

**مردم دار**- ص.فا. (مەردوم دار- merdum dar): مرۆڤ دۆست، مرۆڤپەروەر.

**مردمسار**- ص.مر(مەردوم سار- merdum sar): مرۆڤ ئاسا، مرۆڤانە.

**مردم شناسی**- ا.مص(مەردوم شیناسی- merdum şinasî): ئەنترۆپولۆژی، کۆمەڵناسی.

**مردمک**- ا(مەردومەک- merdumek): رەشێنەی چاو، بیلبیلەی چاو.

**مردم گزا**-ص.فا(مەردوم گەزا-merdum-geza):زاڵم، زۆردار، ئازاردەری خەڵکی، موزیر،

**مردمە**- ا(مەردومە- merdume): بیلبیلەی چاو.

**مردن**- مص.ل(موردەن- murden): مردن، مەرگ.

**مردنگی**- ا(مەردەنگی- merdengî): فانۆسی گەورەی شوشەیی کە سەرو بنی کراوەیەو مۆم یان چرای تێدا دادەنەن.

**مردود**- ا.مف.ع(مەردود- merdûd): رەت کراوە، رەفزکراو، دەرنەچوو.

**مردە**- ا.ع(مەرەدە- merede): سەرکێشان، شەقاوەو لەخۆ رازیان.

**مردە**- ص(موردە- murde): مردوو، مردگ، فەوتیاگ.

**مردەدل**- ص.مر(موردەدیل- murdedil): دڵمردوو، خەمبار، مەلوول، کەساس.

**مردە ریگ**- ا.مر(موردەریگ- murde rîg): میراتی، ئەوەی لە پاش مردگ بەجێ دەمێنێ.

**مردەشو**- ا.ص(موردەشوو- murde şû): موردو شۆر.

**مرز**- ا(مەرز- merz): مەرز، سنوور، سەرحەد، ئاقار.

**مرز**- ا(مورز- murz): قوون، کونی قوون.

**مرزبان**- ا.ص(مەرزبان- merzban): مەرزەوان، پاسەوانی سنوور.

**مرزدار**- ا.ص(مەرزدار- merzdar): مامووری سوپایی کە بۆ پاسەوانی سنورری وڵات دابنرێ.

**مرزداری**- ا. (مەرزداری- merzdarî): دایەرەی گاردی سنوور.

**مرزغان**- ا(مەرزەغان- merzexan): گۆڕستان، قەورسان.

**مرزنگوش**- ا(مەرزەنگووش- merzengûş): گیایەکی بۆنخۆشە لە رێحانە دەچێت، مەرزنجوش.

**مرزو**- ا(مەرزوو- merzû): زەوییەک بۆ زەراعەت ئامادەکرابێ.

**مرزوبوم**- ا.مر(مەرزوبووم- merzû bûm): خاک و وڵات، مەرزو بوم.

**مرزوق**- ا.مف.ع(مەرزووغ- merzûx): بەختەوەر، رزقدراو، سەر بە رزق.

**مرزە**- ا(مەرزە- mereze): گیایەکە بە کاڵی و بە کوڵاوی دەخورێ.

**مرزیدن**- مص.م(مەرزیدەن- merzîden): گان کردن، جووتبوون.

**مرزش**- ا.مص(مەرزیش- merziş): گان.

**مرزندە**- ا.فا(مەرزەندە- merzende): گانکەر.

**مرزیدە**- ا.مف(مەرزیدە- merzîde): گاندەر، گایراو.

**مرس**- ا.ص(مەرەس- meres): میوەی مێخۆش، مزر.

**مرس**- مص.م.ع(مەرس- mers): لەئاوکردنی دەرمان و بەدەست سوینەوەی تا لە ئاوەکەدا حەل بێ و بتوێتەوە.

**مرس**- ص.ع(مەریس- meris): پیاوی بە تەجرەبەو کارامە.

**مرس**- اا(مەرەس- meres): پەت، پەتێ کە لە ملی سەگ بکرێ.

**مرس**- ا.فر(مورس- murs): گیانلەبەرێکی گواندارە لە وشکایی و لە دەریادا دەژی، گیانلەبەرێکی وشکاوییە.

**مرس**- اا(مورس- murs): ناوی داهێنەرێکی ئەمریکاییە کە لە سالی ١٨٣٥ یەکەم ئامێری تەلەگرافی دروست کردو ئەلفبایەکی تایبەتی بۆ دانا کە بە ئەلفبای مۆرس بەناوبانگە.

**مرسل**- ا.مف.ع(مورسەل- mursel): نێردراو، پەیام هێن.

**مرسله**- ا.مف.ع(مورسەلە- mursele): نێردراو، هەلواسراو، گەردنبەنی درێژ کە بکەوێتە سەر سینگ و بەرۆک.

**مرسوم**- ا.مف.ع(مەرسووم- mersûm): نامە، فەرمان، دەستوور، نامەو فرمانێک کە لەلایەن والی یان حاکمەوە نووسرابێ، رێ و رەسم و داب و نەریت و خووخدە.

**مرش**- مص.م.ع(مەرش- merş): روشاندن، زەوییەک باران روشاندبێتی.

**مرشح**-ا.ع(میرشەح- mirşeh): عەرەقگیر، لبادێ کە لە ژێر زینەوە دەخرێتە سەر پشتی ئەسپ تا ئارەقەی ئەسپەکە هەلمژێ، نەرمەزین.

**مرشح**- ا.مف.ع(مورەششەح- mureşşeh): پەروەردەو ئامادەکراو بۆ کارێک، پالێوراو.

**مرشد**- ا.فا.ع(مورشید- murşid): رێبەر، رێنوێن، دەلیل، پیشاندەری رێی راست.

**مرصاد**- ا.ع(میرساد- mirsad): روانگە، شوێنی دیدەوان، حەشارگە.

**مرصد**- ا.ع(مەرسەد- mersed): روانگە، حەشارگە.

**مرصع**- ا.مف.ع(مورەسسەء- muresse’): جەواهێر نیشان.

**مرصوص**- ا.مف.ع(مەرسووس- mersûs): مکوم، قایم، بەیەکەوە پەیوەست.

**مرض**- ا.ع(مەرەز- merez): نەخۆشی، نەساغی.

**مرضات**- مص.ل.ع(مەرزات- merzat): خۆشحال بوون بە کەسێک.

**مرضع**- ا.فا.ع(موورزیئ- murzi’): ژنێ کەشیر بە مندال بدات، دایەن.

**مرضی**- ا.ع(مەرزا- merza): نەخۆشان، نەساغان.

**مرضی**- ا.مف.ع(مەرزی- merzî): ئەوەی مایەی رەزامەندی و پەسند بێ.

**مرطوب**- ص.ع(مەرتووب- mertûb): تەڕ، نمدار.

**مرعز**-ا.ع(میرئیزز- mir’izz): موی نەرمی بزن، مەرەز.

**مرعش**- ا.ع(مەرئەش- mer’eş): کۆتری بەرزەفڕ.

**مرعشی**- ص.ن(مەرئەشی- mer’eşî): خەلکی مەرعەش (شارێکە لە تورکیا).

**مرعوب**-ا.مف.ع(مەرئووب- mer’ûb): ترسێنراو، ترساو، تۆقیو.

**مرعی**- ا.ع(مەرئا- mer’a): لەوەڕگە، پاوەن، مێرگ، سەوزەزار.

**مرعی**- ا.مف.ع(مەرئی- mer’î): رەچاوکراو، لەبەرچاوگیراو، مداراکراو.

**مرغ**- اا(مورغ- murx): بالندە، هەر گیانلەبەرێک پەڕو بالی هەبێ و بفڕێ.

**مرغ**- اا(مەرغ- merx): چیمەن، فریز، مێرگ.

**مرغابی**- ا.مر(مورغابی- murxabî): مراوی، سۆنە.

**مرغانه**- ا(مورغانه- murxane): هێلکەمر.

**مرغ چمن**- ا.مر(مورغی چەمەن- murxi çemen): بولبول.

**مرغ حق**- ا.مر(مورغی هەغ- murxi hex): کوندەپەپوو، بایەقوش، کوند.

**مرغ خانگی**- ا.مر(مورغی خانەگی- murxi xanegî): مریشکی ماڵی.

**مرغزار**-ا.مر(مەرغزار- merx zar): چەمەن، سەوزەزار، مێرگوزار.

**مرغزن**- ا(مەرغ زەن- merxzen): قەورستان، گۆڕستان.

**مرغزی**-ص.ن(مەرغەزی-merxezî):مەروزی.

**مرغسانان**- ا.مر(مورغ سانان- murx sanan): ئەو گواندارانەی وەکو باڵندە هێلکە دەکەن.

**مرغ سحر**- ا.مر(مورغی سەهەر- murxi seher): بولبول، شالوور، کەڵەشێر.

**مرغ سقا**- ا.مر(مورغی سەغا- murxi sexa): سەقاقوش، ماسیگرە.

**مرغ سلیمان**- ا.مر(مورغی سولەیمان- murxi suleyman): پەپوە سلێمانکە، شانەسەر، پەپلەسلێمانە.

**مرغ شاخدار**- ا.مر(مورغی شاخدار- murxi şaxdar): جۆرە باڵندەیەکە بە ئەندازەی مامری ئاسایی دەبێ و گۆشتەکەی زۆر بەلەزەتە.

**مرغ شب اویز**- ا.مر(مورغی شەب ئاڤیز- murxi şeb avîs): کوندە پەپوو، بایەقوش.

**مرغ عیسی**- ا.مر(مورغی ئیسا- murxi isa): شەمشەمە کوێرە.

**مرغک**- ا(مورغەک- murxek): باڵندەی بچووک، گرۆڵی کراس.

**مرغ مگس**- ا.مر(مورغی مەگەس- murxi meges): باڵندەیەکە مێرووان دەخوات.

**مرغوا**-ا(مورغڤا- murx va): فاڵی خراپ، شوم، نەفرین، تووک.

**مرغوب**- ا.مف.ع(مەرغوب- merxub): پەسندو ویستراو، شتێک رەغبەتی لەسەر بێ، پەسندو رەواجدار.

**مرغول**- ا.ص(مەرغوول- merxûl): زوڵفی لوول و پێچاو پێچ.

**مرفق**- ا.ع(میرفەغ- mirfex): ئانیشک، قونانیسک.

**مرفق**- ا.ع(مەرفەغ- merfex): ئاودەست.

**مرفوع**- ا.مف.ع(مەرفووء- merfû’): بەرزکراو، وشەی عەرەبی کە کۆتاییەکەی بزوێنی بۆری لەسەر بێ.

**مرفه**- ص.ع(مورەففەه- mureffeh): ئاسودە حاڵ و خۆشگوزەران.

**مرفین**-ا.فر(مورفین - murfîn): روحی تلیاک، جەوهەری تلیاک.

**مرق**- ا.ع(مەرەغ- merex): شۆربا، مەرەگە، گۆشتاو، ئافەتێکە لە کشتوکاڵ و بێستان دەدا (شیرینە)..

**مرق**- مص.م.ع(مەرغ- merx): نێزەلێدان، هەڵکەندنی خوری لە پێست، خوریو پێستی بۆگەنیو.

**مرقات**- ا.ع(میرغات- mirxat): پاچینە، نەردەوان، پەیژە، قاڵدرمە، پلەکانە.

**مرقد**- ا.ع(مەرغەد- merxed): خەوتنگە، مەرقەد، گڵکۆ، ئارامگە، گۆڕ.

**مرقشیشا**- ا(مەرغەشیشا- merxeşişa): بەردی سەخت و قایم.

**مرقع**- ا.مف.ع(مورەغەء- murexxe’): پینەکراو .

**مرقم**- ا.ع(میرغەم- mirxem): قەڵەم، هەر ئامێرێک پێی بنووسرێ.

**مرقوم**- ا.مف.ع(مەرغووم- merxûm): نووسراو، خەتدار.

**مرقومه**- ا.مف.ع(مەرغوومە- merxûme): نووسراو، نامە.

**مرقومه**- ا.مف.ع(مەرغوومە- merxûme): نووسراو، نامە.

**مركب**- ا.ع(مەرككەب- merkkeb): هەر شتێ بۆ سوار بوون بشێ.

**مركب**- ا.مف.ع(مورەككەب- murekkeb): مەرەکەب، تێکەڵاو، تەنێ لە دوو رەگەز یان زیاتر پێکهاتبێ، جەهلی مورەکەب، نەزانینێ، کەسەکە خۆی پەی پێ نەبات و خۆی بە زاناو دانا بزانێ کە لەم حاڵەتەدا جەهل و نەزانییەکەی دەکاتە بێ ئاگایی و نەزانی لەلایەک و پەی نەبردن بە نەزانییەکەی خۆی لەلایەکی دی.

**مركبات**- ا.ع(مورەککەبات-murekkebat): پێکهاتەکان.

**مركز**- ا.ع(مەرکەز- merkez): چەق، بارەگا، مەڵبەند.

**مركن**- ا.ع(میرکەن- mirken): تەشت، تەشتی هەویر شێلان، یان تەشتی کوڵکردن.

**مركوب**- ا.مف.ع(مەرکووب- merkûb): چارەوێ و وڵاخێن سواری.

**مركور**- ا.فر(میرکوور- mirkûr): جیوە.

**مركور كرم**-ا.فر(میرکوور کوروم- mirkûr kûrrum): دەرمانێکە.

**مركوز**-ا.مف.ع(مەرکووز- merkûz): جێگیر، چەقگیر، بەرقەرار، مکوم و قایم.

**مرگ**- ا(مەرگ- merg): مردن، مەرگ، نەمان، فەوتان.

**مرگ ارزان**- ا.مر(مەرگ ئەرزان- merg erzan): شایستەی مردن، شایانی کوشتن

**مرگا مرگ**- ا.مر(مەرگا مەرگ- merga merg): مردنی بە کۆمەڵ ئیدی بەهۆی نەخۆشی درمەوەبێ یان بە هۆی گرانی و برسێتی و قاتوقڕییەوە.

**مرگبار**- ص.فا(مەرگبار- mergbar): مایەی مردن و مەرگ، مەرگبار.

**مرگ موش**- ا.مر(مەرگ مووش- merg mûş) مەرگەمووش، دەرمانی مشک کوژ.

**مرگو**- ا(مورگوو- murgû): چۆلەکە، پاساری، مەلوێچک.

**مرگ و میر**- ا.مر(مەرگ و میر- mergû mîr): مردنی بە کۆمەڵ.

**مرمت**- مص.م.ع(مەرەممەت- meremmet): نۆژەنکردنەوە، پڕکردنەوە، چاک کردنەوە.

**مرمد**- ص.ع(مورمەدد- murmedd): چاوئێشاو، کەسێک چاوی بیەشێت.

**مرمر**- ا(مەرمەر- mermer): مەڕمەڕ.

**مرمكى**- ا.مر(مورِیمەککی- murimekkî): شیرەی درەختێکی تایبەتییە بۆ دەرمان بەکاردێ.

**مرموز**- ا.مف.ع(مەرمووز- mermûz): رەمزدار، پەنهان، شتێ کە لە نێوان دوو کەسدا بە ئاماژە دیاری بکرێ.

**مرو**- ا.فر(موروو- murû): جۆرە ماسییەکە لە دەریاکانی باکووردا هەیە.

**مرو**- ا(مەرڤ- merv): گیایەکی بۆن خۆشە.

**مروا**- ا(مورڤا- murva): دوعای خێر.

**مرواريد**- ا(مەرڤارید- mervarîd): مرواری، مەرجان.

**مروازاد**- ا(مەرڤ ئازاد- merv azad): گیایەکە.

**مرواى نيك**- ا(مورڤای نیک- muvay nîk): ناوی یەکێکە لە سی نەواکەی باربەد.

**مروت**- ا.مص(مورووڤەت- muruvvet): جوامێری، مرۆڤ دۆستی، پیاوەتی، مەردایەتی، دڵنەرمی، دڵاوایی.

**مروج**- ا.ع(مورووج- murûc): مێرگان، سەوزەزاران، مێرغوزاران.

**مروج**- ا.فا.ع(مورەڤڤیج- murevvic): رەواجدەر، هەرەمێن کار.

**مروح**- ا.ع(میرڤەه- mirveh): باوەشێن، پانکە.

**مروخوش**-ا(مەرڤخوش- mervxûş): رووەکێکە.

**مرود**- ا(موروود- murûd): هەرمێ، گوڵاوی.

**مرود**- ا.ع(میرڤەد- mirved): کل چێوک، میلی سورمە.

**مرور**- مص.ل.ع(مورووڕ- murûr): ڕەتبوون، ڕۆییشتن و تێپەڕبوون، خوێندنەوەو چاوپێداخشانی خێرای کتێب و نووسراوان.

**مروزی**- ص.ن(مەرڤەزی- mervezî): خەڵکی (مەرو).

**مروسیدن**- مص.ل(مورووسیدەن- murûsîden): ڕاهاتن لەسەر شتێک، خوو گرتن بەشتێکەوە، مومارەسەکردن.

**مروسیده**- ا.مف(موروسیدە- murûsîde): ڕاهاتوو، خوپێوەگرتوو، موعتاد.

**مروش**- ا.ع(مورووش- murûş): جێی رووشان.

**مروع**- ص.ع(مورەڤڤەء- murevve'): ترسناک، کەسێک ترسی لە دڵدابێ.

**مروق**- مص.ل.ع(مورووغ- murûx): لەدین دەرچوو.

**مروق**- ا.مف.ع(مورەڤڤەغ-murevvex): شەرابی ساف و بێ غەڵ و غەش، پاڵێوراو.

**مروی**- ا.مف.ع(مەرڤی- mervî): شتێ بگێڕدرێتەوە.

**مره**- ا.ع(مەڕە- merre): یەک جار، یەک کەڕەت، یەک گلەت، یەک چەل.

**مره**- ا.ع(مورە- mure): تاڵ، کەسی زۆر دەست نوقاووی پیسکە.

**مرهم**- ا.ع(مەرهەم- merhem): هەتوان، مەرهەم، مەڵحەم، هەر دەرمانێ لە زام بنرێ.

**مرهون**- ا.مف.ع(مەرهوون- merhûn): بارمتە، دەسبەسەر، بەرەهندراو.

**مری**- ا.ع(مەری- merî): گەروو، قورگ، ئەوک.

**مریٔ**- ص.ع(مەریٔ- merî'): خۆش، بەتام، بەلەزەت.

**مەریخ**- ا.ع(مەریخ- merîx): ئەستێرەیەکە.

**مرید**- ا.فا.ع(مورید- murîd): خوازیار.

**مرید**- ص.ع(مەرید-merîd ): دڵڕەش و شەڕانی، سەرکێش، شەقاوە.

**مریض**- ص.ع(مەریز- merîz): نەخۆش، نەساغ، دەردەدار.

**مریضه**- ص.ع(مەریزە- merîze): نەخۆش، نەساغ (بۆ مێ).

**مز**- مص.م.ع(مەزز- mezz): مژین، مژینی شتێک.

**مز**- ص.ع(موزز- muzz): مزر، ترش و شیرین، مێخۆش.

**مزابل**- ا.ع(مەزابیل- mezabil): زبڵدانان، گۆڤەکان، سەرانگۆێلکان، سوڕکەوانان.

**مزابنه**- مص.م.ع(موزابەنە- muzabene): گۆترە فرۆشی، کڕین و فرۆشتن بە گۆترە.

**مزاج**- ا.ع(میزاج- mizac): سروشت و تەبیعەت، مجێز، ئاوێتە، شەرابی ئاوتێکراو.

**مزاح**- ا.مف.ع(موزاه- muzah): لابراو، بیانوو بڕیاگ، لادراو.

**مزاح**- مص.ل.ع(میزاه- mizah): گەپجاڕی، سوعبەت کردن، شۆخی کردن، گاڵتەکردن.

**مزاح**- ص.ع(مەززاه- mezzah): شۆخی باز، سوعبەتچی، حەنەکچی.

**مزاحت**- ا.مص.مع(موزاهەت- muzahet): شۆخی، سوعبەت، حەنەک.

**مزاحم**- ا.فا.ع(موزاهیم- muzahim): مایەی زەحمەت، مێمڵ، سەرقاڵکەر.

**مزاحمت**- مص.ع(موزاهەمەت- muzahet): ئەزیەت دان، سەرقاڵکردن.

**مزاد**- مص.م.ع(مەزاد- mezad): مەزات، مەزاد، مەزادکردن، زیادکردن.

**مزار**- ا.ع(مەزار- mezar): گڵکۆ، زیارەتگە، گۆڕ، مەرقەد.

**مزارع**- ا.ع(مەزاریٔ-mezari'): مەزرایان، کێڵگەیان.

**مزارعه**- مص.م.ع(موزارەئە- muzare’e): پێکەوە کشتوکاڵ کردن بەپێی قەرارداد و ڕێکەوتنی دیاریکراو.

**مزاریب**- ا.ع(مەزاریب- mezarîb): مەرزوم، ئاورێژ.

**مزال**- ا.ع(مەزالل- mezall): شوێنی خلیسکانێ، خلیسکگە.

**مزامیر**- ا.ع(مەزامیر- mezamîr): نای، زورنا، سروود و گۆرانی کە بە نای لێ بدرێ.

**مزامیر داود**- ا.مر(مەزامیری داڤود- mezamîri davud): ئەو دوعاو سروودو شیعرانەی کە داود پێغەمبەر سۆزەی دەکردن و بە هەموویان زەبوور پێک دێن.

**مزاوجت**- مص.م.ع(موزاڤەجەت- muzavecet): ئیزدیواج، زەوجین، شووکردن، ژنهێنان.

**مزاولت**- مص.ل.ع(موزاڤەلەت- muzavelet): سەرقاڵ بوون بە کارێکەوە، مومارەسەکردنی کارێک.

**مزایا**- ا.ع(مەزایا- mezaya): خاڵی ئیجابی، چاک.

**مزایده**- مص.م(موزایەدە- muzayede): موزایەدە، شت فرۆشتن بەموزایەدە، واتە کڕیاران دێن و پارە لەسەر یەکتر زیاد دەکەن، تا شتەکە لەسەر نرخێک دەگیرسێتەوەو کڕیارێک دەیبات.

**مزبله**- ا.ع(مەزبەلە- mezbele): سوڕکەوان، گوفەک، سەرانگوێلک، سەرەنوێلک، زبڵدان.

**مزبور**- ا.مف.ع(مەزبوور- mezbûr): ئاماژە بۆکراو، ناوبراو، نووسراو.

**مزج**- مص.م.ع(مەزج- mezc): تێکەڵ کردن، ئاوێتە کرن.

**مزج**-ا.ع(مەزج-mezc):هەنگوین، بادەمی تاڵ.

**مزجات**- ص.ع(موزجات- muzcat): کەم، کێم، خراپ، بێ قەدر.

**مزح**- مص.ل.ع(مەزه- mezh): شۆخی کردن، سوعبەتکردن، گاڵتەکردن.

**مزخرف**- ا.مف.ع(موزەخرەف- muzexref): قسەی هەڵەق و مەڵەق و بێ بنج و بناوان و درۆی ئەوتۆ کە وا هۆنرابێتەوە لە ڕاست بچێت، قەڵب، ساختە.

**مزد**- ا(موزد- muzd): کرێ، مز، هەقدەست.

**مزدا**- ا(مەزدا- mezda): مەزدا، دانای بێ هاوتا، پەروەردگار.

**مزدحم**- ا.فا.ع(موزدەهیم- muzdehim): قەرەباڵغ، هەیشەت.

**مزدکی**- ص.ن(مەزدەکی- mezdekî): پەیڕەوانی (مەزدەک) کە لە زەمانی قوبادی پاشای ساسانیدا ئایینێکی بەو ناوەوە داهێنا کە بنەمای ئایینەکە لەسەر بنەمای سوسیالیزمی ئابووری و یەکسانی خەڵکی بوو، لایەنگرانێکی زۆری پەیداکردو تەنانەت قوبادیش بە گەڵیان کەوت بەڵام گەورەکانی ئێران دژایەتییان کردو ئاقیبەت لە سەرەتای دەسەڵاتی ئەنەوشیرواندا لەگەڵ چەندین هەزار کەس لە پەیڕەوانیدا کوژرا.

**مزدوج**- ا.فا.ع(موزدەڤیج- muzdevic): زەوجیو، ژندار، پیاودار.

**مزدوج**- ا.مف.ع(موزدەڤەج- muzdevec): جووت بووگ، جۆرە شیعرێکە.

**مزدور**- ص(موزدوور- muzdûr): کرێکار، کەسێک بەکرێ کار بۆ یەکێکی دی بکات، بەکرێگیراو.

**مزده**- ا(موزدە- muzde): کرێ، مز، هەقدەست.

**مزدیسن**- ص.فا(مەزدیەسن- mezdyesn): خواپەرست، یەزدان پەرست.

**مزدیسنان**- ص.فا(مەزدیەسنان- mezdyesnan): خواپەرستان، یەزدان پەرستان.

**مزدیسنی**- ا(مەزدیەسنی- mezdyesnî): خواپەرستی.

**مزراب**- ا.ع(میزراب- mizrab): مەزریب، مەرزوم، ئاورێژ.

**مزراق**- ا.ع(میزراغ- mizrax): کورتە ڕم، نێزەی کوڵ، درباشە.

**مزرعه**- ا.ع(مەزرەئە- mezre'e): مەزرا، کێڵگە.

**مزروع**- ا.مف.ع(مەزرووء- mezrû'): چێنراو، چاندراو.

**مزعفر**- ا.مف.ع(موزەئفەر- muze'fer): خۆراکێک زەعفەرانی تێ کرابێ.

**مزعم**- ا.ع(مەزئەم- mez'em): جێی تەماع، کارێک جێی متمانەو باوەڕ نەبێ.

**مزکوم**- ا.مف.ع(مەزکووم- mezkûm): هەڵامەتگرتوو، پەسیوگرتگ.

**مزکی**- ا.مف.ع(موزەککا- muzekka): پاکەوە بووگ، ماڵێ زەکاتی درابێ.

**مزکی**- ا.فا.ع(موزەککی- muzekkî): زەکاتدەر، پاک کەرەوە.

**مزگ**- ا(مەزگ- mezg): بادەمەتاڵ، چەقاڵە.

**مزگت**- ا(مەزگیت- mezgit): مزگەوت، پەرستگەی موسوڵمانان.

**مزلت**-ا.مص(مەزیللەت- mezillet): شوێنی خلیسک، خلیسکان و کەوتن، خزین.

**مزلف**- ص(موزەللەف- muzellef): زوڵفدار، کوڕێک زوڵفی دانابێ.

**مزله**- ا.ع(مەزەللە- mezelle): شوێنی خلیسکان، خزگە.

**مزمار**- ا.ع(میزمار- mizmar): نای، زوڕنا.

**مزمزان**- ص.فا(مەزمەزان- mezmezan): مژین، چەشتن، چێژەر، مژەر، مژلێدەر.

**مزمزه**- ا.مص(مەزمەزە- mezmeze): چەشتنی تامی شتێک.

**مزمل**- ا.مف.ع(موزەممەل- muzemmel): بە گلیم پێچراو، کەسێک خۆی بە جلەوە پێچابێ.

**مزمن**- ا.فا.ع(موزمین- muzmin): کۆن، دێرینە، ئەوەی زەمانێکی زۆری بەسەرا بوری بێ.

**مزمور**- ا.ع(مەزموور- mezmûr): سروود.

**مزن**- ا.ع(موزن- muzn): هەور، هەوری تەڕو باراناوی، تەرزە.

**مزوجه**- ا.ع(موزەڤڤەجە- muzevvece): جۆرە کلاوێکە کە ناواخنی لۆکەیان بۆ دەکردو لەسەریان دەکرد.

**مزور**- ا.مف.ع(مەزوور- mezûr): زیارەتکراو.

**مزور**- ا.فا.ع(موزەڤڤیر- muzevvir): درۆزن، ساختەچی، تەزویرکار.

**مزور**- ا.مف.ع(موزەڤڤەر- muzevver): تەزویر کراو، قەڵب.

**مزوره**- ا.مف.ع(موزەڤڤەرە- muzevvere): خواردنی بێ گۆشت و چەوری کە بۆ نەخۆش دروست بکرێ.

**مزوله**- ا.ع(میزڤەلە- mizvele): سەعاتی هەتاوی.

**مزه**- ا(مەزە- meze): تام، چەژ، چێژ، سووکە خواردن بۆ بەرکوڵ.

**مزیت**- ا.مص.ع(مەزییەت- meziyet): شتێک یان چەند شتێکی باش لە کەسێکدا هەبێ و لە یەکێکی دیدا نەبێ.

**مزید**- مص.م.ل.ع(مەزید- mezîd): زیاد بوون، زیاد کردن.

**مزیدن**- مص.م(مەزیدەن- mezîden): مژین، چەشتن.

**مزنده**- ا.فا(مەزەندە- mezende): مژن، مژلێدەر، گۆزەی ئاو.

**مزیده**- ا.مف(مەزیدە- mezîde): مژراو.

**مزیف**- ا.مف.ع(موزەیەف- muzeyyef): پارەی قەڵب.

**مزیل**- ا.فا.ع(موزیل- muzîl): لابەر، لادەر.

**مزین**- ا.فا.ع(موزەیین- muzeyyîn): ئارایشتکەر، خەمڵێنکار.

**مزین**- ا.مف.ع(موزەیەن- muzeyen): ئارایشتکراو، رازاوە.

**مـژدگـانی**- اا(مـوژدەگـانی- mujdeganî): مژدانه، مزگێنی، نوقلانه.

**مـژده**- اا(مـوژده- mujde): هەواڵی خـۆش، خەبەری خۆش، مژده.

**مـژگـان**- اا(مـوژەگـان- mujegan): برژانـگ، برژۆڵ، مژه.

**مژمـژ**- اا(مـەژمـەژ- mej mej): خـەرەنگێـز، مێشەکەرانه.

**مژو**- اا(مەژوو- mejû): نیسک.

**مژه**- اا(موژه- muje): برژانگ، برژۆڵ.

**مس**- اا(میس- mis): مس.

**مس**- ص(مەس- mes): گەوره.

**مس**- مص.م.ع(مـــەسس- mess): دەست پێداهێنان، دەست پێداسوون، لێکدی خشانی دوو شت، شێتایەتی.

**مساء**- ا.ع(مەساء- mesa'): ئێواره، ئێڤار.

**مسـائت**- مص.ل.ع(مـەسـائەت- mesa'et): گـومـانبـردنی خـراپ، کـردارو گـوتاری خـراپ و ناشیرین، خراپه کردن.

**مـسـائل**- ا.ع(مـەسـائیل- mesa'il): پرس و مەسەلەکان.

**مسابقه**- مص.ع(موسابەغە- musabexe): پێشبرکێ.

**مـسـاجـد**- ا.ع(مـەسـاجـیـد- mesacid): مزگەوتان.

**مسـاح**- ص.ع(مـەسـساه- messah): زەوی پێو.

**مساحت**- مص.م.ع(میـساهەت- misahet): ئەندازەگرتنی زەوی، پێوانی زەوی، پانتایی.

**مساخط**- ا.ع(مەساخیت- mesaxit): مایەی تووڕه بوون.

**مسارح**- ا.ع(مەساریه- mesarih): شانۆ.

**مـســـــارعـت**- مص.ل.ع(مـــوســـــارەئەت- musare'et): لەز کـردن، پەلە کـردن، پێش گرتنەوەی یەکدی.

**مساس**- مص.م.ع(مەساس- mesas): دەست پێداسوون، دەست پێداماڵین، دەست پێداهێنان.

**مـسـاعـد**- ا.فـا.ع(مـوسـائیـد- musa'id): هاوبازو، یاریدەدەر، یارو یاوەر.

**مـســــاعــدت**- مص.م.ع(مــوســـائەدەت- musa'edet): کۆمەک کردن، هاوکاریکردن.

**مـسـاعی**- ا.ع(مـەسـائی- mesa'î): هەوڵ و کۆششان.

**مـسـاغ**- ا.ع(مـەسـاغ- mesax): گـوزەرگـا، بوار.

**مسافت**- ا.ع(مەسافەت- mesafet): دووری، درێژی ڕێگه، ماوەی نێوان دوو شوێن.

**مسافر**-ا.فا.ع(موسافیر- musafir): ڕێبوار، ڕێوان، ئۆغربار.

**مـســـافـرت**- مص.ل.ع(مــوســـافــەرەت- musaferet): ســەفــەرکــردن، ڕۆیـیــشتن لە شوێنێکەوه بۆ شوێنێکی دی.

**مـسـاق**- مص.ع(مـەسـاغ- mesax): ڕادانی چارەوێ و مێگەڵو....

**مـــســاکن**- ا.ع(مـــەســاکین - mesakin): خانووگەل، ماڵان.

**مـــســاکین**- ا.ع(مــەســاکین- mesakîn): هەژاران، بێنەوایان، دەستکورتان.

**مـــســالح**- ا.ع(مــەســالیــه- mesalih): شـوێنی ترسناکی وەها کـه چەک و چەکـداری بخوازێ.

**مسالک**- ا.ع(مەسالیک- mesalik): ڕێگەو بانان، ڕێچکەو ڕێبـازی سـیـاسی، تەریقـەتی ئاینی.

**مـــســالمت**- مص.ل.ع(مـــوســـالەمـــەت- musalemet): ئاشتی کرن، ئاشتەوایی.

**مسام**- ا.ع(مەسامم- mesamm): ئەو ورده کونانەی پێستی بەدەن که ئارەقەی لێوه دەردێ.

**مـــســامــحــه**- مص.ل.ع(مــوســامــەهە- musamehe): مداراکردن، نەرمی نواندن، دڵ ڕاگرتن، چاوپۆشی کردن، به نەرمی کارکردن.

**مسامرت**- مص.ل.ع(موسامەرەت- musameret): شەونشینی و حیکایەتکردن.

**مسامع**- ا.ع(مەسامئ- mesami’): گوێ، گوێچکان.

**مسامیر**- ا.(مەسامیر- mesamîr): بزماران.

**مساند**- ا.ع(مەسانید- mesanid): پلەوپایە، پشتەوانە، ئەوەی پاڵی پێوە بدەی.

**مساوات**- مص.ل.ع(موساڤات- musavat): بەرامبەر بوون، یەکسان بوون، یەکسانی.

**مساومت**- مص.ع(موساڤەمەت- musavemet): سەوداکردن و موعامەلەکردن، سازشکردن.

**مساوی**-ا.ع(مەساڤی- mesavî): خراپە، کردارو گوفتاری بەدوخەراو.

**مساوی**- ص.ع(موساڤی- musavî): بەرانبەر، یەکسان.

**مساهرت**- مص.ع(موساهەرەت- musaheret): شەونشینی، کۆڕو مەجلیسی شەوانە.

**مساهله**- مص.ع(موساهەلە- musahele): نەرم و نیانی لە رەفتارا، ئاسانگرتن.

**مساهمت**- مص.ع(موساهەمەت- musahemet): بەشداریکردن.

**مسئلت**- مص.م.ع(مەسئەلەت- mes’elet): خواستن، داواکردن.

**مسئله**- ا.ع(مەسئەلە- mes’ele): پێویستی، داوا.

**مسئول**- ا.مف.ع(مەسئول- mes’ul): لێپرسراو، بەرپرس.

**مسئولیت**- ا.ع(مەسئولیەت- mes’ûliyet): بەرپرسیارێتی.

**مسبب**- ا.فا.ع(موسەببیب- musebbib): هۆکار، سەبەبکار، باعیس، مایە.

**مسبح**- ا.فا.ع(موسەببیح- musebbih): کەسێک سوبحانەڵلا بکات، سوبحانەڵلاگۆ.

**مسبحه**- ا.ع(موسەببیهە- musebbihe): قامکی شادە.

**مسبع**- ص.ع(موسبەء- musbe’): منالێک بە حەوت مانگان لە دایک بووبێ، منالێک دایکی مردبێ و ژنێکی دی شیری دابێ.

**مسبع**- ا.مف.ع(موسەببەء- musebbe’): حەوت لا، هەفتگۆشە.

**مسبعه**- ا.ع(مەسبەئە- mesbe’e): شوێنی گیانلەبەرانی درندە.

**مسبوق**- ا.مف.ع(مەسبووغ- mesbûx): پێشینەدار، رابردوودار، دێرینەدار.

**مست**- ص(مەست- mest): مەست، سەرخۆش، خومار.

**مست**- ا(موست- must): گلەیی، خەم و پەژارە.

**مستاجر**- ا.فا.ع(موستەئجیر- muste’cir): کرێچی، کەسێک ماڵ یان دوکان یان شتی دی بەکرێ بگرێ.

**مستأجره**- امف.ع(موستەئجەرە- muste’cere): کرێ ئیجار، دەرامەتی ئیجار.

**مستأصل**- ا.مف.ع.موستەئسەل- muste’sel): لە ریشەدەرهێنراو، لەبن و بێخەوە هەڵکەنراو، بێنەوا، هەژار.

**مستأنس**- ا.فا.ع(موستەئینس- muste’nis): هۆگر، خوو پێوەگر.

**مستأنف**- ا.فا.ع(موستەئنیف- muste’nif): دەست پێکەرەوە، تێ هەڵچوونەوە.

**مستبد**-ا.فا.ع (موستەبید-mustebid): ملهوڕ، دیکتاتۆر.

**مستبدع**- ا.مف.ع(موستەبدەء- mustebde’): داهێنراو.

**مستبشر**- ا.فا.ع(موستەبشیر- mustebşir): شادمان، کەیف خۆش، بەدەماخ.

**مستبصر**- ا.فا.ع(موستەبسیر- mustebsir) خودان بەسیرەت، خودان فیکرو رەئی، کەسێک بیەوێ کارێک ئاشکرا بکات.

**مستبعد**- ا.مف.ع(موستەبئەد- musteb'ed): دوور، دوور خراوە، شتێ کە دوور بێتە بەرچاو.

**مستتر**- ا.مف.ع(موستەتەر- musteter): شاراوە، ڤەشارتی.

**مستتم**- ا.فا.ع(موستەتیم- mustetim): تەواوکەر.

**مستثنی**- ا.مف.ع(موستەسنا- mustesna): لە ریز پەڕێنراو، لە ریز دەرهێنراو، هەڵاویردکراو، ریزپەڕ.

**مستجاب**- ا.مف.ع(موستەجاب- mustecab): گیرا، کەسێک دوعای گیرابێ.

**مستجد**- ا.فا.ع(موستەجیدد-musteccid): تازەکەرەوە.

**مستجد**- ا.مف.ع(موستەجەد- musteced): تازەکراوە.

**مستجلب**- ا.فا.ع(موستەجلیب- musteclib): جەلب کەر، جەلبکراو، هاوردە.

**مستجمع**- ا.فا.ع(موستەجمیٔ- mustecmi'): کەسێک بە هەموو ئاواتێکی گەیی بێ.

**مستجیر**- ا.فا.ع(موستەجیر- mustecîr): ئەمانخواز، پەناخواز، پەناهەندە، پەنابردە.

**مستجیز**-ا.فا.ع(موستەجیز- mustecîz): ئیزنخواز، مۆڵەتخواز.

**مستحب**- ا.مف.ع(موستەهەبب- mustehebb): پەسندو چاک، کارێک کردنی پاداشتی لەسەر بێ و نەکردنی گوناح نەبێ.

**مستحث**- ا.فا.ع(موستەهیسس- mustehiss): دنەدەر، هاندەر.

**مستحدث**- ا.مف.ع(موستەهدەس- mustehdes): نۆباو، تازە پەیدا.

**مستحسن**- ا.مف.ع(موستەهسەن- mustehsen): چاک و پەسند.

**مستحضر**- ا.فا.ع(موستەهزیر-mustehzir): ئامادەکەر، ئاگادارو بەخەبەر.

**مستحفظ**- ا.فا.ع(موستەهفیز- mustehfiz): ئەزبەرکەر، نیگابان، پارێزەر.

**مستحق**- ص.ع(موستەهەغغ-mustehexx): هەژ، شایستە، شایانی.

**مستحکم**- ا.مف.ع(موستەهکەم- mustehkem): مکوم، مەحکەم، قایم.

**مستحل**- ا.مف.ع(موستەهەلل- mustehell): حەڵاڵ کراو، بە حەڵاڵ زانراو، رەواکراو.

**مستحیل**- ص.ع(موستەهیل- mustehîl): مەحاڵ، تەنێک بۆ تەنیکی دی گۆڕابێ.

**مستخبر**-ا.فا.ع(موستەخبیر- mustexbir): خەبەرگیر، عەودالی خەبەر، کەسێک لە دووی هەواڵێک بێ.

**مستخدم**- ا.مف.ع(موستەخدەم- mustexdem): خزمەتگوزار، پێش خزمەت.

**مستخرج**- ا.فا.ع(موستەخریج-mustexric): دەرهێنەر.

**مستخرج**- ا.مف.ع(موستەخرەج- mustexrec): دەرهێنراو.

**مستخف**- ا.مف.ع(موستەخەفف- mustexeff): کەساس و زەبوون و سوک و سەلیم.

**مستخلص**- ا.مف.ع(موستەخلەس- mustexles): خەلەسیو، رزگاربوو، ئازاد بوو.

**مستدام**- ا.مف.ع(موستەدام- mustedam): بەردەوام، پایەدار، بەرقەرار.

**مستدبر**- ا.فا.ع(موستەدبیر- mustedbir): بەتەگبیر، کەسێک کە دەڕوانێتە ئاکامی کار.

**مستدرک**- ا.مف.ع(موستەدرەک- mustedrek): دەرک کراو، لاچوونی وەهم و بەسەهوچوون.

**مستدعی**- ا.فا.ع(موستەدئی- mustedʼî): خوازیار، داواکار، کەسێک شتێک داوا بکات.

**مستدل**-ا.فا.ع(موستەدیلل- mustedill): دەلیل و بەڵگەخاز.

**مستدل**- ا.مف.ع (موستەدەلل-mustedell): سەلمێنراو بە بەڵگە.

**مستدیر**- ا.فا.ع(موستەدیر- mustedîr): خڕ، بازنەیی.

**مستتر**- ا.فا.ع(موسەتتیر- musettir): پەنهانکار.

**مستراح**- ا.ع(موستەراح- musterah): ئاودەست خانە.

**مسترخی**- ص.ع(موستەرخی- mustexî): نەرم و خاو، داهێزراو.

**مسترد**- ا.مف.ع(موستەرەدد-musteredd): وەرگیراوە.

**مسترسل**-ا.فا.ع(موستەرسیل- mustersil): داهێزراوو نەرم و خاو، رامکەر، خاکی و خۆش تەبیعەت.

**مسترشد**- ا.فا.ع(موستەرشید-musterşid): عەوالّی ڕێی راست، هیدایەت خواز.

**مسترضع**-ا.فا.ع(موسەرزئ- musterziʼ): شیرەخۆرە.

**مسترق**- ص.ع(موستەرەغغ- musterexx): نەرم و ناسک، لاواز، نوقستان.

**مستریح**- ا.فا.ع(موستەریه- musterîh): ئاسودەیی خواز، ئیسراحەت خواز.

**مستزاد**- ا.مف.ع(موستەزاد- mustezad): زیادەکریاگ، جۆرە شیعرێکە کە لە کۆتایی هەر نیوە بەیتێکدا چەند وشەیەکی زیاد لە کێشی خۆی دێننەوە.

**مستسعد**- ا.فا.ع(موستەسئید- musteʼid): گەشبین، شادمانی خواز، بەختەوەری خواز.

**مستسعد**- ا.مف.ع(موستەسئەد- musteʼed): بەختەوەر بوو، شادمان بوو.

**مستسقی**- ا.فا.ع(موستەسغی- mustesxî): خوازیاری ئاو، کەسێک داوای ئاوی خواردنەوە بکات.

**مستشار**- ا.مف.ع(موستەشار- musteşar): راوێژکار، شیرەتکار.

**مستشرف**- ا.فا.ع(موستەشریف- musteşrif): هەڵکراو، بەرزی، زاڵ، کەسێک چاودێری شتێ بکات.

**مستشرق**-ا.فا.ع(موستەشریغ- musteşrix): رۆژهەلاتناس.

**مستشفی**- ا.ع(موستەشفا- musteşfa): نەخۆشخانە، خەستەخانە.

**مستشفی**- ا.فا.ع(موستەشفی- musteşfî): شەفاخواز، ساغڵەمی خواز.

**مستشیر**- ا.فا.ع(موستەشیر- musteşîr): کەسێک راوێژ بە کەسێکی دی بکات.

**مستضعف**- ا.مف.ع(موستەزئەف- mustezʼef): لاواز، بێدەسەڵات، چەوساوە، بێ توان، ئەقڵ سووک.

**مستضیٔ**- ا.فا.ع(موستەزئ- mustezîʼ): رووناکی خواز.

**مستطاب**- ص.ع(موستەتاب- mustetab): پاک و خاوێن.

**مستطرف**- ص.ع(موستەترەف- mustetref): تازە، نوێ، سەیر، خۆش، عەجیب.

**مستطیر**- ص.ع(موستەتیر- mustetîr): درەخشان، بلاو.

**مستطیع**- ص.ع(موستەتئ- mustetîʼ): بەتوانا، تواناداز.

**مستطیل**- ص.ع(موستەتیل- mustetîl): لاکێشە.

**مستظرف**- ا.مف.ع(موستەزرەف- mustezref): زەریف، جوان، شتێک جوان و زەریف دروستکرابێ.

**مستظهر**- ا.فا.ع(موستەزهیر- mustezhir): پشت و پەناخواز.

**مستظهر**- ا.مف.ع(موستەزهەر- mustezher): ئەوەی بە کەسێک یان شتێک پشت قایم بێ.

**مستعار**- ا.مف.ع(موستەئار- muste'ar): خوازراو.

**مستعان**- ا.مف.ع(موستەئان- muste'an): کەسێک داوای کۆمەکی لێ بکرێ.

**مستعجل**- ا.فا.ع(موستەئجیل- muste'cil): پەلەز، بەپەلە.

**مستجعل**- ا.مف.ع(موستەئجەل- muste'cel): پەلە، خێرا.

**مستعد**- ا.فا.ع(موستەئیدد- muste'idd): ئامادە، تەیار.

**مستعرب**- ا.فا.ع(موستەئریب- muste'rib): کەسێک لاسایی عەرەب بکاتەوە.

**مستعربه**- ص.ع(موستەئریبە- muste'ribe): عەرەبێنراو، بە عەرەب بوو، عارەبی نائەسڵ.

**مستعصم**- ا.فا.ع(موستەئیسم- muste'sim): پەنابەر.

**مستعفی**- ا.فا.ع(موستەئفی- muste'fî): کەسێک واز لەکارو خزمەت بێنێ، خوازیاری عەفو.

**مستعلی**-ا.فا.ع(موستەئلی- muste'lî): بەرز.

**مستعمره**- ا.مف.ع(موستەئمەرە- muste'mere): ولگە، کۆلۆنی، ولاتی داگیرکراو لەلایەن بێگانەوە.

**مستعمل**- ا.مف.ع(موستەئمەل- muste'mel): بەکار هاتگ، بەکار هێنراو.

**مستعیر**- ا.فا.ع(موستەئیر- muste'ir): تاق و تەنیا، خوازیار.

**مستعین**-ا.فا.ع(موستەئین- muste'în): هاوکاری خواز، خوازیاری کۆمەک.

**مستغاث**-ا.مف.ع(موستەغاس- mustexas): کەسێک پەنای بۆ برابێ، هانا بۆ براو.

**مستغرب**- ا.فا.ع(موستەغریغ- mustexrix): زۆر سەرقاڵ، غەرق لە ئاوا.

**مستغفر**- ا.فا.ع(موستەغفیر- mustexfir): کەسێک تۆبەو ئیستیغفار بکات.

**مستغل**- ا.مف.ع(موستەغەلل- mustexell): زەوییەک بەروبوومی لێ هەڵگیرێ، خانوو یان دوکان بەکرێ بدرێ، هەر موڵکێک دەرامەتی هەبێ.

**مستغنی**- ا.فا.ع(موستەغنی- mustexnî): زەنگین، دەوڵەمەند، دارا، بووە.

**مستغیث**- ا.فا.ع(موستەغیس-mustexîs): کۆمەک خواز، کەسێک داوای کۆمەک و فریارەس بکا.

**مستفاد**- ا.مف.ع(موستەفاد- mustefad): ئەوەی مەفهوم و مەعلوم بووە، سوود لێ وەرگیراو.

**مستفسر**- ا.فا.ع(موستەفسیر- mustefsir): روونکردنەوە خواز.

**مستفید**- ا.فا.ع(موستەفید- mustefîd): سوودمەند، فایدەخواز.

**مستفیض**- ا.فا.ع(موستەفیز- mustefîz): کەسێک داوای فەیز بکات.

**مستقبح**- ا.مف.ع(موستەغبەهـ- mustexbeh): کرێت و ناشیرین و ناپەسند، قێزەوەر، قێزەون.

**مستقبل**- ا.مف.ع(موستەغبەل- mustexbel): ئایندە، بانەڕۆژ، داهاتگ.

**مستقبل**- ا.فا.ع(موستەغبیل-mustexbil): پێشوازیکەر.

**مستقر**- ا.مف.ع(موستەغەر- mustexer): جێگیر، ئارام، سەقامگیر.

**مستقل**- ا.فا.ع(موستەغیلل- mustexill): سەربەخۆ.

**مستقیم**- ص.ع(موستەغیم- mustexîm): راست.

**مستکبر**- ا.فا.ع(موستەکبیر- mustekbir): خۆویست، خۆ پەسند، فیز زل.

**مستکره**- ا.مف.ع(موستەکرەھ- mustekreh): ناپەسند، نابەجێ.

**مستکفی**- ا.فا.ع(موستەکفی- mustekfî): کیفایەتخواز.

**مستگر**- ص(موستگەر- mustger): ڕەنجاو، دڵشکاو.

**مستلز**- ا.فا.ع(موستەلیزز- mustelizz): لەزەتخواز.

**مستلزم**- ا.فا.ع(موستەلزیم- mustelzim): پێویست.

**مستلقی**- ا.فا.ع(موستەلغی- mustelxî): پەپشتاخەوتوو، ڕاکشاو لەسەر پشت.

**مستمر**- ا.فا.ع(موستەمیر- mustemir): بەردەوام، هەمیشە.

**مستمری**- ص.ن.ا(موستەمیری- mustemirî): مووچەی مانگانەو بەردەوام.

**مستمسک**- ا.فا.ع(موستەمسیک- mustemsik): کەسێک شتێ بگرێ، گیرەر، بگیر.

**مستمسک**- ا.مف.ع(موستەمسەک- mustemsek): دەساوێز، بەڵگەنامە.

**مستمع**- ا.فا.ع(موستەمیئ- mustemi’): گوێدێر، گوهدار، گوێگر.

**مستملح**- ص.ع(موستەملەھ- mustemleh): سوێر، نمەکین، شۆر.

**مستملک**- ا.مف.ع(موستەملەک- mustemlek): شوێنێ کە کەسێک کردبی بە موڵکی خۆی.

**مستمند**- ص(موست مەند- must mend): بێنەوا، غەمین، بە گلەیی.

**مستنبط**- ا.مف.ع(موستەنبەت- musten-bet): دەرهێنراو، هەڵێنجراو، دەرک کراو.

**مستنبط**- ا.فا.ع(موستەنبیت- mustenbit): هەڵێنجەر، دەرک کەر.

**مستنبه**- ا.فا.ع(موستەن بیھ- mustenbih): هۆشیار، بەئاگا، عەوداڵی هەواڵان.

**مستنجد**- ا.فا.ع(موستەنجید- mustencid): کۆمەک خواز، دڵێرو ئازا.

**مستنجم**- ا.فا.ع(موستەنجیم- mustencim): ڕووناکی خواز، روناک و پرشنگدار.

**مستند**- ا.مف.ع(موستەنەد- mustened): شتێ کە پشتی پێ ببەسترێ، بەڵگەو سەنەدان.

**مستنصر**- ا.فا.ع(موستەنسیر- mustensir): داواکاری هاوکاری و کۆمەک، کۆمەکخواز.

**مستنطق**- ا.فا.ع(موستەنتیغ- muste tix): یەکێک کەسێک بێنێتە دوان.

**مستنکر**- ا.فا.ع(موستەنکەر- mustenker): نەناسراو، نکولی لێکراو، کارێک بە ناشیرین و ناڕەوا وەربگیرێ، گومناو.

**مستنکف**- ا.فا.ع(موستەنکیف- mustenkif): سەرپێچی کار، نەکردنی کارێک لە رووی غرورو خۆپەسندییەوە.

**مستنیر**- ا.فا.ع(موستەنیر- musetenîr): ڕووناک، ڕووناکی خواز.

**مستوجب**- ا.فا.ع(موستەوجیب- mustewcib): شایستە، هەژ، شایانی.

**مستوحش**- ا.فا.ع(موستەوهیش- mustewhiş): دڵتەنگ و ڕەنجاو، ترساو، ترسیاگ.

**مستودع**- ا.فا.ع(موستەودیئ- mustewdi’): ئەوەی شتێک بە ئەمانەت دابنێ.

**مستودع**- ا.مف.ع(موستەودەء- mustewde’): ماڵێک یان شتێک بە ئەمانەت دانرابێ.

**مستور**- ا.مف.ع(مەستوور- mestûr): پۆشراو، پۆشتە، داوێن پاک.

**مستوره**- ا.مف.ع(مەستوورە- mestûre): ژنی داوێن پاک و خواناس.

**مستوفی**- ا.فا.ع(موستەوفی- mustewfî): هەقوەرگر، ژمێریاری خەزێنە.

**مستولی**- ا.فا.ع(موستەولی- mustewlî): زاڵ، کەسێک بە تەواوی دەست بەسەر شتێکدا بگرێ.

**مستوی**- ص.ع(موستەڤی- mustevî): راست و دروست، بەرانبەرو هەموار.

**مسته**- ا(موستە- muste): چەشە، غەم و پەژارە.

**مستهام**- ص.ع(موستەهام- musteham): شەیدا، حەیران، سەرسام.

**مستهان**- ص.ع(موستەهان- mustehan): سەرزەنشتکراو، ئیهانەکراو.

**مستهجن**- ص.ع(موستەهجەن- mustehcen): ناشیرین، ناجۆر، کرێت، ناپەسند.

**مستهزء**- ا.فا.ع(موستەهزئ- mustehzi'): تەوسچی، گاڵتەجاڕ.

**مستهل**- ا.فا.ع(موستەهیلل- mustehill): مانگی نوێ، رووی گەشاوە لە خۆشیا، هەوری بە باران و سەرەتای باران، دەستپێک.

**مستهلک**- ا.مف.ع(موستەهلەک- mustehlek): ئێکسپایەر، لە کەڵک کەوتوو.

**مسجد**- ا.ع(مەسجید- mescid): مزگەوت، پەرستگەی موسوڵمانان.

**مسجع**- ا.مف.ع(موسەججەء- musecce'): قسەی سەروادار.

**مسجل**- ا.مف.ع(موسەججەل- museccel): تۆمارکراو، قەواڵەی مۆرکراوی رەسمی.

**مسجل**- ا.فا.ع(موسەججیل- musreccil): تۆمارکەر، قازی کە قەواڵە بنووسێت و مۆری بکات.

**مسجود**- ا.مف.ع(مەسجوود- mescûd): کڕنۆش بۆ براو.

**مسجور**- ا.مف.ع(مەسجور- muscûr): مرواری هۆندراوە، دەریای پڕئاو، پڕو لێواو لێو.

**مسجون**- ا.مف.ع(مەسجوون- mescûn): حەپس، زیندانی، بەندی.

**مسح**- مص.ع(مەسھ- mesh): سڕین، پاک کردنەوە، دەست هێنان بەپێشی سەرو رووی پێیان لە کاتی دەستنوێژ شتندا.

**مسح**- ا.ع(میسھ- mish): پەلاس، عەبایان جلی زبرو دڕ.

**مسحور**- ا.مف.ع(مەسهوور- meshûr): جادوو لێکراو، سیحر لێکراو، خەڵەتاو، خەڵەتێنراو.

**مسحوق**- ا.مف.ع(مەسهوغ- meshûx): هاڕدراو، پێشێلکراو، پلیشاوە.

**مسخ**- مص.ع(مەسخ- mesx): بەد گۆڕان، مەسخ، میتامۆرفوس.

**مسخر**- ا.مف.ع(موسەخخەر- musexxer): رام و گوێڕایەڵ، بەکارهێنراو، گیراو.

**مسخره**- ص.ع(مەسخەرە- mesxere): گەپجاڕ.

**مسخط**- ا.ع(مەسخەت- mesxet): ئەوەی ببێتە مایەی تووڕەیی.

**مسخن**- ا.مف.ع(موسەخخین- musexxin): گەرمکەر.

**مسخوط**- ا.مف.ع(مەسخوت- mesxût): بێزراو.

**مسخول**- ا.مف.ع(مەسخوول- mesxûl): لاوازو خوێڕیلە، بنێس.

**مسد**- ا.ع(مەسەد- mesed): رست، پەت، گوریس.

**مسدد**- ص.ع(موسەددەد- musedded): راست و درووست.

**مسدس**- ص.ع(موسەددەس- museddes): شەش گۆشە، شەش لا.

**مسدود**- ا.مف.ع(مەسدوود- mesdûd): بەستراو، داخراو.

**مسرت**- مص.ع(مەسەرەت- meseret): شادبوون، شادمانی.

**مسرجه**- ا.ع(مەسرەجە- mesrece): چرادان، پایەی چرا.

**مسرح**- ا.ع(مەسرەه- mesreh): شانۆ، لەوەڕگە، پاوان، قەددغە.

**مسرح**- ا.ع(میسرەه- misreh): شانەی قژ.

**مسرع**- ا.فا.ع(موسریٔ- ’musri): خێرا، لەز، پەلەکەر.

**مسرف**- ا.فا.ع(موسریف- musrif): دەست بلاو، وێڵخەرج.

**مسرور**- ا.مف.ع(مەسروور- mesrûr): شاد، خۆشحاڵ، بەکەیف.

**مسروق**-ا.مف.ع(مەسرووغ-mesrûx):دزراو.

**مسری**- ص(موسری- musrî): نەخۆشی درم.

**مسطح**- ا.مف.ع(مەسەتتەه- musetteh): تەخت و پان و هەموار.

**مسطر**- ا.مف.ع(موسەتتەر- musetter): نووسراو، کاغەزی خەت خەت .

**مسطره**- ا.ع(مەستەرە- mestere): راستە.

**مسطور**- ا.مف.ع(مەستوور- mestûr): نووسراو.

**مسطوره**- ا(مەستوورە- mestûre): نموونە، نموونەی کالا کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی بنێردرێ.

**مسعود**- ص.ع(مەسئوود- mes’ûd): بەختەوەر، کامەران، شادمان.

**مسعی**- ا.ع(مەسئا- mes’a): کۆشش، هەوڵ و تەقەللا.

**مسغط**- ا.ع(مەسغەت- mesxet): شوێنی کەوتن، کەوتنگە.

**مسقطی**- ا(مەسغەتی- mesxetî): مەسکەت، جۆرە شیرینی و کێکێکە.

**مسقف**- ا.مف.ع(موسەغغەف-musexxef): سەرگیراو، بنمیچدار.

**مسکت**- ا.فا.ع(موسکیت- muskit): بێدەنگ کەر.

**مسکر**- ا.فا.ع(موسکیر- muskir): سەرخۆشکەر.

**مسکن**- ا.فا.ع(مەسکەن- mesken): ماڵ، شوێنی نیشتەجێ بوون، جێی ئاکنجی بوون.

**مسکن**- ا.فا.ع(موسەککین- musekkin): ئارام بەخش، ئازار شکێن.

**مسکنت**- ا.مص.ع(مەسکەنەت- meskenet): هەژاری، بێنەوایی، فەقیری.

**مسکوت**- ا.مف.ع(مەسکووت- meskût): بێدەنگ کراو، خامۆشکراو.

**مسکون**- ا.مف.ع(مەسکوون- meskûn): ئاوەدان، شوێنێ خەڵکی تێدا بێ.

**مسکه**- ا(مەسکە- meske): کەرە.

**مسکین**- ا.ص.ع(میسکین- miskîn): هەژار، بێنەوا، قەلەندەر، بەلەنگاز.

**مسگر**- ا.ص(میسگەر- misger): مسگەر.

**مسلح**- ص.ع(موسەللەه- muselleh): چەکدار.

**مسلحه**- ا.ع(مەسلەهە- meslehe): شوێنی خەتەر کە پێویست بکا چەکت پێ بێ، شوێنی دیدەوان.

**مسلخ**- ا.ع(مەسلەخ- meslex): کوشتارگە، قەساوخانە.

**مسلسل**- ا.مف.ع(موسەلسەل- muselsel): رەشاش، زنجیرە، جلی رێ رێ، قژی لوول و پێچاو پێچ.

**مسلط**- ص.ع(موسەللەت- musellet): زاڵ، سەرکەوتوو.

**مسلک**- ا.ع(مەسلەک- meslek): رێگە، رێباز.

**مسلم**- ص.ع(موسلیم- muslim): موسوڵمان.

**مسلم**- ا.مف.ع(موسەللەم- musellem): باوەڕکردە، تەسلیم بوو، قبوڵکراو، سەلماو.

**مسلمان**- ص(موسەلمان- muselman): موسوڵمان.

**مسلمه**- ص.ع(موسلیمە- muslime): ژنی موسوڵمان، ئافرەتی موسوڵمان.

**مسلوب**- ا.مف.ع(مەسلووب- meslûb): رفێنراو، بەیار، هەڵکەنراو.

**مسلوخ**- ا.مف.ع(مەسلوخ- meslûx): حەیوانێ کە پێستی گورابێ، گوراو.

**مسلوک**- ا.مف.ع(مەسلووک- meslûk): گیراوەبەر.

**مسلول**- ص.ع(مەسلوول- meslûl): سیلاوی، دووچاری سیل.

**مسما**- ا (موسەمما- musemma): خواردنی چەور.

**مسمار**- ا.ع(میسمار- mismar): مێخ، بزمار.

**مسمط**- ص.ع(موسەممەت- musemmet): حکومێ کە رەت نەکرێتەوەو نارەزایی لەسەر نەبێ، مرواری لە داو و هەڵکێشراو، جۆرە شیعرێکە وەکو چوار خشتەکی، پێنج خشتەکی و شەش خشتەکی و... هتد.

**مسمع**-ا.ع(میسمەء-'misme): گوێ،گوێچکە.

**مسمن**- ص.ع(موسمین- musmin): قەڵەو.

**مسمن**- ص.ع(موسەممەن- musemmen): خواردنی چەور، چەور.

**مسموع**- ا.مف.ع(مەسمووء- 'mesmû): بیستراو.

**مسموم**- ا.مف.ع(مەسمووم- mesmûm): ژەهراوی بووگ.

**مسمی**- ا.مف.ع(موسەمما- musemma): ناونراو، مەعلوم، دیاریکراو.

**مسن**- ا.ع(میسەنن- misenn): بەردەسان، هەسان، سان، هەستان.

**مسن**- ص.ع(موسینن- musinn): بەتەمەن، پیر.

**مسند**- ا.ع(مەسنەد- mesned): پلەو پایە، پشتیوانە، شتێ پشتی پێوە بدەی، شتێ پاڵی پێوە بدرێ.

**مسند**- ا.مف.ع(موسنەد- musned): دراوە پاڵ.

**مسنن**- ا.فا.ع(موسەننین- musennin): دانساز، دکتۆری ددان.

**مسوار**- ا(میسڤار- misvar): مس ئاسا، کانزایەک لە مس و کانزایەکی دی پێک هاتبێ.

**مسواک**- ا.ع(میسڤاک- misvak): مسواک، ددان شۆر، فلچەی ددان شۆری.

**مسود**- ا.فا.ع(موسەڤڤید- musevvid): رەشکەرەوە، نووسەر.

**مسوده**- ا.ع(موسەڤڤەدە- musevvede): رەشنووس.

**مسوغ**- ا.مف.ع(موسەڤڤەغ- musevvex): حەڵاڵ کراو، رەواکراو.

**مسهیل**- ا.فا.ع(موسەهیل- musehil): دەرمانی عەمەل، دەرمانی زگچوون.

**مسیح**- ص.ع(مەسیهـ-mesîh): چەور کراو بەرۆنی پیرۆز، لەقەبی حەزرەتی عیسا.

**مسیحانفس**- ص.مر(مەسیهانەفەس- mesîha nefes): ئەوەی هەناسەو نەفەسی وەکو عیسای هەبێ کەمردوو زیندوو بکاتەوە.

**مسیر**- مص.ع(مەسیر- mesîr): رۆیشتن، شوێنی سەیرو سیاحەت، شوێنی سەیران و گەڕان.

**مسیل**- ا.ع(مەسیل- mesîl): ئاوەڕۆ.

**مشاء**- ص.ع(مەششاء- 'meşşa): کەسێک کە زۆر رێگە بکات، دوو زمان، حکمت مشاء: حیکمەتی ئەرستۆ چونکە ئەرستۆ بابەتەکانی خۆی بەدەم رێکردنەوە دەردەبڕی بۆیە بە پەیڕەوانی وی دەگوترا مەشائی.

**مشائیم**- ا.ع(مەشائیم- meşa'im): شووم، نەحس، بەووم، بەدێوم.

**مشابه**- ص.ع(موشابیهـ- muşabih): لێکچوو، وەکو یەک.

**مشابهت**- مص.ل.ع(موشابەهەت- muşabehet): لێکچوون، بە یەکتر شوبهان.

**مشاجره**- مص.ع(موشاجەرە- muşacere): شەڕ، قەرقەشە.

**مشاجه**- مص.ع(موشاجه- muşacce): شەڕکردن و شکاندنی سەری یەکتر.

**مشار**-ا.مف.ع(موشار-muşar):ئاماژە بۆکراو.

**مشارب**- ا.ع(مەشاریب- meşarib): خواردنەوە.

**مشارع**- ا.ع(مەشارئ- 'meşari): شوێنی ئاو خواردنەوە.

**مشارف**- ا.ع(مەشاریف- meşarif): بەرزی.

**مشارفت**- مص.ع(موشارەفەت- muşarefet): فەخرکردن بەسەر یەکتر بە شەرەف و گەورەیی، ئاگادار بوون لە شتێک.

**مشارق**- ا.ع(مەشاریخ- meşarix): رۆژهەڵات، خۆرهەڵات.

**مشارک**- ص.ع(موشاریک- muşarik): بەشدار.

**مشارکت**- مص.ل.ع(موشارەکەت- muşareket): بەشداریکردن، شەریک بوون.

**مشاش**- ا(مەشاش- meşaş): هەنگوین، هەنگڤین.

**مشاش**- ا.ع(موشاش- muşaş): زەوی نەرم، نەفەس، هەناسە، خوو.

**مشاش**- ا.ع(موشاش- muşaş): سەری ئێسقانی نەرم کە بتوانرێ بجورێ و بخورێ، ڕێگەیەک چەو ڕێژ بێ.

**مشاشه**- ا.ع(موشاشە- muşaşe): بڕوانە موشاش.

**مشاطه**- ص.ع(مەششاتە- meşşate): ئارایشتکەری ژنان.

**مشاع**- ص.ع(موشاء- 'muşa): موڵکێک هاوبەش بێ لەنێوان کۆمەڵە کەسێکدا، بەرەڵڵا.

**مشاعر**- ا.ع(مەشائیر- meşa'ir): هەستان، جێی عیبادەتی حاجییان، شوێنی قوربانی کردن، قوربانگە.

**مشاعره**- مص.ع(موشائەرە- muşa'ere): شیعر خوێندنەوە بەرانبەر بە یەکتر تا بزانرێ کێ شاعیرترە یان شیعری زۆرتری لەبەرە.

**مشاعل**- ا.ع(مەشائیل- meşa'il): چرادان، چرا، مەشخەڵ.

**مشاغل**- ا.ع(مەشاغیل- meşaxil): کاروکاسبی و مەشغەڵەت، مژووڵ و سەرقاڵی.

**مشافهه**- مص.ع(موشافەهە- muşafehe): قسەکردن دەگەڵ یەکتریدا.

**مشاق**- ا.ع(مەشاغغ- meşaxx): مەشەقەت و ڕەنج و زەحمەت.

**مشاق**- ص.ع(مەششاغ- meşşax): مەشقدەر، ڕاهێنەر، تەعلیمدەر، خێرانووس.

**مشاکل**- ا.ع(مەشاکیل- meşakil): زەحمەت، ئەستەم و گرفتان.

**مشاکل**- ص.ع(موشاکیل- muşakil): هاوشێوە، هاو شەکڵ.

**مشاکله**- مص.ع(موشاکەلە- muşakele): لێکچوون.

**مشام**- ا.ع(مەشامم- meşamm): کەپوو، لووت، دفن.

**مشاور**- ا.فا.ع(موشاڤیر- muşavir): ڕاوێژکەر، ڕایزەن، شیرەتکار.

**مشاوره**- مص.ع(موشاڤەرە- muşavere): ڕاوێژکردن بە یەکدی.

**مشاهد**- ا.ع(مەشاهید- meşahid): شوێنی ئامادەبوونی خەڵکی، مەزارو ئارامگەی یەکێک لە ئیمامان.

**مشاهده**- مص.ع(موشاهەدە- muşahede): تەماشاکردن، ڕوانین، دیتن.

**مشاهره**- مص.ع(موشاهەرە- muşahere): دیاریکردنی مووچە بە مانگانە، کرێی مانگانە، مووچەی مانگانە.

**مشایخ**- ا.ع(مەشایخ- meşayix): شێخان.

**مشایع**- ا.فا.ع(موشایئ-'muşayî): بەرێکەر، کەسێک بچێتە بەرێکردنی کەسێک.

**مشایعت**- مص.ع(موشایەئەت- muşaye'et): پەیڕەوی کردن، بەدووی کەسێکدا ڕۆیین، بەرێکردنی میوان.

**مشایم**- ا.ع(مەشایم- meşayim): مناڵدان، پزدان.

**مشئوم**- ص.ع(مەشئووم- meş'ûm): شووم، نەحس، بەووم، بەدیوم.

**مشبع**- ا.مف.ع(موشبەء- muşbe’): تێروپڕ، تێربوو، تێروتەسەل.

**مشبک**- ا.مف.ع(موشەببەک- muşebbek): کونکون، تۆڕئاسا.

**مشبه**- ا.مف.ع(موشەببەه- muşebbeh): لێچوو.

**مشت**- ا(موشت- muşt): مست، مستێک گەنم.

**مشت**- ا(میشت- mişt): جۆگەی ئاو.

**مشتاسنگ**- ا.مر(موشتاسەنگ- muştaseng): قۆچەقانی، بەردەقانی، قەڵماسنگ.

**مشتاق**- ص.ع(موشتاغ- muştax): ئارەزوومەند، تاسەبار.

**مشتبه**- ص.ع(موشتەبیه- muştebih): تێکەڵ و پێکەڵ و نامەفهوم و نامەعلوم.

**مشتد**- ص.ع(موشتەدد- muştedd): بەهێز، توند، مکوم.

**مشترک**- ا.مف.ع(موشتەرەک- muşterek): هاوبەش.

**مشت رند**- ا.مر(موشت رەند- muşt rend): رەندەی دەستی، رەندەی دارتاشی.

**مشتری**- ا.فا.ع(موشتەری- muşterî): کڕیار.

**مشتری**- ا. خ(موشتەری- muşterî): ئەستێرەی موشتەری، ژوبیتەر.

**مشت زن**- ص.فا(موشت زەن- muşt zen): بۆکسباز.

**مشتعل**- ا.فا.ع(موشتەئیل- muşte’il): هەڵایساو، گڕگرتگ.

**مشتغل**- ا.فا.ع(موشتەغیل- muştexil): سەرگەرمی کار، مژوول.

**مشتق**- ا.مف.ع(موشتەغ- muştex): وشەیەک لە وشەیەکی دیکەوە وەرگیرابێ‌و دروست کرابێ، جیابووگەوە.

**مشتکی**- ا.مف.ع(موشتەکا- muşteka): شکایەت لێکراو.

**مشتکی**- ا.فا.ع(موشتەکی- muştekî): شکایەتکەر.

**مشتلق**- ا(موشتلوغ- muştlux): مژدانە.

**مشتمال**- ا.مص(موشت مال- muşt mal): شێلان بە دەست.

**مشتمل**- ا.فا.ع(موشتەمیل- muştemil): شتێک بگرێتەوە.

**مشتنگ**- ص(موشتەنگ- muşteng): دز، رێگر، جەردە.

**مشتواره**- ا(موشتڤارە- muşt vare): مست ئاسا، رەندەی دارتاشی، مستێک لە شتێک.

**مشتوک**- ا(موشتوک- muştûk): فیلتەری جگەرە.

**مشته**- ا(موشتە- muşte): مشتە، مشتوو.

**مشتهر**- ا.مف.ع(موشتەهەر- muşteher): بەناوبانگ، شۆرەتدار، مەنشور، ناودار.

**مشتهی**- ا.مف.ع(موشتەها- muşteha): ئارەزووکراو، پەسندو خوازراو، مایەی حەز.

**مشتهی**- ا.فا.ع(موشتەهی- muştehî): ئارەزوودار، خودان حەزو ئارەزوو.

**مشتی**- ا(موشتی- muştî): جۆرە قوماشێکی ئاوریشمی تەنک و ناسکە.

**مشجر**- ا.ع(مەشجەر- meşcer): دارستان.

**مشجر**- ا.مف.ع(موشەججەر- muşeccer): درەخت دار، شوێنێ درەختی لێ رووێنرابێ.

**مشحون**- ا.مف.ع(مەشهوون- meşhûn): پڕبوو، تژی.

**مشخته**- ا(موشەختە- muşexte): جۆرە شیرینییەکە.

**مشخص**- ا.مف.ع(موشەخخەس- muşexxes): دیاریكراو.

**مشدد**- ا.مف.ع(موشەددەد- muşedded): مكوم كراو، قایم كراو، پیتێ شەددەی لەسەر بێ.

**مشرب**- ا.ع(مەشرەب- meşreb): جێی ئاوخواردنەوە، زەوق و ئارەزوو هەوای نەفس.

**مشربه**- ا.ع(میشرەبە- mişrebe): شەربەی ئاو خواردنەوە، جام یان هەر شتێ ئاوی پێ بخورێتەوە.

**مشرع**- ا.ع(مەشرەء- meşre'): جێی ئاو خواردنەوە.

**مشرف**- ا.فا.ع(موشریف- muşrif): بەرز، كەسێک لە بەرزییەوە زاڵ بێ بەسەر كەسێک یان شتێكدا.

**مشرف**- ا.ع(موشرەف- muşref): شوێنی بەرز.

**مشرف**- ا.مف.ع(موشەڕەف- muşerref): گەورەو پایەبەرز.

**مشرق**- ا.ع(مەشریغ- meşrix): خۆر هەڵات، رۆژهەڵات.

**مشرک**- ص.ع(موشریک- muşrik): كەسێک شەریک بۆ خوا پەیدا بكات.

**مشروب**- ا.مف.ع(مەشرووب- meşrûb): مەشروب، خواردنەوە، هەر خواردنەوەیەک.

**مشروح**- ا.مف.ع(مەشرووە- meşrûh): شرۆڤەكراو، راڤەكراو.

**مشروط**- ا.مف.ع(مەشرووت- meşrût): مەرجدار، مەرج بۆ دانراو.

**مشروطه**- ا.ع(مەشرووتە- meşrûte): حكومەتی یاساو پابەندی قانوون، دەوڵەتێ خودان پەرلەمان بێ و نوێنەرانی میللەت چاودێری كاروباری دەوڵەت بكەن.

**مشروع**- ا.مف.ع(مەشرووء- meşrû'): رەوا، حەڵاڵ.

**مشط**- ا.ع(موشت- muşt): شانە، شانی.

**مشعب**- ا.ع(مەشئەب- meş'eb): رێگە.

**مشعبذ**- ا.فا.ع(موشەئبیز- muşe'biz): سیحرباز، تەردەست، تەڵەكەباز.

**مشعر**- ا.فا.ع(موشئیر- muş'ir): ئاگاداركەرەوە.

**مشعر**- ا.ع(مەشئەر- meş'er): درەختی سێبەردار، شوێنی قوربانی، هەست.

**مشعشع**- ص.ع(موشەئشە ء- muşe'şe'): سێبەری پەراگەندەو تەنک، تەنكە سێبەر، رۆشن، درەخشان، درەوشاوە، پرشنگدار.

**مشعل**- ا.ع(مەشئەل- meş'el): چرادان، چرا، مەشخەڵ.

**مشعوف**- ص.ع(مەشئووف- meş'uf): خۆشحاڵ، كەیفخۆش، دڵخۆش، دڵدار.

**مشغله**- ا.ع(مەشغەلە- meşxele): كەسێک مژوولی كارو كاسبی بێ.

**مشغول**- ا.مف.ع(مەشغوول- meşxûl): مژوول، سەرقاڵ، پژگاڵ.

**مشفق**- ا.فا.ع(موشفیغ- muşfix): دڵسۆز، میهرەبان، بەبەزەیی.

**مشق**- مص.ع(مەشغ- meşx): مەشقكردن، راهێنان.

**مشقت**- مص.ع(مەشەغغەت- meşexxet): رەنج و هەوڵ و تەقەلا، مەینەت، زەحمەتكێشان.

**مشک**- اا(میشک- mişk): میسک، عەترێكی بۆن خۆشە لە ناوكی ئاسكی میسک دەردەهێنرێ.

**مشكات**- ا.ع(میشكات- mişkat): چرادان، شوێن دانانی چرا.

**مشكل**- ا.ص.ع(موشكیل- muşkil): زەحمەت، ئەستەم، كاری سەخت و دژوار، گیروگرفت.

**مشكل**- ا.مف.ع(موشەككەل- muşekkel): شەكڵگرتوو، شێوەگرتوو، پێكهاتوو.

**مشكو**- اا(موشكو- muşkû): حەرەمسەرا، بتخانە، باڵەخانە، كۆشک، كوچک.

**مشکور**- ا.مف.ع(مەشکوور- meşkûr): سوپاسکراو، ستایش کراو، پەسندکراو.

**مشکوک**- ا.مف.ع(مەشکووک- meşkûk): ئەوەی مایەی گومان بێ، گومان لێکراو، گومانبار، ئاڵۆزو نادیار.

**مشگ**- ا(مەشگ- meşg): مەشکە.

**مشگ بید**- ا.مر(موشک بید- muşg bîd): جۆرە رووەکێکە.

**مشگچە**- ا(میشکچە- mişgçe): جۆرە گوڵەباخێکە.

**مشگدانە**- ا(میشگدانە- mişgdane): جۆرە دانەوێڵەیەکە بە ئەندازەی نیسکێکەو لە پزیشکگەریدا بەکار دێت، ناوی نەوایەکی باربەدە.

**مشگدم**- ا(موشگدەم- muşgdem): باڵندەیەکی رەشی زۆر دەنگخۆشە.

**مشگفام**- ص(میشگفام- mişgfam): رەش.

**مشگمالی**- ا(موشگمالی- muşgmalî): ئاهەنگێکی مۆسیقایە.

**مشگی**- ص(میشگی- mişgî): رەش.

**مشگیچە**- ا(مەشگیچە- meşgîçe): مەشکەی بچووک.

**مشگیزە**- ا(مەشگیزە- meşgîze): کیسەیەکی بچووکە بەسەر پەڕەی هەندێ گیاوە هەیە.

**مشگین**- ص.ن(میشگین- mişgîn): رەش، ئەوەی بۆنی میسک بدات.

**مشمئز**- ا.فا.ع(موشمەئیز- muşme'iz): بێزار، رەڤیو.

**مشمش**- ا.ع(میشمیش- mişmiş): قەیسی، شێلانە، زەردەلوو.

**مشمشە**- ا(میشمیشە- mişmişe): نەخۆشییەکی درمە.

**مشمع**- ا.مف.ع(موشەممەء- muşemme'): مشەما.

**مشمول**- ا.مف.ع(مەشموول- meşmûl): شتێک، شتێک بیگرێتەوە.

**مشموم**- ا.مف.ع (مەشمووم- meşmûm): بۆنکراو، ئەوەی بە بۆن بناسرێتەوەو هەستی پێ بکرێ.

**مشنج**- ا(میشەنج- mişenc): مێشێکی سەوز باوە.

**مشنگ**- ص(مەشەنگ- meşeng): دز، رێگر، چەتە.

**مشنگ**- ا.مف.ع(مەشەنگ- meşeng): لەوتاو، ئاوێتە، ناخالیس.

**مشورت**- ا.مص.ع(مەشڤەرەت- meşveret): راوێژو تەگبیر، رایزەنی، شیرەتکاری.

**مشوش**- ا.مف.ع(موشەڤڤەش- muşevveş): تێکەڵ و پێکەڵ، پەرێشان، ئاڵۆز، بێ سەروبەر.

**مشوق**- ا.فا.ع(موشەڤڤیخ- mûşevvix): ئارەزوو بزوێن، بە شەوق و زەوقهێن.

**مشهد**- ا.ع(مەشهەد- meşhed): مەزار، مەرقەدی ئیمامان.

**مشهود**- ا.مف.ع(مەشهوود- meşhûd): رۆژی هەینی، رۆژی پەسلانێ، بینراو، ئەوەی بدینرێ، ئەوەی ببنە شایەد لەسەری.

**مشهور**- ص.ع(مەشهوور- meşhûr): ناودار، ناسراو، بەناوبانگ، بەنامێ.

**مشهی**- ا.فا.ع(موشەههی- muşehhî): ئارەزوو بزوێن، ئیشتیا بزوێن، شەهوەت بزوێن، هەوەس بزوێن.

**مشی**- مص.ل.ع(مەشی- meşî): رۆییشتن، رێکردن.

**مشیانە**- ا.خ(مەشیانە- meşyane): حەوا، یەکەم ئافرەتی خوڵقێنراو.

**مشیەو مشیانە**- ا.خ(مەشیەو مەشیانە- meşyew meşyane): ئادەم و حەوا (بەپێی ئاینی زەردەشتی).

**مشیب**- مص.ل.ع(مەشیب- meşîb): پیربوون، پۆرسپی بوون.

**مشیت**- مص.ع(مەشییەت- meşîyet): ویستن، ئیرادەو خواستی یەزدان.

**مشیخه**- ا.ع(مەشیخە- meşîxe): پیران.

**مشید**- ا.مف.ع(مەشید- meşîd): گەچکاری کراو، قایم و بەرز، سپیکاریکراو.

**مشید**- ا.مف.ع(موشەییەد- muşeyyed): بەرز، مکوم و قایم و پتەو، هەڵکراو.

**مشیر**- ا.فا.ع(موشیر- muşîr): ئاماژەکەر، راوێژکەر.

**مشیمه**- ا.ع(مەشیمە- meşîme): منداڵدان، پزدان، یەڵاش.

**مشیمیه**- ا(مەشیمییە- meşîmîye): پەردەیەکی ناسکی رەشە لە ناو چاودا.

**مص**- مص.م.ع(مەس- mes): مژین.

**مصائب**- ا.ع(مەسائیب- mesa'ib): بەڵاو لێقەومان.

**مصاب**- ا.مف.ع(موساب- musabb): موسیبەتبار، راست و دروست و ئەنگێوە.

**مصاب**- ا.ع (مەسابب- mesabb): رێژگە.

**مصابره**- مص.ع(موسابەرە- musabere): سەبر کردن، زاڵ بوون بەسەر کەسێکدا بەسەبرو تەحەمول.

**مصابیح**- ا.ع(مەسابیە-mesabîh): چرایان.

**مصاحب**- ا.فا.ع(موساهیب- musahib): یارو هاودەم، هاورێ.

**مصاحبه**- مص.ع(موساهەبە- musahebe): گفتوگۆکردن، هەڤپەیڤین.

**مصاحف**- ا.ع(مەساهیف- mesahif): قورعان، مسحەف، کتێبی چکۆڵە.

**مصادر**- ا.ع(مەسادیر- mesadir): سەرچاوان، ژێدەران.

**مصادره**- مص.ع(موسادەرە- musadere): دەست بەسەراگرتنی ماڵی کەسێک بە زۆر، داگیرکردن.

**مصادف**- ا.فا.ع(موسادیف- musadif): یەکتر دیتن، بەرووی یەکدا تەقین.

**مصادفه**- مص.ع(موسادەفە- musadefe): دیتنی کەسێک.

**مصادقه**- مص.ع(موسادەغە- musadexe): دۆستایەتی کردن، بوونە دۆست.

**مصادم**- ا.فا.ع(موسادیم- musadim): کەسێک یان شتێک بەر کەسێک یان شتێکی دی بکەوێ و زیانی پێ بگەیەنێ، ئاسیو رەسێن.

**مصادمه**- مص.ع(موسادەمە- musademe): لێکتردان، پێکدادان.

**مصارعت**- مص.ع(موسارەئەت- musare'et): زۆرەبانی، زۆران گرتن.

**مصارف**- ا.ع(مەساریف- mesarif): مەسرەف، خەرج، شوێنی سەرفکردن و خەرجکردن.

**مصاریع**- ا.ع(مەساریئ- mesarî'): یەک تاکی دەرگا، نیوەی یەک بەیتە شیعر.

**مصاص**- ا.ع(موساس- musas): راز، نهێنی، خاڵیسەی شتێک.

**مصاعب**- ا.ع(مەسائیب- mesa'ib): کێشەو دۆخە، دژواری و گرفتاریان، ئەسپێک پشتی نەبووبێ، سواری نەبووبێ.

**مصاف**- ا.ع(مەساف- mesaf): مەیدانی شەڕ، ریز بەستن.

**مصافحه**- مص.ع(موسافەهە- musafehe): تەوقەکردن، دەست گوشینی یەکتر.

**مصالح**- ا.ع(مەسالیە- mesalih): بەرژەوەندی و قازانجان، کەرەستەو تفاق.

**مصالح**-ا.فا.ع(موسالیە-musalih): ئاشتیکەر.

**مصالحه**- مص.ع(موسالەهە- musalehe): ئاشتی کردن.

**مصانع**- ا.ع(مەسانئ- 'mesani: کارخانان.

**مصاوله**- مص.ع(موساڤەلە- musavele): هێرش و پەلاماردانی یەکدی، هەڵمەتبردن.

**مصاهرت**- مص.ع(موساهەرەت- musaheret): خزمایەتی کردن لە ڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە.

**مصاید**- ا.ع(مەساییدـ mesayîd): داو، تەڵە، کەرەستەی ڕاوکردن، ئامێری ڕاوکردن.

**مصب**- ا.ع(مەسەبب- mesebb): ڕێژگەی ئاو، ئەو شوێنەی کە ئاوی ڕووبار دەڕژێتە دەریاوە.

**مصباح**-ا.ع(میسباه- misbah): چرا.

**مصبغە**- ا.ع(مەسبەغە- mesbexe): خومخانە.

**مصحح**- ا.فا.ع(موسەههیه- musehhih): هەڵەگیر، هەڵەچن، ڕاستکەرەوە.

**مصحح**- ا.مف.ع(موسەههەه-musehheh): هەڵەچنکراو، ڕاستکراوە.

**مصحف**- ا.ع(مەسهەف- meshef): قورعان، مەسحەف، کتێب، ئەو نامەو نووسراوانەی لە یەک بەرگدا کۆکرابنەوە.

**مصحف**- ا.فا.ع(موسەههیف- musehhif): کەسێک لە کاتی خوێندنەوەدا هەندێ وشە بە هەڵە بخوێنێتەوەو وشەکە بگۆڕێ.

**مصحف**- ا.مف.ع(موسەههەف- musehhef): وشەیەک لە کاتی نووسین یان خوێندنەوەدا گۆڕدرابێ، وەک: ڕەحمەت بکرێ بەزەحمەت.

**مصحوب**- ا.مف.ع(مەسهوب- meshûb): بە هاودەم بووگ، بەهاوڕابووگ.

**مصداق**- ا.ع(میسداغ- misdax): کەسێک یان شتێک کە شایەدی ڕاستی و دروستی گوتنی کەسێک بێ، نیشانەی ڕاستگۆیی، بەڵگەی ڕاستگۆیی، بەڵگەی دروستی قسە.

**مصدر**- ا.ع(مەسدەر- mesder): سەرچاوە، شوێنی گەڕانەوە، چاوگ، لە دەستووری زمانی فارسییدا چاوگ وشەیەکە کە بەتاو نون یان دال و نوون کۆتایی هاتبێ بە مەرجێ هەر کاتێ نونەکە لە کۆتایی وشەکە لابرا فرمانی ڕابردوو دروست ببێ وەک: رفتن- رفت.

**مصدر**- ا.مف.ع(موسەددەر- musedder): پێشەوا، کەسێک لە پێشەوە بێ.

**مصدع**- ا.فا.ع(موسەددیئ- museddi’): ئەوەی باعیسی سەریەشە بێ.

**مصدق**- ا.فا.ع(موسەددیغ- museddix): باوەڕکەر.

**مصدق**- ا.مف.ع(موسەددەغ- museddex): باوەڕکراو، سەلمێنراو، تەسدیق کراو.

**مصدوقە**- ا.ع(مەسدوغە- mesdûxe): ڕاستی.

**مصدوم**- ا.مف.ع(مەسدوم- mesdûm): ئاسێو دیتگ، ئازار چەشتە.

**مصر**- ا.ع(میسر- misr): شار، ناوچە، لەمپەری نێوان دوو شت، سنووری نێوان دوو زەوی.

**میسران**-ا.ع(میسران-misran): کوفەو بەسرە.

**مصر**- ا.فا.ع(موسیر- musirr): کەسێک پێ لەسەر شتێ دابگرێ، سوور لەسەر شتێک.

**مصراع**- ا.ع(میسراء- misra’): یەک تاکی دەرگ، نیوە بەیتێکی شیعر.

**مصرح**- ا.مف.ع(موسەڕەه- muserreh): ڕون و ئاشکرا بوو، تەسریح دراو.

**مصرف**- ا.ع(مەسرەف- mesref): مەسرەف و خەرجی، شوێنی سەرف کردن، بانک.

**مصروع**- ص.ع(مەسروء- mesrû’): فێدار.

**مصروف**- ا.مف.ع(مەسرووف- mesrûf): سەرفکراو، خاوێن و خالیسە.

**مصطبە**- ا.ع(میستەبە- mistebe): سەکۆ، تەخت، شوێنی تایبەت کە تۆزێ لە زەوی یان لە ناو ژوور بەرزتربێ و کەسێک لەسەری دانیشێت.

**مصطفی**- ص.ع(موستەفا- mustefa): هەڵبژاردە، یەکێکە لە لەقەبەکانی پێغەمبەر.

**مصطکی**- ا(مەستەکی- mestekî): شیرەیەکی هەندێ درەختە، بنێشتە تاڵ، جۆرە درەختێکە.

**مصطلح**- ا.مف.ع(موستەلەح- musteleh): وشەیەک بیێ بە باوو بکەویتە سەر زاری خەڵکی و بۆ مەبەستی غەیرەز ئەسڵی خۆی بەکار بیێت، زاراوە.

**مصعب**- ا.ع(مەسئەب- mes'eb): فەحل، ئەسپێ کە هێشتا سواری نەبووبێ و پشت نەدا.

**مصعد**- ا.ع(میسئەد- mis'ed): قاڵدرمەی کارەبایی، ئاسانسور.

**مصعد**- ا.مف.ع(موسەئئەد- muse''ed): هەڵمێنراو، شلەمەنییەک کە بە کوڵاندنی بڕێکی بیێ بە هەڵم و بڕوات و تام و ڕەنگی بگۆڕێ.

**مصغر**- ا.مف.ع(موسەغغەر- musexxer): بچوک کراوە، لە دەستووری زمانی فارسیدا بە ناوێک دەگوترێ کە نیشانەێن بچووککردنەوەی (ک. چە، و)ی بچێتە سەر وەک: (پسرک، دریاچە، دخترو)= کوڕیژگە، دەریاچە، کچۆڵە.

**مصف**- ا.ع(مەسەفف- meseff): جێی سەف بەستن، مەیدانی جەنگ، شەڕگە.

**مصفات**- ا.ع(میسفات- misfat): کەوگیر، پڵاوپاڵێو، پاڵوێنکە، سوزگی.

**مصفى**- ا.مف.ع(موسەففا- museffa): سافکراو، پاڵێوراو، پاڵاوتە.

**مصقع**- ص.ع(میسغەء- misxe'): ڕەوان زمان و ناودار.

**مصقل**- ص.ع(میسغەل- misxel): خوتبەوێژی زمان سوار.

**مصقله**- ا.ع(میسغەلە- misxele): ئامێرێک کە ژەنگی شتێکی پێ لابدرێ و زاخاوی بداتەوە.

**مصقول**- ا.مف.ع(مەسغوول- mesxûl): مشتو ماڵ دراو.

**مصلح**- ا.فا.ع(موسلیح- muslih): چاکەکار، پیاوی هەژی و ئاشتیکار.

**مصلحت**- ا.ع(مەسلەحەت- meslehet): هەر شتێ مایەی خێرو چاکەو قازانج و ئاسودەیی مرۆڤ بێ، مەسڵەحەت.

**مصلوب**- ا.مف.ع(مەسلوب- meslûb): لە خاچدراو.

**مصلى**- ا.ع(موسەللا- musella): جێی نوێژ کردن، نوێژگە، بەرماڵ.

**مصمت**- ص.ع(موسمەت- musmet): بتەو، ناو پڕو بتەو.

**مصمت**- ا.مف.ع(موسەممەت- musemmet): بێدەنگ کراو، خامۆشکراو، خامۆش، بێدەنگ.

**مصمم**- ا.فا.ع(موسەممیم- musemmim): لێبڕاو، کەسێک بڕیاری کارێکی دابێ و سوور بێ لەسەری.

**مصنع**-ا.ع(مەسنەء- mesne'): کارگە، کارخانە، شوێنێ باراناوی تێدا کۆبێتەوە، گۆلاو.

**مصنف**- ا.فا.ع(موسەننیف- musennif): نووسەری کتێب، کتێب نووس.

**مصنف**- ا.مف.ع(موسەننەف- musennef): کتێبی ڕێکخراو.

**مصنوع**- ا.مف.ع(مەسنوء- mesnû'): دروستکراو.

**مصوب**- ا.مف.ع(موسەڤڤەب-musevveb): تەسدیق کراو، پەسندکراو.

**مصوت**- ا.فا.ع(موسەڤڤیت- musevvit): دەنگدار، ئەوەی بە دەنگی بەرز بانگ بکات.

**مصور**- ا.مف.ع(موسەڤڤەر- musevver): وێنەگیراو.

**مصور**- ا.فا.ع (موسەڤڤیر-mussever): وێنەگر، نیگارکێش.

**مصون**- ا.مف.ع(مەسون- mesûn): پارێزراو.

**مصیب**- ا.فا.ع(موسیب- musîb): ڕاستکار، لەسەر هەق.

**مصیبت**- ا.ع(موسیبەت- musîbet): بەڵاو خەم و تەنگانە، نسیبەت.

**مصید**- ا.ع(میسیەد- misyed): داو، هەر شتێک بۆ ڕاوکردن بەکاربێ.

**مصیر**- مص.ل.ع(مەسیر- mesîr): گەڕانەوە، ئاقیبەت و چارەنووس.

**مضاء**- مص.ل.ع(مەزاء- meza'): بڕین، ڕەتبوون.

**مضاب**- ا.ع(مەزابب- mezabb): شوێنێ مارمیلۆکی زۆر بێ.

**مضاجع**- ا.ع(مەزاجیئ- mezaci'): خەوتنگان، گۆڕستان.

**مضاجعه**- مص.ل.ع(موزاجەئە-muzace'e): پێکەوە نووستن.

**مضاحکه**- مص.ل.ع(موزاهەکە- muzaheke): پێکەوە خەنین، هێنانە پێکەنین.

**مضاده**- مص.ل.ع(موزاددە- muzadde): دژایەتی کردنی یەک.

**مضار**- ا.ع(مەزاڕ- mezarr): مەزەڕەت، زەرەرو زیانان.

**مضارب**- ا.ع(مەزاریب- mezarib): خێوەتگە.

**مضاربه**- مص.ع(موزارەبە- muzarebe): بەگژیەکداچوون، شەڕکردن، بازرگانی کردن بەپارەی کەسێکی دی، پارەدان بە کەسێک بۆ موعامەلە بە شەریکی.

**مضارع**- ص.ع(موزاریئ- muzari'): وەک یەک، فرمانێ دەلالەت لە ئێستا یان داهاتوو بکات.

**مضاعف**- ص.ع(موزائەف- muza'ef): دوو بەرانبەر، دوو چەنانە.

**مضاف**- ا.مف.ع(موزاف- muzaf): زیاد کراو، دراوەپاڵ.

**مضامین**-ا.ع(مەزامین-mezamîn): ناوەڕۆکان.

**مضایق**- ا.ع(مەزایغ- mezayix): گەلی، تەنگە، تەنگەی هورمز.

**مضایقه**- مص.م.ع(موزایەغە-muzayexe): تەنگەتاو کردن.

**مضبوط**- ا.مف.ع(مەزبووت- mezbût): دروست، ڕاست، بێ هەڵە، ئەرشیوکراو، لەبەرکراو، مکوم و قایم، تۆمارکراو.

**مضبه**- ا.ع(مەزەببە- mezebbe): جێگەیەک مارمیلۆکی زۆربێ.

**مضجج**- ا.فا.ع(موزیجج- muzicc): ناڵەکار.

**مضجر**- ا.فا.ع(موزجیر- muzcir): خەمهێن، مەلولکار.

**مضجع**- ا.ع(مەزجەء- mezce'): خەوتنگە، گڵکۆ، ئارامگە.

**مضحاک**- ص.ع(میزهاک- mizhak: کەسێک زۆر پێ بکەنێ.

**مضحک**- ا.فا.ع(موزهیک- muzhik): مایەی پێکەنین، پێکەنین هێنەر.

**مضحکه**- ا.ع(مەزهەکە- mezheke): مایەی پێکەنین.

**مضر**- ا.فا.ع(موزیر- muzir): موزیر، زەرەرگەیەنەر.

**مضراب**- ا.ع(میزراب- mizrab): ئامێرێکی کانزایی بچوکە تاری پێ لێ دەدەن.

**مضرب**- ا.ع(میزرەب- mizreb): خێوەتی گەورە، سەراپەردە.

**مضرت**- ا.ع(مەزەڕەت- mezerret): زەرەر، زیان.

**مضرس**- ا.مف.ع(موزەڕەس- muzerres): ددانەدار، کەسێک گرفتارو گیرۆدەی دەردو بەڵابێ، پیاوی کارامەو تەنگانە دیتو.

**مضروب**- ا.مف.ع(مەزرووب- mezrûb): لێدراو.

**مضطر**- ص.ع(موزتەر- muzterr): ناچار، گیرۆدە، دەستکورت.

**مضطرب**- ا.فا.ع(موزتەریب- muzterib): شڵەژاو، نیگەران، پەرێشان.

**مضعف**- ا.فا.ع(موزەئیف- muze''if): فەرموودەی لاواز، بێ تواناکەر، لاوازکەر.

**مضغ**- مص.ع(مەزغ- mezx): جووین.

**مضغه**- ا.ع(موزغە- muzxe): پلەگۆشتێک، پارو لە دەمدا بجووریّ.

**مضل**- ا.فا.ع(موزیلل- muzill): گومراکەر.

**مضله**- ا.ع(مەزەللە- mezelle): گومرایی، شوێنێ کە مرۆڤ ڕێی تیا هەڵە بکات.

**مضمار**- ا.ع(میزمار- mizmar): شوێنی رامکردنی ئەسپ، مەیدانی ئەسپ تاودانێ، دوا خاڵ کە ئەسپ لە پێشبڕکێدا دەبێ بیگاتێ..

**مضمحل**- ص.ع(موزمەهیلل-muzmehill): لەنێو چوو، نەماگ.

**مضمر**- ا.مف.ع(موزمەر- muzmer): پەنهان و شاراوە، لەویژدانا هێڵراوە.

**مضمضه**- مص.ع(مەزمەزە- mezmeze): ئاو لە دەم وەردان، غەرغەرە.

**مضموم**- ا.مف.ع(مەزموم- mezmûm): کۆکراوە، وشەیەک زەمە (بۆر)ی لەسەر بێ.

**مضمون**- ا.مف.ع(مەزمون- mezmûn): ناوەرۆک و بابەت، ناواخن.

**مضئ**- ا.فا.ع(موزیٔ- muzî’): پرشنگدار، بە پرتەو، روناک کەرەوە.

**مضی**- مص.ل.ع(موزی- muzî): رۆییشتن، رەتبوون، تێپەربوونی رۆژگار.

**مضیف**- ا.ع(مەزیف- mezîf): شوێنی میوانداری، جێی پێشوازییکردنی میوانان.

**مضیف**- ا.ص(موزیف- muzîf): خانەخوێ.

**مضیق**- ا.ع(مەزیغ- mezîx): جێی تەنگ، کەنداو، تەنگە.

**مضیقه**- ا.ع(مەزیغە- mezîxe): تەنگانە، شوێنی تەنگ.

**مطابخ**- ا.ع(مەتابیخ- metabix): مویەق، متبەخ، خواردنگە، چێشتخانە.

**مطابع**- ا.ع(مەتابیء- metabi’): چاپخانان.

**مطابق**- ص.ع(موتابیغ- mutabix): یەکسان، جووت و چون یەک.

**مطابقه**- مص.ع(موتابەغە- mutabexe): بەرانبەرکردن، بەرانبەر کردنی دوو شت بەیەکەوە، جۆرە سنعەتێکی شیعرییە.

**مطاحن**- ا.ع(مەتاهین- metahin): ئاش، ئاسیاو.

**مطار**- ا.ع(مەتار-metar): فرۆکەخانە، فرگە.

**مطارح**- ا.ع(مەتاریح- metarih): شوێنی بڵاوکردنەوەی تۆران.

**مطارده**- مص.م.ع(موتارەدە- mutarede): یەکدی راونان، پەلاماردانی یەکدی.

**مطارق**- ا.ع(مەتاریغ- metanrix): مەترەقان، کوتەکان، مێکوتان.

**مطاع**- ا.مف.ع(موتاء- muta’): بەگوێکراو، کەسێک خەڵکی گوێڕایەڵی بن و فەرمانی جێبەجێ بکەن.

**مطاعم**- ا.ع(مەتائیم- meta’im): خواردنگە، ریستوران، چێشتخانە.

**مطاف**- ا.ع(مەتاف- metaf): شوێنی تەوافکردن، شوێنی سوورانەوە.

**مطالب**- ا.ع(مەتالیب- metalib): بابەت و مەبەستان.

**مطالبه**- مص.م.ع(موتالەبە- mutalebe): داواکردن، داواکردنی شتێک یان هەقی خۆت لە کەسێک.

**مطالع**- ا.ع(مەتالیء- metali’): شوێنی دەرکەوتن، شوێنی هەڵهاتنی رۆژو مانگ و ئەستێران....

**مطالعه**- مص.م.ع(موتالەئە- mutale’e): خوێندنەوەو موتالا، لێکۆڵینەوە، ئاگاداربوون لە شتێک لە ئەنجامی روانین و رامان.

**مطامع**- ا.ع(مەتامیٔ- metami’): جێگەی تەماع.

**مطاوع**- ص.ع(موتاڤیٔ- mutavi’): گوێڕایەڵ، سازگار، گونجاو، خۆشدەست.

**مطاوعت**- مص.م.ع(موتاڤەئەت- mutave'et): رازی بوون، گوێڕایەڵی کردن، فەرمان بردن.

**مطاوی**- ا.ع(مەتاڤی- metavî): پێچاوپێچی شتی وەکو گوریس یان ریخۆڵە.

**مطایبه**- مص.ل.ع(موتایەبە- mutayebe): سوعبەتکردن، گاڵتەکردن.

**مطب**- ا.ع(مەتەب- meteb): شوێنێ کە دکتۆر چارەسەرو دەرمانی نەخۆشانی تیا بکات.

**مطبخ**- ا.ع(مەتبەخ- metbex): مەتبەخ، مویەق، ئاشخانە.

**مطبع**- ا.ع(مەتبەء- 'metbe): چاپخانە.

**مطبق**- ا.مف.ع(موتبەغ- mutbex): تێک ئالاو، خراوە سەریەک.

**مطبق**- ا.مف.ع(موتەببەغ- mutebbex): جۆرە قوماشێکە، سەرپۆشدار، قەدکراو.

**مطبقه**- ا.ع(موتبیغە- mutbixe): تای توند کە شەوو رۆژ بەرت نەدا.

**مطبوخ**- ا.مف.ع(مەتبووخ- metbûx): کولاو، لە بواری دکتۆریدا دەرمانێکە کە بیکوڵێنن و شیلەی بدەن بە نەخۆش، جۆشانە.

**مطبوع**- ا.مف.ع(مەتبووء- 'metbû): چاپکراو، شتێک بە تەبیعەتی مرۆڤ بێ.

**مطجن**- ا.مف.ع(موتەجەن- muteccen): سوورەوەکراو لە تاوەدا.

**مطحنه**- ا.ع(میتهەنە- mithene): ئاش، ئاسیاو.

**مطر**- ا.ع(مەتەر- meter): باران، واران

**مطرا**- ص.ع(موتەرا- muterra): تەرو تازەو ئاودار.

**مطران**- ا.ع(مەتران- metran): مەتران، سەرۆکی کاهینان.

**مطرب**- ا.فا.ع(موتریب- mutrib): سترانبێژ، نەواژەن، گۆرانی بێژ، سەماکار.

**مطرح**- ا.ع(مەترەه- metreh): شوێنی بلاوکردنەوەو هەوڵدان.

**مطرد**- ا.ع(میترەد- mitred): کورتەرم، نێزەی کوڵ، عەلەم.

**مطرد**- ص.ع(موتەڕەد- muterred): درێژ، تولانی، (رۆژێکی درێژ).

**مطرد**- ا.فا.ع(موتەڕید- muterrid): گشتی، دوا بە دوای یەک.

**مطرز**- ا.مف.ع(موتەرەز- muterrez): نەخش و نیگاردار، پەراوێزدار، جلکی بە نەخش و نیگار.

**مطرز**- ا.فا.ع(موتەڕیز- muterriz): کەسێک کاری نەخشاندنی جل و بەرگ بێ.

**مطرف**- ا.ع(میترەف- mitref): جۆرە جلێکە.

**مطرف**- ا.ع(موتەرەف- muterref): هەوەڵ و سەرەتای شتێک، ئەسپێک کە سەرو کلکی رەش یان سپی بێ.

**مطرف**- ا.فا.ع(موتەریف- muterrif): کەسێک لە پەڕی لەشکر بدات و بجەنگێ.

**مطرق**- ا.ع(میترەغ- mitrex): چەکوش، کوتەک، مەترەق.

**مطروح**- ا.مف.ع(مەترووه- metrûh): توڕدراو.

**مطرود**- ا.مف.ع(مەترود- metrûd): وەدەرنراو، دەرکراو.

**مطعم**- ا.ع(مەتئەم- met'em): خواردنگە، چێشتخانە، ریستوران.

**مطعوم**- ا.مف.ع(مەتئووم- met'um): خوراو، خواردن.

**مطعون**- ا.مف.ع(مەتئوون- met'ûn): تانەلێدراو، بە نێزە لێدراو، سەرزەنشت کراو، تاعوون لێدراو، ئاژنکراو.

**مطفف**- ا.فا.ع(موتەففیف- muteffif): کەسێک لە پێوانەو کێشانەدا کەم بپێوێ و سووک بکێشێت.

**مطفی**- ا.فا.ع(موتفی- mutfî): کوژێنەرەوەی ئاگر، خامۆشکەر.

**مطلا**- ا.مف.ع(موتەلّلا- mutella): زەرکفت، زەرکەش.

**مطلب**- ا.ع(مەتلەب- metleb): مەبەست، بابەت، ئارمانج.

**مطلع**- ا.ع(مەتلەء- metle’): شوێنی هەڵاتنی ستێران، سەرەتای قسە، یەکەمین بەیتی غەزەل یان قەسیدە.

**مطلع**- ا.فا.ع(موتتەلیء- mutteli’): ئاگادارو شارەزا لە کارێک.

**مطلق**- ص.ع(موتلەغ- mutlex): ئازادو ڕەها.

**مطلقە**- ص.ع(موتەللەغە- mutellexe): ژنی تەڵاقدراو.

**مطلوب**- ا.مف.ع(مەتلووب- metlûb): داواکراو، خوازراو.

**مطمئن**- ص.ع(موتمەئین- mutme’in): دڵنیاو ئاسودە.

**مطمح**- ا.ع(مەتمەه- metmeh): جێی تەماح، شوێنی چاو تێ برین، جێیە یان شتێ چاوی تێ ببردرێ.

**مطمورە**- ا.ع(مەتموورە- metmûre): سەرداب یان ژێر زەمینێک کە ئازوقەو خواردەمەنی تێدا وەشێردرێ، زیندان.

**مطموس**- ا.مف.ع(مەتمووس- metmûs): نابینا، گوم بووگ، دوورخریاگ.

**مطواع**- ص.ع(میتڤاء- mitva’): گوێڕایەڵ.

**مطوق**- ص.ع(موتەڤڤەغ- mutevvex): تەوقدار، تەوق لە مل، گەردنبەن.

**مطوقە**- ص.ع(موتەڤڤەغە- mutevvexe): تەوقدار، کۆتری تەوق لەمل .

**مطول**- ا.ع(موتەڤڤەل- mutevvel): درێژپێدراو، درێژ. .

**مطوی**- ا.ع(مەتڤا- metva): پێچ و ئەڵقە، وەکو پێچ و ئەڵقەی گوریس یان ریخۆڵە، لۆ.

**مطهر**- ا.فا.ع(موتەهیر- mutehhir): پاککەرەوە، پاکژکەرەوە.

**مطهر**- ا.مف.ع(موتەههەر- mutehher): پاک و خاوێن، پاکەوەکراو.

**مطهرە**- ا.ع(مەتهەرە- methere): مەسینە، ئافتاوە.

**مطیب**- ا.مف.ع(موتەییەب- muteyyeb): پاکیزەو بۆنخۆشکراو.

**مطیر**- ص.ع(مەتیر- metîr): باراناوی، بارانی، باران دیتە، باران چەشتو.

**مطیر**- ا.ص.ع(موتەییەر- muteyyer): داری تەڕو تازە، جۆرە عەبایەکە کە وینەی تەیرو توی تێدایە.

**مطیع**- ا.فا.ع(موتیء- mutî’): گوێڕایەڵ، ملکەچ.

**مطیعە**- ا.ع(موتییە- mutîye): هەر چوار پێیەک سواری بن ئیدی نێر بێ یان مێ.

**مظال**- ا.ع(مەزالل- mezall): چەتر، خێوەت، چادری گەورە، سابات و کەپر.

**مظالم**- ا.ع(مەزالیم- mezalim): زوڵم و زۆر، زۆرداری، ئەوەی بە زۆرو غەدر لە کەسیک داگیر بکرێ.

**مظان**- ا.ع(مەزانن- mezann): جێی گومان و مەزەنە، نرخ و بەهای کاڵا، شوێنێ کە گومانی بوونی شتێکی تیا بکرێ.

**مظاهر**- ا.ع(مەزاهیر- mezahir): شوێنی دەرکەوتن، دیاردە، جیلوەگا.

**مظاهر**- ا.فا.ع(موزاهیر- muzahir): پشتیوان، پارێزەر، هاوپشت.

**مظاهرت**- مص.م.ع(موزاهەرەت- muzaheret): هاوپشتی کردنی یەک، یارمەتیدان و پشتگیری کردنی یەکدی، ڕێپێوان.

**مظروف**- ا.مف.ع(مەزرووف- mezrûf): ئەوەی لە قاپی بکەن یان بیرێژنە قاپەوە.

**مظفر**- ص.ع(موزەففەر- muzeffer): سەرکەوتوو.

**مظل**- ا.فا.ع(موزیلل- muzill): سێبەردار، سایەدار، سایەئەناز.

**مظلم**- ص.ع(مـوزلیم- muzlim): تاریک و نوتەک، شەوی تاریک.

**مظلمە**- ا.ع(مـەزلیـمـە- mezlime): زوڵم، ئەوەی بە زۆرو غـەدر لە کـەسێک داگـیـرکـرابێ، زۆرداریییەک لە کەسێک کرابێ.

**مظلوم**- ا.مف.ع(مـــەزلـووم- mezlûm): مەزڵووم، زوڵم لێکراو، غەدرلێکراو.

**مظلە**- ا.ع(مـــەزەلـە- mezelle): چەتـر، سەیوان، خێوەتی گەورە، کەپرو سابات.

**مظنون**- ا.مف.ع(مـــەزنـوون- meznûn): گومان لێکراو.

**مظنە**- ا.ع(مەزیننە- mezinne): جێی گومان کردن، شوێنێ گومانی ئەوەی لێبکرێ کە شتێکی تێدابێ، نرخ و بەهای کالا.

**مظهـر**- ا.ع(مـەزهەر- mezher): شـوێنی دەرکەوتن، شوێنی ئاشکرابوون، دیاردە.

**مع**- حـر(مـەئە- me'e): لەگـەڵ، بە، وەک: بەداخەوە.

**معاء**- ا.ع(میئاء- mi'a'): ریخۆڵە.

**مـعـابد**- ا.ع(مـــەئابیــد- me'abid): پەرستگەکان.

**معابر**- ا.ع(مەئابیر- me'abir): بواران.

**مـعـاتب**- ا.مف.ع(مـوئاتەب- mu'ateb): گلەیی لێکراو، سەرزەنشت کراو.

**معـاتبە**- مص.م.ع(موئاتەبە- mu'atebe): گلەیی کرن لە یەکدی، تورەبوون و گلەیی کردن.

**معاجین**- ا.ع(مەئاجین- me'acin): ماجوم.

**معاد**- مص.ل.ع(مەئاد- me'ad): گەڕانەوە، ئەو دنیا.

**معـادات**- مص. ل.ع(موئادات- mu'adat): دژمنایەتی کردنی یەکدی.

**معـادل**- ص.ع(موئادیل- mu'adil): هاوتا، هاوسەنگ، بەرانبەر، هاوکێش.

**مـعـادلە**- مص.م.ع(مـوئادەلە- mu'adele): هاوکێشە، بەرانبەر کردن، هاوکێش کردنی دووشت.

**معادن**- ا.ع(مەئادین- me'adin): کانزایان، کانگایان.

**معـاذ**- مص.ل.ع(مـەئاز- me'az ): پەنابردن، پەناگە.

**معاذیر**- ا.ع(مەئازیر- me'azîr): هەنجەت و بیانوو، پاکانە، مایەی عوزرخوازی.

**معارج**- ا.ع(مەئاریج- me'aric): قاڵدرمە، نەردەوان، پەیژە، ئەوەی پێیدا سەرکەوی.

**مـعـارض**- ص.ع(مـــوئاریز- mu'ariz): ناڕازی، بەرهەڵستکار.

**معارضە**- مص.ل.ع(موئارەزە- mu'areze): ململانێ کردنی دوو خەنیم، شەڕکردن، شکاندنی قسەی کەسێک، ئۆپۆزیسیون.

**مـعـارف**- ا.ع(مـەئاریف- me'arif): ئەهلی عـیـلم و زانسـتـان، خـەڵکانی بە نامێو ناودار، زانست و زانیاریان.

**معارفە**- مص.م.ع(موئارەفە- mu'arefe): یەکتر ناسین، ئاشنایەتی پەیداکردن.

**معارک**- ا.ع(مەئاریک- me'arik): شەڕ.

**معاش**- مص.ع(مـەئاش- me'aş): ژیان، ئەو شتەی پێی بژی لە خواردنو خواردنەوە، بژێوی.

**معاشر**- ا.ع(مەئاشیر- me'aşir): کەسوکارو خزم و خۆیشان.

**مـعـاشـر**- ص.ع(مـوئاشـیــر- mu'aşir): هاونشین، دۆست و هاودەم.

**مـعـاشـرتە**- مص.ل.ع(مـــوئاشـــەرەت- mu'aşeret): پێکەوە ژیان، دۆستـایەتی کردن و تێکەڵاو بوون.

**مـعـاشـقـە**- مص.ل.ع(مــوئاشـــەغــە- mu'aşexe): ئاشقێنی کردن.

**مـعـاصـر**- مص.ع(مـوئاسـیـر- mu'asir): هاومێژ، هاوچەرخ، هاوعەسر.

**معاصر**- ا.ع(مەئاسیر- me'asir): ئامـێری ئاوگرتنی میوەو شت، عەسارە.

**معاصی**- ا.ع(مەئاسی- me'asî): سەرپێچی و خەتاو گوناهان.

**معاضد**- ا.فا.ع(موئازید- mu'azid): هاوکار، یارویاوەر، هاوبازوو.

**معاضدت**- مص.م.ع(موئازەدەت- mu'azedet): هاوکاری کردنی یەکتر، بازوو خستنە بازووی یەکتر، دەست لە دەستکردن.

**معاطات**- مص.م.ع(موئاتات- mu'atat): شتێک دەست بە دەست بدرێتە یەکتر، خزمەتکردن، عەتاکردن.

**معاف**- ا.مف.ع(موئاف- mu'af): بەخشراو، عەفوکراو.

**معاقب**- ا.فا.ع(موئاغیب- mu'axib): سزادەر.

**معاقب**- ا.مف.ع(موئاغەب- mu'axeb): سزادراو، ئیقابدراو.

**معاقبه**- مص.م.ع(موئاغەبە- mu'axebe): سزادان، ئازارو ئەشکەنجەدان، یەک بە دووی یەکدا هاتن.

**معاقد**- ا.فا.ع(موئاغید- mu'axid): هاوپەیمان.

**معاقده**- مص.ل.ع(موئاغەدە- mu'axede): ئەهدو پەیمان بەستن، سۆزدان.

**معاقل**- ا.ع(مەئاغیل- mu'a¨xil): پەناگە، قەلا، کێوی بەرز.

**معالج**- ا.فا.ع(موئالیج- mu'aliec): چارەکەر، عیلاجکار.

**معالجه**- مص.ع(موئالەجە- mu'alece): دەرمان کردن، مالیجە کردن.

**معالف**- مص.ع(مەئالیف- me'alif): ئاخوڕی حەیوان و چارەوییان.

**معالم**- ا.ع(مەئالیم- me'alim): نیشانە، ئەو نیشانەو عەلامەتانەی کە لە ڕێگایاندا بۆ ڕێنوێنی دابنرێن.

**معالی**- ص.ع(مەئالی- me'alî): شەرەف و سەرفرازی.

**معامل**- ا.فا.ع(موئامیل- mu'amil): موعامەلەچی، سەوداگەر.

**معامله**- مص.ل.ع(موئامەلە- mu'amele): کڕین و فرۆشتن، مامەڵە و سەودا کردن.

**معان**- ا.ع(مەئان- me'an): جێ، مەنزڵ.

**معاند**- ا.فا.ع(موئانید- mu'anid): سەر سەخت، نەکڵۆک، عیناد، شەڕکەر، ڕق ئەستور.

**معاندت**- مص.ل.ع(موئانەدەت- mu'anedet): شەڕکردن، ڕقبەرقێ کردن، ڕکە کردن، مل لەبەر ملنانی یەکتر، هەڤرکی.

**معانقه**- مص.ل.ع (موئانەغە- muanexe): دەست لەملی یەکترکرن، یەکدی لەباوەش گرتن.

**معانی**- ا.ع(مەئانی- me'anî): لقێکە لە لقەکانی ڕەوانبێژی، واتاناسی.

**معاودت**- مص.ل.ع(موئاڤەدەت- mu'avedet): گەڕانەوە.

**معاوضه**- مص.م.ع(موئاڤەزە- mu'aveze): گۆڕینەوە، گۆڕینەوەی دوو شت لەگەڵ یەکدا.

**معاون**- ا.فا.ع(موئاڤین- mu'avin): یاریدەدەر.

**معاونت**- مص.م.ع(موئاڤەنەت- mu'avenet): یاریدەدانی یەکتر.

**معاهد**- ا.ع(مەئاهید- me'ahid): شوێنی گەڕانەوە، شوێنێ کە کۆمەڵە خەڵکێکی لێ کۆوەبێ، یانە، شوێنێ کە قەرارێکی تیا بدرێ، پەیمانگە.

**معاهده**- مص.ل.ع(موئاهەدە- mu'ahede): پەیمان بەستن، سوێند خواردن بۆ یەکتر، بەڵێن دان بە یەکتر، سۆزدان.

**معایب**- ا.ع(مەئایب- me'ayib): عەیبە، خراپە.

**معایش**- ا.ع(مەئایش- me'ayîş): مەعیشەت، ژیان، بژێوی.

**معاینه**- مص.م.ع(موئایەنە- mu'ayene): تەماشاکردن، دیتن، دیتن و پشکنینی نەخۆشی.

**معاییر**- ا.ع(مەئاییر- me'ayir): عەیار، پێوانە.

**معبد**- ا.ع(مەئبەد- me'bed): پەرستگە.

**معبد**- ا.مف.ع(موئەببەد- mu’ebed): هێژا، ڕێگەی هەموارو قیرتاو.

**معبر**- ا.ع(میئبەر- mi’ber): گوزەرگا، بوار، شوێنی پەڕینەوە.

**معبر**- ا.فا.ع(موئەببیر- mu’ebbir): کەسێک خەون لێک بداتەوە.

**معبود**- ا.مف.ع(مەئبوود- me’bûd): مەعبوود، پەرستراو.

**معتاد**- ص.ع(موئتاد- mu’tad): ئالودە، خوگر بە شتێکەوە، ڕاهاتگ لەسەر شتێک.

**معتبر**- ص.ع(موئتەبەر- mu’teber): عیبرەتگرتوو، بە ئیحتوبار، ئەمین و جێی متمانە.

**معتد**- ا.مف.ع(موئتەدد- mu’tedd): لە حەد دەرچوو، خەملێنراو.

**معتدل**- ص.ع(موئتەدیل- mu’tedil): ڕاست، میانەڕەو، بەرانبەر.

**معتدی**- ا.فا.ع(موئتەدی- mu’tedî): تەجاوزکار،

**معتذر**- ا.فا.ع(موئتەزیر- mu’tezir): غوزر خواز.

**معترض**- ا.فا.ع(موئتەریز- mu’teriz): بەرهەڵست، ناڕازی.

**معترضە**- ا.ع(موئتەریزە- mu’terize): ڕستەیەکە لە دەرێی ئەسڵی بابەت، کە بۆ ڕوونکردنەوە، دوعا یان توک و نەفرین لە ناوەڕاستی ڕستەدا دێ و دەخرێتە نێوان دوو داشەوە.

**معترف**- ا.فا.ع(موئتەریف- mu’terif): ئیعتراف کەر.

**معترک**- ا.ع(موئتەرەک- mu’terek): مەیدانی شەڕ، شەڕگە.

**معتز**- ا.مف.ع(موئتەزز- me’tezz): عەزیزو خۆشەویست.

**معتزل**- ا.فا.ع(موئتەزیل- mu’tezil): گۆشەگیر، دوورە پەرێز.

**معتزلە**- ا.ع(موئتەزیلە- mu’tezile): موعتەزیلە، گروپێکی موسڵمان بوو.

**معتصم**- ا.فا.ع(موئتەسیم- mu’tesim): پەنابەر، دەستەو دامێن بوونی کەسێک، خۆگرتن بە شتێکەوە بۆ ڕزگار بوون.

**معتضد**- ا.فا.ع(موئتەزید- mu’tezid): کۆمەککەر، دادخواز.

**معتق**- ا.مف.ع(موئتەغ- mu’tex): کۆیلەی ئازاد کراو.

**معتقد**- ا.فا.ع(موئتەغید- mu’texid): بە باوەڕ، باوەڕدار.

**معتقد**- ا.ع(موئتەغەد- mu’texed): باوەڕ، ئەوەی مرۆڤ باوەڕی پێی هەیە.

**معتکف**- ا.فا.ع(موئتەکیف- mu’tekif): خەڵوەتکێش، گۆشەنشین، کەسێک بۆ عیبادەت لە مزگەوتدا یان لە گۆشەیەکی دیدا وەمێنێ.

**معتل**- ص.ع(موئتەل- mu’tel): نەخۆش، وشەیەک کە پیتی بزوێنی تیا بێ، پیتی بزوێن دەکاتە: واو، ئەلف، یا.

**معتمد**- ا.فا.ع(موئتەمید- mu’temid): کەسێک متمانە بە یەکێک بکات و کارێکی پێ بسپێرێ، متمانەکەر.

**معتمد**- ا.مف.ع(موئتەمەد- mu’temed): متمانە پێکراو.

**معتنی**- ا.فا.ع(موئتەنی- mu’tenî): بایەخدەر.

**معتنی بە**- ص.مر.ع(موئتەنابیهی- mu’tenabihi): بایەخ پێ درباگ.

**معتوە**- ص.ع(مەئتووە- me’tûh): کەم ئەقڵ، سەرگەردان.

**معجب**- ا.فا.ع(موئجیب- mu’cib): خۆپەسن، خۆویست، خۆپەرست.

**معجر**- ا.ع(میئجەر- mi’cer): لەچک، سەرپۆش.

**معجز**- ا.فا.ع(موئجیز- mu’ciz): پەرجوکەر، داهێنەر.

**معجزه**- ا.ع(موئجیزه- mu’cize): موجیزه، پەرجو.

**معجل**-ا.فا.ع(موئەججیل- mu’eccil): پەلەکەر، لەز.

**معجل**- ا.مف.ع(موئەججەل- mu’eccel): پەلە لێکرا.

**معجم**- ا.مف.ع(موئجەم- mu’cem): پیتی خاڵدار، واژەنامە.

**معجم**- ص.ع(مەئجەم- me’cem): پیاوی هەژێ و دەگمەن.

**معجون**- ا.مف.ع(مەئجون- me’cûn): ماجوم، مەعجون، کۆمەڵە دەرمانێک تێکەڵ کرابێ و پێکەوە شێلرابێ و کرابێ بە ماجون، شێلراو.

**معد**- ا.فا.ع(موئیدد- mu’idd): ئامادەکەر.

**معد**- ا.مف.ع(موئەدد- mu’edd): ئامادەکراو.

**معدل**- ا.فا.ع(موئەددیل- mu’eddil): راستکەرەوە، هاوکێشکەرەوە.

**معدل**- ا.مف.ع(موئەددەل- mu’eddel): راستکراوە، تێکرا.

**معدلت**- مص.ل.ع(موئەدیلەت- mu’edilet): دادگەری، داد دان.

**معدم**- ص.ع(موئدیم- mu’dim): قەلەندەر، هەژار، بێنەوا، موحتاج.

**معدن**- ا.ع(مەئدین- me’din): کانگە.

**معدود**- ا.مف.ع(مەئدوود- me’dûd): ژمێردراو، کەم.

**معدول**- ا.مف.ع(مەئدوول- me’dûl): دەستکاری کراو.

**معدوم**- ا.مف.ع(مەئدووم- me’dûm): ئیعدام کریاگ، لەسێدارە دراو، لەقەنارە دراو.

**معده**- ا.ع(میئدە- mi’de): گەدە.

**معذار**- ا.ع(میئزار- mi’zar): هەنجەت و بیانوو پاکانە و عوزرخوایی.

**معذب**- ا.مف.ع(موئەززەب- mu’ezzeb): عەزاو دریاگ، ئەشکەنجە دراو.

**معذرت**- ا.مص.ع(مەئزیرەت- me’ziret): پۆزش، عوزرخوایی، تەوازۆ.

**معذور**- ا.مف.ع(مەئزور- me’zûr): عوزردار.

**معراج**- ا.مف.ع(میئراج- mi’rac): پاچینە، پەیژە، قاڵدرمە، نەردەوان،هەر شتێک پێی سەر بکەوی.

**معرب**- ص.ع(موئەرەب- muerreb): عەرەبێنراو.

**معربد**- ا.فا.ع(موئەربید- mu’erbid): بەدخو، شەڕانی، کەسێک بەدمەست بێ و هاوار بکات و خراپە بکات.

**معرت**- ا.ع(مەئەڕەت- me’erret): گوناح و بەدی، تاوان.

**معرج**- ا.ع(مەئرەج- me’rec): نەردەوان، قاڵدرمە، پەیژە، پاچینە.

**معرض**- ا.ع(موئریز- mu’riz): پیشانگا، نمایشگە.

**معرف**- ا.فا.ع(موئەڕیف- mu’erif): ناسێنەر.

**معرفت**- مص.م.ع(موئریفەت- me’rifet): ماریفەت، زانست و زانیاریان، ناسین و زانینی شتێک.

**معرق**- ا.فا.ع(موئەریغ- mu’erix): مایەی ئارەقە کردنەوە.

**معرق**- ص.ع(موئەرەغ-mu’erex): پیاوی داڵە گۆشت، شەرابی ئاوێتە بە ئاو.

**معرک**- ا.ع(مەئرەک- me’rek): مەیدانی شەڕ..

**معروض**- ا.مف.ع(مەئرووز- me’rûz): پیشاندراو، لەروو.

**معروف**- ا.مف.ع(مەئرووف- me’rûf): چاکی و کاری چاکە، ناودار، ناسراو.

**معری**- ا.ص.ع(مەئەڕا- mu’erra): رووت.

**منتصر**- ا.فا.ع(مونتەسیر- muntesir): سەرکەوتوو.

**منتصف**- ا.ع(مونتەسەف- muntesef): نیوە، نیوەی ڕێگە، ناوەڕاستی شتێک.

**منتظر**- ا.فا.ع(مونتەزیر- muntezir): چاوەڕوان.

**منتظم**- ا.فا.ع(مونتەزیم- muntezim): ڕاست و دروست و ڕێکخراو.

**منتعش**-ا.فا.ع(مونتەئیش- munte'iş): گورج و گۆڵ و چوست و چالاک و زیتەڵ.

**منتفع**- ا.فا.ع(مونتەفیء- muntefi'): سوودمەند، سوود وەرگر، قازانجبەر.

**منتفی**- ا.فا.ع(مونتەفی- muntefî): لەنێوبەر، دوورخەرەوە.

**منتقد**- ا.فا.ع(مونتەغید- muntexid): ڕەخنەگر، سەڕاف.

**منتقد**- ا.مف.ع(مونتەغەد- muntexed): ڕەخنەلێگراو، هەڵسەنگێنراو.

**منتقل**- ا(مونتەغیل- muntexil): کەسێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی بڕوات.

**منتقم**- ا.فا.ع(مونتەغیم- muntexim): تۆڵەئەستێن.

**منتکس**- ص.ع(مونتەکیس- muntekis): سەرنگون، ئاوەژوو، داگیراو، نزمکراو.

**منتهز**- ا.فا.ع(مونتەهیز- muntehiz): هەلپەرست.

**منتهک**- ا.فا.ع(مونتەهیک- muntehik): ئەتک کەر.

**منتهی**- ا.فا.ع(مونتەهی- muntehî): بەکۆتایی گەییوو، تەواو.

**منتهی**- ا.مف.ع(مونتەها- munteha): کۆتایی.

**منثور**- ا.مف.ع(مەنسوور- mensûr): پەخشان، پەرت و بڵاو.

**منج**- ا(مونج- munc): مەگەس، زەردەواڵە، مێشەنگ.

**منج**- ا(مونج- munc): تۆو دەنکی هەر گیایەک.

**منجح**- ا.فا.ع(مونجیه- muncih): سەرکەوتوو، بە ئاوات گەییشتوو.

**منجر**- ا.مف.ع(مونجەر- muncer): ڕاکێشراو.

**منجز**- ا.مف.ع(مونجەز- muncez): تەواوکراو، ئەنجام دراو، دەستکەوت.

**منجک**- ا(مەنجەک- mencek): جۆرێکە لە سیحربازی.

**منجل**- ا.ع(مینجەل- mincel): داس.

**منجلاب**- ا(مەنجەلاب- mencelab): چڵکاو.

**منجلی**- ص.ع(مونجەلی- muncelî): ڕوون و ئاشکرا، دیارو جیلوەدار.

**منجم**- ا.ع(مەنجەم- mencem): کان، ڕێگەی ئاشکرا.

**منجم**- ا.فا.ع(مونەججیم- munccim): ئەستێرەناس.

**منجمد**- ص.ع(مونجەمید- muncemid): بەستەڵەک، مەییوو.

**منجنیق**- ا.ع(مەنجەنیغ- mencenix): مەنجەنیق، ئامێرێک بووە لە زەمانی کۆنا لە شەڕا بەکار هاتووەو بەردی پێ هاوێژراوەتە دژمن.

**منجوق**- ا(مەنجووغ- mencûx): هەیڤۆکی سەری ئاڵا.

**منجی**- ا.ع(مەنجا- menca): دەربازگە، شوێنی نەجات، جێی ڕەهایی.

**منجی**- ا.فا.ع(مونجی- muncî): نەجاتدەر.

**منحدر**- ا.فا.ع(مونهەدیر- munhedir): کەسێک لە سەرەوە نشێو بێتەوە.

**منحرف**- ا.فا.ع(مونهەریف- munherif): چەماوە، خواربوو، کەچڕەو، لەڕێ لادەر.

**منحصر**- ص.ع(مونهەسیر- munhesir): سنووردارو دەورگیراو.

**منحط**- ص.ع(مــــونهــــەتت- munhett): دابەزیوو، روخاو،

**منحل**- ص.ع (مونهەلل- munhell): کراوە، لابراو، لەنێوچوو.

**منحنی**- ص.ع(مــــونهـــەنی- munhenî): چەماوە، خوار.

**منحـوت**- ا.مف.ع(مــەنهــووت- menhût): تاشراو.

**منحوس**- ص.ع(مەنهووس- menhûs): شوم، نەحس، بێ بەخت.

**منحـــول**- ا.مف.ع(مــەنحــوول- menhûl): شـیـعرێک هی خەڵک بێ و کەسێک بیداتە پاڵ خۆی، دزی ئەدەبی.

**منخر**- ا.ع(مینخەر- minxer): کەپوو، کونی لووت، دفناک.

**منخـرم**- ص.ع(مـونخـەریم- munxerim): بڕیاگ، لووت براو.

**منخسف**- ص.ع(مونخەسیف- munxesif): گیراوو تاریک، پۆشراوو دیار نەبوو.

**منخـفض**- ص.ع(مـونخەفـیـز- munxefiz): نزم، کەوتنەنزمی.

**مند**- (مــــەند- mend): پاشگرەو مـــانای خاوەنداریتی دەگەیەنێ وەک: خردمند.

**منداب**- ا(مــــــەنداب- mendab): جـــۆرە رووەکێکە.

**منـدرج**- ص.ع(مــــونـدەریج- munderic): تۆمارکراو، شاراوە، شتێک خرابێتە ریزو خانەوە.

**مندرس**- ص.ع(مـــوندەریس- munderis): کۆن و دڕاو.

**مندف**- ا.ع(مــیندەف- mindef): کـەوانی هەلاجی.

**مندک**- ص(مـــەندەک- mendek): کـــەم، بێ بازار.

**مندل**- ا(مـەندەل- mendel): بازنەیەکـە وێرد خـوانان لە دەوری خـۆیانی دەکـێـشن و لەناو ئەو بازنەیەدا دادەنیشن و وێرد یان ئەفسون دەخوێنن.

**مندل**- ا.ع(مـەندەل- mendel): پێڵاو، داری عود.

**مندل**- ا.ع(میندەل- mindel): دەستەسڕ.

**مندل**- ا.فر(میندیل-mindil): یاسایەکە کە مـــیندل-ی رووەکناسی نەمـــســـاوی دەربارەی گــواســتنەوەی هەندێ ســیــفـەت لەناو گــیــاو گیانلەبەراندا دایهێناوە.

**مندمج**- ا.فـا.ع(مـوندەمـیچ- mundemiç): تێکەڵ بوون، چوونە ناو یەک، سازان.

**مندوب**- ا.مف.ع(مــــەندووب- mendûb): نوێنەر، هەڵبژێردراو.

**مندور**- ص(مەندوور- mendûr): بێ بەخت، غەمگین، بێتاقەت، بەلەنگاز، پیسکە.

**منده**- ا(مـــەندە- mende): گـــۆزە، گـــۆزەی شکاو.

**منديل**- ا.ع(مـــەندیل- mendîl): شـــاشـک، دەستەسڕ.

**منذر**- ا.فا.ع(مونزیر- munzir): ترسێنەر.

**منزجـر**-ص .ع(مـــونزەجـیـــر- munzecir): وەدەرنراو، ترسێنراو.

**منزعج**- ص.،ع(مـونزەئیج- munze'ic): بێ ئۆقرە، پەرێشان، وەدەرنراو.

**منزل**- ا.ع(مـــەنزیل- menzil): جـــێی لادان، ماڵ، کاروانسەرا، قۆناغ، مەنزڵ.

**منزل**- ا.مف(مونزەل- munzel): دابەزیو.

**منزلت**- ا.ع(مـــەنزیلەت- menzilet): پلەو پایە.

**مـنـزوی**- ا.ع(مـــــــونـزەڤـی- munzevî): گۆشەگیر، دوورە پەریز.

**منزه**- ص.ع(مــونەززەه- munezzeh): پاک و بێ غـــەل و غـــەش، داوێن پاک، دوور لە هەر بەدی و خراپییەک.

**منسحب**- ا.فا.ع(مونسەهیب- munsehib): پاشەکشەکەر.

**منسد**- ص.ع(مونسەد- munsedd): داخراو.

**منسرح**- ا.فا.ع(مونسەریە- munserih): ئەسپی خۆشبەز.

**منسک**- ا.ع(مەنسیک- mensik): شوێنی قوربانی کردن، جێی عیبادەت، رێ و رەسمی عیبادەت.

**منسلک**- ا.فا.ع(مونسەلیک- munselik): کەسێک چووبێتە ریزو ناو رێچکەو رێبازێکەوە.

**منسم**- ا.ع(مەنسیم- mensim): پێی وشترو فیل و وشتر مل، نیشانەو رێچکەو رێباز.

**منسوب**- ا.مف.ع(مەنسووب- mensûb): نەسەبدار.

**منسوج**- ا.مف.ع(مەنسووج- mensûc): تەنراو، چنراو، جۆرە قوماشێکی ئاوریشمە.

**منسوخ**- ا.مف.ع(مەنسوخ- mensûx): نەسخکراو، رەتکراوە، لەبەین براو.

**منش**- ا(مەنیش-meniş ): سرووشت، تەبیعەت.

**منشا**- ا.ع(مەنشەء- menşe’): جێی نەشونما، شوێنی پەیدابوون.

**منشات**- ا.ع(مونشەئات- munşe’at): نووسراوان، نامە.

**منشار**- ا.ع(مینشار- minşar): هەرە، ئەرە، مشار.

**منشرح**- ص.ع(مونەشەریە- munşerih): روخۆش و کراوە، بە کەیف و ئاشکراو دیار.

**منشعب**- ص.ع(مونشەئیب-munşe’ib): جیابوونەوە، جیابووەوە، دووبەرەکی، پارچە پارچەبوون، لق لق بوون.

**منشفه**-ا.ع(مینشەفە- mişefe): خاولی.

**منشق**-ص .ع(مونشەغغ- munşexx): شەق بردوو، درزبردوو، تەرەکیو.

**منشور**- ا.ع(مەنشوور- menşûr): بڵاوکراوە، بەیان، نامەی کراوە، فەرمان، فەرمانی پاشایی..

**منشویک**-ص (مینشیڤیک-minşivîk): مەنشەویک، لایەنێکی حیزبی سوسیال دیموکراتی روسیا بوو.

**منشی**- ا.فا.ع(مونشی- munşî): دەست پێکەر، نووسەر، کەسێک بتوانێ باش نامە بنووسێت و بابەت برازێنێتەوە.

**منصب**- ا.ع(مەنسیب-mensib): پلەو پایە، کاری فەرمی.

**متصرف**- ا.فا.ع(موتسەریف- munserrif): گەڕانەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک، کەسێک دەستبەرداری مەبەستی خۆی بێ و چاوپۆشی بکات.

**منصف**- ا.فا.ع(مونسیف- munsif): بەویژدان، بە ئینساف، هەقانی، هەقپەروەر.

**منصوب**- ا.مف.ع(مەنسوب- mensûb): بەرپاکراو، کەسێک لەکارو پایەیەک دابنرێ.

**منصور**- ا.مف.ع(مەنسور- mensûr): پشتیوانی کراو.

**منصوص**- ا.مف.ع(مەنسوس- mensûs): قسەیەک وەکو خۆی بگوترێتەوە، دەق، دەقاو دەق.

**منصه**- ا.ع(مینەسسە- minesse): کورسییەک کە بووکی لەسەر دابنرێ.

**منضج**- ا.فا.ع(مونزیج- munzic): پێگەیەنەر.

**منضد**- ا.مف.ع(مونەززەد- munezzed): لەسەر یەک هەڵچنراو، نوێن و شت کە لەسەر یەک هەڵچنرێ و رێک خرابێ.

**منضم**- ص.ع(مونزەم- munzem): پەیوەستە.

**منطبع**- ص.ع.مونتەبیء- ’muntebi: چاپکراو.

**منطبق**- ص.ع(مونتەبیغ- muntebix): جووت، لەسەریەک دانراو، چون یەک و بەرانبەر.

**منطفی**- ص.ع(مونتەفی- muntefî): کوژاوە.

**منطق**- مص.ل.ع(مەنتیغ-mentix ): قسەکردن، مەنتیق، لۆژیک.

**منطق**- ا.ع(مینتەغ- mintex): کەمەربەند، پشتێن، پشتێنە.

**منطمس**- ا.فا.ع(مونتەمیس- muntemis): ئەستێرە یان چاوێک کە روناکی نەمابێ، مەحوکەرەوە، نقووم بوون و ون بوون.

**منطوق**- ا.مف.ع(مەنتووغ- mentûx): گوتراو، قسەی گوتراو، روالّەتی قسە.

**منطوی**- ا.فا.ع(مونتەڤی- muntevî): گردەوەبوو.

**منطیق**- ص.ع(مینتیغ- mintîx): ناتیق و قسەڕەوان.

**منظر**- ا.ع(مەنزەر- menzer): دیمەن، ئەوەی بکەوێتە بەرچاو، شوێنی روانین و تەماشاکردن.

**منظره**- ا.ع(مەنزەرە- menzere): دیمەن جێ تەماشاکردن، تەمەشاگە.

**منظم**- ص.ع(مونەززەم- munezzem): رێک و پێک، بەتەرتیب.

**منظور**- ا.مف.ع(مەنزور- menzûr): بینراو، لەبەرچاوگیراو.

**منظوم**- ا.مف.ع(مەنزووم- menzûm): هۆنراوە، شتێک هۆنرابێتەوە، شیعر.

**منع**- مص.م.ع(مەنیء- meni’): نەهێشتن، قەدەغەکردن، پێش گرتن، قەدەغە کردنی کەسێک لە کارێک یان شتێک.

**منعطف**- ا.فا.ع(مونەئەتیف- mun’etif): چەماوە، پێچ، وەرچەرخان.

**منعطف**- ا.ع(مونئەتەف- mun’etef): پێچی روبار، رێگەیەک پێچ بکاتەوەو رووەو شوێنێکی دی وەرچەرخێ، وەرچەرخان.

**منعقد**- ا.فا.ع(مونئەغید- mun’exid): مەیبوو، پەیمانێ کە ببەسترێ.

**منعکس**- ا.فا.ع(مونئەکیس- munekis): عەکسکەرەو، رەنگدەرەوە، پێچەوانە، ئاوەژوو.

**منعم**- ا.فا.ع(مونئیم- mun’im): نیعمەتدەر.

**منعم**- ا.مف.ع(مونئەم- mun’em): نیعمەت پێ دریاگ.

**منعم**- ص.ع(مونەئئەم- mune’em): دەوڵەمەند، زەنگین، دارا، بووە.

**منغر**- ا(مونغور- munxûr): پیاڵەی شەراب.

**منغص**- ا.مف.ع(مونەغغەس- munexxes): تاریک، ناخۆش، ناسازگار.

**منغمس**- ا.فا.ع(مونەغەمیس- munxemis): لە ئاوا نقوم بوو.

**منفاق**- ص.ع(مینفاغ- minfax): کەسی زۆر دەست بڵاو، دەستبڵاو.

**منفجر**- ا.فا.ع(مونفەجیر- munfecir): ئاوی هەڵقوڵیوی رەوان، تەقیو، برینێ چڵک و کێمی لێ بروات.

**منفذ**- ا.ع(مەنفەز- menfez): دەلاقە، کون، پەنجەرە، رێگە، شوێنی تێ پەرین.

**منفرج**- ا.فا.ع(مونفەریج- munferic): کراوە.

**منفرد**- ص.ع(مونفەرید- munferid): تەنیا.

**منفسخ**- ا.فا.ع(مونفەسیخ- munfesix): هەڵوەشاوە، لەغوکراو، لابراو، لەکارکەوتوو.

**منفصل**- ا.فا.ع(مونفەسیل- munfesil): پارچەپارچە بوو، جیابووەوە، دابڕاو.

**منفعت**- ا.ع(مەنفەئەت- menfe’et): مەنفەعەت، فایدە، سوود، قازانج.

**منفعل**- ا.فا.ع(مونفەئیل- munfe’il): شەرمەزار.

**منفق**- ا.فا.ع(مونفیغ- munfix): نەفەقەدەر، کەسێک پارە لە رای خوا بدات.

**منفک**- ص.ع(مونفەک- munfek): رزگاربوو، کراوە.

**منفور**- ا.مف.ع(مەنفوور- menfûr): ناپەسند، بێزراو، نەفرەتبار.

**منفی**- ا.ع(مەنفا- menfa): تاراوگە.

**منفی**- ص.ع(مەنفی- menfî): نەفیکراو، دوور خراوە، تاراو.

**منقاد**- ص.ع(مونغاد- munxad): گوێڕایەڵ، ئاراستەکراو.

**منقار**- ا.ع(مینغار-minxar): دەنووک.

**منقاش**- ا.ع(مینقاش- minxaş): ئامێری نیگارکێشی، مووکێش.

**منقبت**- ا.ع(مەنغەبەت- menxebet): هونەرو کاری چاک کە مایەی ستایش بێ، مایەی فەخرو شانازی، باریکە ڕێی نێوان دووماڵ.

**منقبض**- ص.ع(مونغەبیز- munxebiz): تێک ترنجان، قوپان.

**منقح**- ا.مف.ع(مونەغغەه- munexxeh): بژارکراو، پاک کراو.

**منقذ**- ا.فا.ع(مونغیز- munxiz): رزگارکەر، فریارەس.

**منقرض**- ا.فا.ع(مونغەریز- munxeriz): لەناوچوو، شتێک نەمابێ.

**منقسم**- ا.فا.ع(مونغەسیم- munxesim): دابەشبوو، دابەشکراو.

**منقش**- ا.مف.ع(مونەغغەش- munexxeş): نەخشێنراو.

**منقصت**- ا.مف.ع(مەنغەسەت- menxeset): کەم و کوڕی، نوقستانی.

**منقضی**- ا.فا.ع(مونغەزی- munxezî): کۆتایی هاتوو، لەناو چوو، تەواو بوو.

**منقط**- ص.ع(مونەغغەت- munexxet): خاڵدار، نوقتەدار.

**منقطع**- ا.فا.ع(مونغەتیء- munxeti'): پچڕاو،

**منقع**- ا.ع(مەنغەء-'menxe): دەریا، گۆلاو.

**منقل**- ا.ع(مەنغەل- menxel): ئاگردان، مەقلێ، پێڵاوی کۆنە، ڕێگەی کورت.

**منقلب**- ا.فا.ع(مونغەلیب- munxelib): گۆڕاو، هەڵگەڕاوە، ئاڵۆزکاو، پەریشان، ناڕەحەت.

**منقلع**- ا.فا.ع(مونغەلیء- munxeli'): لەبنەوە هەڵکەندراو.

**منقور**- ا.مف.ع(مەنغوور- menxûr): کونکراو، نەخشێنراو.

**منقوش**- ا.مف.ع(مەنغووش- menxûş): نەخشێنراو.

**منقوط**- ا.مف.ع(مەنغووت- menxût): خاڵ لەسەر دانراو.

**منقول**- ا.مف.ع(مەنغوول- menxûl): نەقڵ کراو، شتێک بتوانرێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی نەقڵ بکرێ، گێڕدراوە، شتێک بگێڕدرێتەوە.

**منقی**- ا.مف.ع(مونەغغا- munexxa): پاککراو، بژارکراو.

**منکب**- ا.ع(مەنکیب- menkib): شان.

**منکر**- ا.فا.ع(مونکیر- munkir): نکوڵی کەر.

**منکر**- ص.ع(مونکەر- munker): کاری ناشیرین، کاری ناشایستەو ناپەسەند، کاری ناڕەوا، کاری نا شەرعی.

**منکسر**- ص.ع(مونکەسیر- munkesir): شکاو.

**منکشف**- ص.ع(مونکەشیف- munkeşif): کەشف، دیار، ڕووت، ئاشکرا.

**منکوب**- ا.مف.ع(مەنکووب- menkûb): نەگبەت، ڕەنج دیدە، دووچاری نەگبەتی و بەڵا.

**منکوحە**- ا.مف.ع(مەنکووهە menkûhe): ژنی مارەکراو.

**منکوس**- ا.مف.ع(مەنکوس- menkûs): سەرەو ژێر، سەرنگون، ئاوەژوو، ژێرو بان.

**منگ**- ص(مەنگ- meng): دزو ڕێگر، مەنگ، حۆل، گێژ، گەوج.

**منگ**- ا(مەنگ- meng): قومار، یاساو ڕێسا، لاف و گەزاف.

**منگل**- ص(مەنگول- mengul): دز، ڕێگر، چەتە.

**منگل**- ا(مەنگول- mengul): مەنهۆڵ، کونج، ڕەهەند.

**منگله**- ا(مـەنگولە- mengûle): گـێـزو گوڵێنگ.

**منگنه**- ا(مـەنگەنە- mengene): گـیـرە، مەنگەنە.

**منگوله**- ا(مـەنگوولە- mengûle): گـێـزو گوڵێنگ.

**منگیا**- ا(مـەنگیـیا- mengiya): قـومـار، قومارخانە.

**منگیاگر**- ا.فا(مەنگییاگەر-mengiyager): قوباریاز، خودانی قومارخانە.

**منگیدن**- مص.ل(مەنگیدەن- mengîden): منجـەمنج، مـینگە مـینگ، قـسـەکـردن لەبن لێوانەوە.

**منن**- ا.ع(مینەن- minen): منەت.

**مننژ**- ا.فـر(مـیـنینژ- mininj): پەردەی مێشک.

**مننژیت**- ا.،فـر(مـیـنینژیت- mininjit): ئیلتـیـهابی پەردەی مـێـشک، هەوکردنی پەردەێن مێشک.

**منوال**- ا.ع(مـینڤـال- minval): شـێـواز، شێوە، دەزگای چنینی جۆلایی.

**منوب**- ا.مف.ع(مەنووب- menûb): جێگر، بریکار، کـەسێـک لە کـارێکدا جێگری کـەسی دی بێ.

**منوچهر**- ا.ص(مـەنووچیـهـر- menûçihr): مەنوچەر، رووخۆش، ناوە بۆ پیاوان.

**منور**- ص.ع(مـونەڤـڤـەر- munevver): نوورانی، درەوشاوە، رووناکی.

**منوط**- ا.مـف.ع(مـەنـووت- menût): وابەستە.

**منوگـام**- ص.فـر(مـونوگـام- munûgam): یەک ژنە، خودانی یەک ژن.

**منوگامی**- ا.فر(مونووگامی- munûgamî): سیستەمی یەک ژنە.

**منوم**- ا.فـا.ع(مـەنەڤـڤـیم- munevvim): کەسێک بە شێوەی مـوگناتیسی خەو لە یەکێک بخـات، خـەواندنی مـوگناتیـسی، خـەوێنەر، خەوهێن.

**منون**- ا.ع(مـەنوون- menûn): ئەجـەل، مەرگ، رۆژگار.

**منون**- ص.ع(مـونەڤـڤـەن- munevven): تەنوین دار، وشەیەک تەنوین بکرێ.

**منوی**- ا.مف.ع(مەنڤی- menvî): بەنیاز.

**منهاج**- ا.ع(مینهاج- minhac): رێی راست، رێی روون و ئاشکرا.

**منتهک**- ص.ع(مـونتەهیک- muntehik): بێ ئابرو، بێ پەروا، ئەتک کـەر، هەتک کـەر، درێنراو، کون کراو، پەردەدڕ.

**منهج**- ا.ع(مەنهەج- menhec): رێی راست، رێی ئاشکرا، شارێ، میتۆد.

**منهدم**- ص.ع(مـونهـەدیم- munhedim): وێران و خەرابە، داروخاو، روخاو.

**منهر**- ا.ع(مـەنهـر- menher): جـۆگـەلە، شوێنی ئاودڕ.

**منهزم**- ص.ع(مـونهـەزیم- munhezim): هەلاتوو، شکست خواردوو، لەشکری بەزیوو.

**منهضم**- ص.ع(مـونهـەزیم- munhezim): خواردنی هەرس کراو.

**منهل**- ا.ع(مـەنهـەل- menhel): سـەرچاوە، کانییەک کە خەڵکی ئاوی لێ بخۆنەوە.

**منهمک**- ا.فا.ع(مونهەمیک-munhemik): سەرقاڵ و مژوڵی کارێک.

**منهوب**- ا.مف.ع(مـەنهـووب- menhûb): تالان کراو.

**منهوم**- ص.ع(مەنهووم- menhûm): نەوسن و تامەزرۆ و چلێس.

**منهی**- ا.فـا.ع(مـونهی- munhî): هەواڵدەر، پەیامنێر.

**منهی**- ا.مف.ع(مـەنهی- menhî): کـاری خراپ و نا شەرعی.

**منی**- ا.مص(مـەنی- menî): من من، خـۆ هەڵکێش، غورور، خۆپەرستی.

**منی**- ا.ع(مەنی- menî): تۆماو، ئاوی پیاو.

**منیت**- ا.ع(موونیەت- munyet): ئارەزوو، تکا.

**منیت**- ا.ع(مەنییەت- menîyet): مەرگ، ئەجەل.

**منیر**- ا.فا.ع(مونیر- munîr): درەخشان، روناکی بەخش.

**منیزی**- ا.فر(مەنیزی- menîzî): جۆرە دەرمانێکە.

**منیزیوم**- ا.فر(مەنیزیوم- menîzyûm): مەگنیزیوم.

**منیع**- ص.ع(مەنیع- menî’): سەخت و عاسی، قایم و بەرز، شوێنی بەرزو قایم و تووش کە بە ئاسانی نەیگەیتێ.

**منیف**- ص.ع(مونیف- munîf): بەرز، گەورە، هەڵکراو.

**مو**- ا(مەو- mew): مێو، درەختی مێو.

**مو**-ا(موو- mû): موو، تووکی بەدەن، مووی سمێڵ.

**موائد**- ا.ع(مەڤائید- mevaid): سفرەو خوانان.

**موات**- ص.ع(مەڤات- mevat): مردوو، بێ گیان، زەوی وشک و بەیار.

**مواثقه**- مص.ع(موڤاسەغە- muvasexe): پەیمان بەستن.

**مواثیق**- ا.ع(مەڤاسیق- mevasîx): پەیمانان.

**مواج**- ص.ع(مەڤڤاج- mevvac): پڕ شەپۆل، شەپۆلدار.

**مواجب**- ا.ع(مەڤاجیب- mevacib ): واجب و ئەرکان، مووچەی مانگانە یان ساڵانە، مەرگ.

**مواجه**- ص.ع(موڤاجیه- muvacih): رووبەڕوو.

**مواجهه**- مص.ل.ع(موڤاجەهە-muvacehe): رووبەڕوو بوونەوە، رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کەسێکدا.

**مواخات**- مص.ل.ع(موڤاخات- muvaxat): برایەتی و دۆستایەتی، بوون بە دۆست و برا.

**مواد**- ا.ع(مەڤادد- mevvad): کەرەستەی خاو.

**موادعه**- مص.ل.ع(موڤادەئە- muvade’e): ئاشتبوونەوە، ئاشتی کردن، دەستبەرداربوونی دژمنایەتی.

**مواربه**- مص.ل.ع(موڤارەبە- muvarebe): فێڵ و فێڵبازی، دەستبڕینی یەکتر.

**موارد**- ا.ع(مەڤارید- mevarid): شوێنی دابەزین، جێی لادان، جێی ئاو خواردنەوە.

**مواردە**- ا.ع(موڤاردە- muvarede): پێکەوە لادان لە جێیەکدا.

**مواریث**- ا.ع(مەڤاریس- mevaris): میرات.

**موازات**- مص.ل.ع(موڤازات- muvazat): رووبەڕوو بوون، بەرانبەر بوون، هاوتەریب.

**موازنه**- مص.م.ع(موڤازەنە- muvazene): بەراوردکردن، هەڵسەنگاندنی دوو شت.

**موازی**- ص.ع(موڤازی- muvazî): رووبەڕوو، بەرانبەر، هاوتەریب.

**موازین**- ا.ع(مەڤازین- mevazîn): تەرازوو، شایەن، ئەندازە.

**مواسات**- مص.م.ع(موڤاسات- muvasat): کۆمەک کردنی یەک بە ماڵ.

**مواسم**- ا.ع(مەڤاسیم- mevasim): وەرز.

**مواشی**- ا.ع(مەڤاشی- mevaşî): حەیوانات، چارەوێ، مەڕو ماڵات.

**مواشیر**- ا.ع(مەڤاشیر- mevaşîr): شوشە.

**مواصلت**- مص.ل.ع(موڤاسەلەت- muvaselet): پەیوەندی کردن بە یەکەوە، بەردەوام کردنی پەیوەندی.

**مواضع**- ا.ع(مەڤازێ- mevazi’): شوێنان، جێگایان.

**مواضعه**- مص.ل.ع(موڤازەئەت- muvaze’et): پێکەوە رێکەوتن لەسەر کارێک.

**مواطات**- مص.ل.ع(موڤاتات- muvatat): پێکەوە ڕێکەوتن لەسەر کارێک.

**مواطن**- ا.ع(مەڤاتین- mevatin): وەتەنان، وڵاتان.

**مواظب**- ا.فا.ع(موڤازیب- muvazib): چاودێر، نیگابان، پاسەوان.

**مواظبت**- مص.م.ع(موڤازەبەت-muvazabet): چاودێری کردن، ئاگاداری کردن.

**مواعد**- ا.ع(مەڤائید- meva'id): شوێن یان کاتی وەعدو پەیمان، بەڵێنگە، سوزگە.

**مواعده**- مص.م.ع(موڤائەدە- muva'ede): بەڵێندان بە یەکدی، وەعددان بەیەکتر.

**مواعظ**- ا.ع(مەڤائیز- mevaiz): وەعزو پەندان.

**مواعید**- ا.ع(مەڤائید- meva'id): وەعدەگا.

**موافق**- ص.ع(موڤافیغ- muvafix): رازی.

**موافقت**- مص.ل.ع(موڤافەغەت- muvafexet): رازی بوون، ڕێکەوتن، گونجان، سازان.

**مواقد**- ا.ع(مەڤاغید- mevaxid): کوانوو، ئاگردان، وەجاغ.

**مواقع**- ا.ع(مەڤاغیٔ- mevaxi'): شوێنان.

**مواقعه**- مص.ل.ع(موڤاغەئە- muvaxee): شەڕکردن لەگەڵ یەکێکدا، گان کردن.

**مواقف**- ا.ع(مەڤاغیف- mevaxif): هەڵوێستان، وێستگان.

**مواقفه**- مص.ع(موڤاغەفە- muvaxefe): وەستان و خۆڕاگرتن لە شەڕدا.

**مواقیت**- ا.ع(مەڤاغیت- mevaxît): وەخت، کات، کاتی کار.

**مواکب**- ا.ع(مەڤاکیب- mevakib): کاروان، گرووپێک سوارە یان پیادە کە بەگەڵ کاروانی پاشا بکەون.

**موالات**- مص.ل.ع(موڤالات- muvalat): دۆستایەتی و پەیوەندی کردن لەگەڵ یەکدا، پەیڕەوی کردن.

**موالد**- ا.ع(مەڤالید- mevalid): شوێنی لە دایک بوون، زێد.

**موالی**- ا.ع(مەڤالی- mevalî): سەروەران، خواوەندان، بەندەو غولامان.

**موالیا**- ا.ع(مەڤالییا- mevalîya): جۆرە شیعرێک بووە کە کۆیلە و غولامان بۆ خاوەنانی خۆیان گوتووەو لە کۆتایی هەر شیعرێک یان بەندێکدا وشەی (یا مەوالیا)یان دووبارە دەکردەوە وەکو ئاماژەیەک بۆ خاوەنەکانیان.

**موالید**- ا.ع(مەڤالید- mevalîd): فەرزەنان.

**موانع**- ص.ع(مەڤانیٔ- mevani'): کۆسپ و تەگەران، لەمپەر.

**مواهب**- ا.ع(مەڤاهیب- mevahib): بەخششان، ئەوەی بە کەسێک ببەخشرێ لە ماڵی دنیا جگە لە پارەو پول.

**موبد**- ا(مەوبەد- mewbed): سەرۆکی موغان، حەکیم و زاناو پێشەوای روحانی زەردەشتی.

**موبدموبدان**- ا.مر(مەوبەدی مەوبەدان- mewbedi mewbedan): سەرۆکی گشتی مەوبەدان.

**موبق**- ا.ع(مەوبیغ- mewbix): وەعدەگە، زیندان، هەر شتێک ببێ بە کۆسپ و لەمپەر لەنێوان دوو شتدا.

**مویز**- ا(موبیز- mubîz): هێڵەک، والابێژ.

**موت**- ا.ع(مەوت- mewt):" مەرگ.

**موتاب**- ا.ص(موتاب- mutab): موتابچی.

**موتاسیون**- ا.فر(موتاسیون- mutasyûn): گۆڕانی کوتوپڕ، وەکو گۆڕانی ئاو لە پلەیەکی گەرمی تایبەتەوە بۆ هەڵم یان سەهوڵ.

**موتت**- ا.فر(موتیت- mutit): سردوی ئاینی.

**موتور**- ا.فر(موتوور- mutûr): ماتۆڕ، دینەمۆ.

**مـوتورسـیكلت**- ا.فـر(مـوتوسـیكلیت- mûtûsiklit): ماتۆرسكیل.

**موتی**- ا.ع(مەوتا- mewta): مردوان.

**موثق**- ص.ع(مووڤەسسەغ- mûvessex): متمانەپێكراو، جێی باوەڕو متمانە.

**موثوق**- ا.مف.ع(مەوسووغ- mewsûx): باوەڕپێكراو.

**موج**- ا.ع(مەوج- mewc): شەپۆل، پێل.

**موجان**- ص(موجان- mewcan): چاوی جوانی پڕ ناز، چاوی خەواڵو، نێرگزی نیوە پشكوتوو.

**موجان**- مص.ع(مەڤەجان- mevecan): خرۆشان و شەپۆلدانی دەریا.

**موجب**- ا.فا.ع(موجیب- mucib): باعیس، هۆ.

**موجبە**- ا.ع(موجیبە- mucibe): كاری گەورەی چاك یان خراپ كە ببێتە هۆی چوونە بەهەشت یان دۆزەخ.

**موجد**- ا.فا.ع(موجید- mûcid): ئیجادكار، خولقێنەر.

**موجر**- ا.فا.ع(موجیر- mucir): كەسێك مولێك بەكرێ بدات، كرێدار.

**موجز**- ص.ع(موجەز- mucez): خوڵاسە، كورتە، پوختە.

**موجع**- ص.ع(موجیئ- mûci’): بەئازار، ئازاردەر.

**موجل**- ا.ع(مەوجیل- mewcil): چاڵێ كە ئاوی تیا بوەستێ، جێی ترس.

**موجود**- ا.مف.ع(مەوجود- mewcûd): مەوجود، هەبوو، .

**موجە**- ا.ع(مەوجە- mewce): شەپۆلێك، یەك شەپۆڵ.

**موجە**- ص.ع(موڤەججەه- mûvecceh): خودان پلەو پایە، چاك و پەسند، قسەیەك یان عوزرێ كە بە بەڵگە بسەلمێنرێ و پەسند بێ.

**موچلكا**- ا(موچەلكا- muçelka): سەنەد، قەواڵە.

**موچول**- ص.عا(مووچوول- muçûl): بچووك و جوان، ناوە بۆ ژنان.

**موچینە**-ا.مر(موچینە- muçîne): موكێش.

**موحد**- ص.ع(موڤەههید- muvehhid): خواناس، یەكتاپەرست.

**موحش**- ص.ع(موهیش- mûhiş): ترسناك، مایەی خەم، خەماوەر.

**موخورە**-ا.مر(مووخوورە-mûxûre):موخۆركە.

**مودت**- مص.ل.ع(مەڤەددەت- meveddet): ئەشق و مەحەبەت، دۆستایەتی كردن.

**موذی**- ا.فا.ع(موزی- mûzî): ئەزیەتدەر.

**مور**- ا(مور- mûr): مێرولە.

**مورب**- ص(موڤەرەب- mûvereb): خوار، چەماوە، بەپێچ، پێچاو پێچ، هەر شتێ سەری خوارو كەچ بێ.

**مورث**-ا.ع(مووریس- mûris): باعیس، هۆ.

**مورث**- ا.فا.ع(موڤەڕیس- mûverris): ئەوی میراتی لە پاش جێ بمێنێ.

**مورچال**- ا(موورچال- mûrçal): مێروستان، لانەو كونی مێرولە، خەنەكێك كە لە ژێر زەمینەوە بەرەو قەڵاو سەنگەری دژمن لێ بدرێ.

**مورچە**- ا(موورچە- mûrçe): مێروولە.

**مورچەخوار**- ا.مر(موورچەخار- mûrçexar): گیانلەبەرێكە مێرولە دەخوات، ئەم گیانلەبەرە زیاتر لە ئەمریكای باشووردا هەیە.

**مورچەگیر**- ا.مر(موورچەگیر- mûrçegîr): مێروویەكە دەفڕێ و مێروولە دەخوات.

**مورخ**- ا.فا.ع(مووڤەریخ- mûverix): مێژوونووس، دیرۆكنووس.

**مورخ**- ا.مف.ع(مووڤەرەخ- mûverex): ئەوەی رۆژو بەرواری مێژووی دیاریكرابێ.

**مورد**- ا.ع(مەوریە- mewrid): شوێنی لادان، رێ ئاو، بوار.

**مورد**- اا(موورد- mûrd): مۆرد، درەختێکە.

**مورش**- اا(مووریش- mûriş): دەستبەند یان گەردنبەنی زەنگیانە.

**مورق**- ا.فا.ع(موڤەریخ- mûverix): فرۆشیارو دروستکاری کاغەز، نووسەر.

**موروث**- ا.مف.ع(مەوروس- mewrûs): میراتی.

**موری**- اا(مووری- mûrî): لوولەی چیمەنتۆ بۆ زێراب.

**موریانه**- اا(مورییانە- mûriyane): مۆریانە.

**موز**- ا.ع(مەوز- mewz): دەرختی مۆز.

**موزائیک**- ا.فر(مووزائیک- mûzaik): کاشی.

**موزج**- ا.ع(مەوزەج- mewzec): چەکمە.

**موزع**- ا.فا.ع(موڤەززیٔ- mûvezzi'): دابەشکەر.

**موزون**- ا.مف.ع(مەوزوون- mewzûn): کێشراو، هەڵسەنگێنراو، کێشدار، هاوسەنگ.

**موزه**- اا(موزە- mûze): چەکمە.

**موزه**- ا.فر(مووزە- mûze): موزەخانە، عەنتیکەخانە.

**موزیسین**- ا.فر(مووزیسین- mûzîsîn): مۆسیقازان، مۆسیقاژەن.

**موزیک**- ا.فر(موزیک- mûzîk): مۆسیقا، هونەری مۆسیقا.

**موزیکال**- ص.فر(موزیکال- mûzîkal): مۆسیقایی.

**موژ**- اا(مووژ- mûj): گۆلاو.

**موژان**- ص(مووژان- mûjan): چاوی جوان و پڕ ناز، چاوی خومارو خەواڵو، نێرگیزی نیوە پشکوتو.

**موژیک**- اا(مووژیک- mûjîk): خەڵکی دیهاتی رووسی.

**موستره**-ا.مر(مووسوتورە-mûsuture): ئوستەرە، گوێزان، تیغی سەر تاشین و ردێن تاشین.

**موسخ**- ص.ع(موسەخ- mûsex): کەمەربەندی مەسیحیان.

**موسخ**- ص.ع(موڤەسسەخ- mûvessex): پیس، چڵکن.

**موسر**- ص.ع(مووسیر- mûsir): دەوڵەمەند، زەنگین، دەسترۆ، دارا.

**موسع**- ص.ع(موڤەسسەء- mûvesse'): بەرین، پان، بڵاو.

**موسم**- ا.ع(مەوسیم- mewsim): وەرز، وەخت، کات.

**موسوم**- ا.مف.ع(مەوسووم- mewsûm): نیشانەکراو، داغمەکراو، ناونراو.

**موسه**- اا(مووسە- mûse): زەردەزیرە، زەردەواڵە.

**موسی**- ا.ع(مووسا- mûsa): موس، گوێزانی سەرتاشی.

**موسیچه**- اا(مووسیچە- mûsîçe): قومری.

**موسر**- اا(مووسیر- mûsir): سیری کێوی.

**موسیقار**- اا(موسیغار- mûsîxar): مۆسیقا ژەن، جۆرە سازێکە، باڵندەیەکی ئەفسانەییە کە گوایە دەنوکی کون کونەو لەو کونانەوە ئاوازی جۆراو جۆر دەردێنێ.

**موسیقی**- اا(مووسیقی- mûsîxî): مۆسیقا.

**موسیلاژ**- ا.فر(مووسیلاژ- mûsîlaj): شیلەو سەمغی گیا.

**موسیو**- ا.فر(مووسیوو- mûsiyû): گەورە، بەڕێز، مسیێو.

**موش**- اا(موش- mûş): مشک.

**موشح**- ا.مف.ع(موڤەششەه- mûveşşeh): حەمایەڵ.

**موش خرما**- ا.مر(مووش خورما- mûş xurma): مشکی خورما، خورما چەچان.

**موشک**- اا(موشەک- mûşek): مشکی بچوک، موشەک، رۆکێت، ساروخ.

**موشكاف**- ص.فا (موشیكاف- mûşikaf): وردبین.

**موش كور**- ا.مر(موشی كوور- mûşi kûr): مشکەکوێرە، جرجە کوێرە، رسک.

**موشور**- ا.ع(مەوشوور- mewşûr): شووشە،

**موصل**- ا.،ع(مووسیل- mûsil): شوێنی پێکەوە بەستن و گرێدان، شوێنی گرێدانی گوریس.

**موصل**- ا.مف.ع(موڤەسسەل- mûvessel): پێکەوە بەستراو.

**موصوف**- ا.مف.ع(مەوسووف- mewsûf): وەسفکراو، ستایش کراو، پەسند دراو.

**موصول**- ا.مف.ع(مەوسوول- mewsûl): پێکەوە بەسترپاگ.

**موصی**- ا.فا.ع(مووسی- mûsî): وەسێت کەر، راسپێر.

**موصی**- ا.مف.ع(مووسا- mûsa): وەسێت کراو، راسپێردراو.

**موضع**- ا.ع(مەوزیءَ- mewzi’): شوێن، شوێنی دانانی شتێک.

**موضوع**- ا.مف.ع(مەوزووء- mewzû’): دانراو، بابەت.

**موطن**-ا.ع(مەوتین- mewtin): وەتەن، زێد، نیشتمان.

**موظف**- ص.ع(موڤەززەف- muvezzef): وەزیفەدار، فەرمانبەر، کارمەند.

**موعد**- ا.ع(مەوئید- mew’id): وەعدگە، ژوان، شەرت و پەیمان.

**موعظه**- ا.ع(مەوئیزە- mewize): پەندو ئامۆژگاری.

**موعود**- ا.مف.ع(مەوئوود- mew’ûd): وەعدەکراو، رۆژی قیامەت.

**موفر**- ا.مف.ع(موڤەففەر- muveffer): فراوان و زۆر، زۆکراو، زیادکراو.

**موفق**-ص .ع(موڤەففەغ- muveffex): سەرکەوتوو.

**موفور**- ص.ع(مەوفوور- mewfûr): فراوان، فرە، زۆر، بێ شومار.

**موقت**- ص.ع(موڤەغغەت- mûvexxet): کاتی.

**موقد**- ا.ع(موغید- mûxid): کوانوو، ئاگردان، وەجاغ.

**موقر**- ص.ع(موڤەغغەر- mûvexxer): پیاوی ئاقڵ و سەنگین، کارامەو سالار، گەورەو پیاوانە.

**موقع**-ا.ع(مەوغیءَ- mewxi’): شوێنی کەوتن، شوێنی روودان، شوێنی لادان، قۆناغ.

**موقف**-ا.ع(مەوغیف- mewxif): شوێنی وەستان، وێستگە، هەڵوێست.

**موقن**- ا.فا.ع(موغین- mûxin): یەقیندار، دڵنیا.

**موقود**- ا.مف.ع(مەوغوود- mewxûd): داگیرساو.

**موقوف**- ا.مف.ع(مەوغووف- mewxûf): گیراو، تەقیف کراو.

**موقوفه**- ا.مف.ع(مەوغوفە- mew¨xûfe): موڵکێ کە دەرامەتەکەی بۆ کاروبارو خێری گشتی تەرخان کرابێ، وەقف کراو.

**موکب**- ا.ع(مەوکیب- mewkib): داروودەستەی پاشا لە سەفەردا.

**موکت**-ا.فر(موکیت-mûkit):موکێت، کومبار.

**موکل**- ا.فا.ع(موڤەککیل- mûvekkil): کەسێک کە ئەوقات بۆ خۆی بگرێ.

**موکل**- ا.مف.ع(موڤەککەل- mûvekkel): کەسێک کارێکی پێ سپێردرابێ، کەسێک کرابێ بە وەکیل.

**موکول**- ا.مف.ع(مەوکوول- mewkûl): وابەستە بە کەسێکی دیيەوە، دانراو.

**مول**- ا.مص(موول- mûl): خاوەخاو.

**مول**- ا.ص(موول- mûl): ماشوقی ژن، دەنکی ژن (واتە پیاوێکی دی جگە لە مێردەکەی) کورێک لە ماشوقی ژنێک بێ، حەرامزادە، زۆڵ.

**مولد**- ا.ع(مەولید-mewlid): شوێنی لە دایک بوون، زێد.

**مولد**- ا.فا.ع(مولید- mûlid): مامان.

**مولد**- ا.فا.ع(موڤەللید-mûvellid): مامان.

**مولد**- ا.مف.ع(موڤەللەد- muvelled): لەدایک بوو.

**مولش**- ا.مص.ع(مولیش- mûliş): دواخستن، ماتەڵ کردن، درەنگ کردن.

**مولع**- ا.مف.ع(مولەء- mûle’): چلێسی و تامەزرۆیی.

**مولکول**- ا.فر(مولیکوول- mûlikûl): گەردیلە.

**مولنجه**- ا(مولەنجە- mulence): ئەسپێی گەنم و ئارد.

**مولو**- ا(موولوو- mûlû) ناقوس، زەنگ.

**مولود**- ا.مف.ع(مەولوود- mewlûd): لەدایک بوو.

**مولوی**- ص.ن.ع(مەولەڤی- mewlevî): جۆرە کلاوێکی درێژ یان عەمامەیەکی بچووکە.

**مولی**- ا.ع(مەولا- mewla): سەروەر، گەورە، دۆست، بەندە، بەندەی ئازادکراو، خاوەن و گەورە.

**مولیدن**- مص.ل(موولیدەن- mûlîden): دێرکردن، درەنگ کردن، تاخیرکردن، دواکەوتن، ماتەڵ کردن.

**موم**- ا(مووم- mûm): مێوی هەنگوین، ئەو تلْپەیەی لە پاش پالاوتنی هەنگوین دەمێنێتەوە.

**مومول**- ا(موومول- mûmûl): نەخۆشییەکی چاوە.

**مومیا**- ا(موومییا- mûmiya): مۆمیا.

**مونتاژ**- ا.فر(موونتاژ- mûntaj): مۆنتاج کردن.

**مونس**- ا.فا.ع(موونیس- mûnis): هاودەم.

**مونل**- ا.فر(موونیل- mûnil): کانزایەکە لە سەدا ٦٠- ٧٠٪ی نیکلە.

**مونوپل**- ا.فر(موونووپول- mûnûpul): مۆنۆپۆل.

**مونولوگ**- ا.فر(مونولوگ- mûnûlûg): مەنەلۆگ، هەندێ نمایش کەیەک ئەکتەر بەتەنیا بێتە سەر شانۆو قسە لەگەڵ خۆیدا بکات، نمایشێکی کورت کە لەلایەن یەک کەسەوە ئەنجام بدرێ.

**مونه**- ا(موونە- mûne): خاسیەت، تایبەتمەندی، وەکو گەرمی ئاگر.

**موهبت**- ا.ع(مەوهیبەت- mewhibet): بەخشش، ئەوەی بە کەسێک ببەخشرێ.

**موهن**- ا.فا.ع(موهین- mûhin): لاوازکەر، سست کەر.

**موهوب**- ا.مف.ع(مەوهوب- mewhûb): شت پێ دراو، شت پێ بەخشراو.

**موهوم**- ا.مف.ع(مەوهوم- mewhûm): وەهم و خەیاڵ.

**موهون**- ص.ع(مەوهون- mewhûn): سست، لاواز.

**موی رگ**- ا.مر(موی رەگ- mûy erg): دەزولەی خوێن، مولولە.

**مویز**- ا(مەڤیز- mevîz): مێوژ.

**مویزه- مویزک**- ا(مەڤیزەک- مەڤیز- mevîzek- mevîz): جۆرە رووەکێکە.

**مویه**- ا.مص(موویە- mûye): گریە، زاری، شین.

**مویەزال**- ا.مر(موویەی زال- mûyey zal): ناوی ئاهەنگێکی کۆنی مۆسیقای ئیرانییە.

**موییدن**- مص.ل(موییدەن- mûyîden): گریان و زاری، گریان وشیوەنکردن، شیوەن و زاری.

**مویندە**- ا.فا(موویەندە- mûyende): شیوەنکەر.

**موپین**- ص.ن(موویین- mûyin): ئەو شتەی لە موو چنرابێ و دروست کرابێ.

**مه**- ص(میه- mih): گەورە.

**مه**- ا(میهـ- mih): تەم.

**مه**- مەهـ- meh): مانگ، هەیڤ.

**مـه**- ا.فـر(می- mi): مـانگی پێنجـەمی فەرەنگی.

**مـهـاب**- ا.ع(مـەهابب- mehabb): جـێی هاتنی با، کونەبا.

**مـهـابت**- مص.ع(مـەهابەت- mehabet): ترساندن، گەورەیی و شکۆ، شان و شەوکەت.

**مهابط**- ا.ع(مەهابیت- mehabit): شوێنی دابەزین، جێی نیشتنەوە.

**مـهـابل**- ا.ع(مـەهابیل- mehabil): ڕێی منداڵدان، مناڵدان، ڕەحمی ژن.

**مهاجات**- مص.ع(مووهاجات- mûhacat): هەجوکردنی یەکتر.

**مـهـاجر**- ا.فـا.ع(مـووهاجـیـر- mûhacir): مـوهاجـیـر، کـەسـێک لە شـار یان وڵاتی خـۆی بڕوات و لە شار یان وڵاتێکی بێگانە نیشتـەجێ ببێ.

**مـــهـــاجـــرت**- مص.ل.ع(مــــووهاجــەرەت- mûhaceret): کۆچ کرن، کۆچین.

**مـهـاجم**- ا.فـا.ع(مـووهاجیم- mûhacim): هێرش بەر.

**مـــهـــاجـــمـــه**- مص.ل.ع(مــــووهاجــەمــە- mûhaceme): هێرش کردن، هێرش بردن.

**مهاد**- ا.ع(میهاد- mihad): جێگە، بێشکە، لانکە، زەوی نزم.

**مـهـادات**- مص.ع(مـووهادات- mûhadat): دیاری دان بەیەکتر.

**مــــهــــادنت**- مص.ل.ع(مـــــووهادەنـە- mûhadene): ئاشـتـی کـردن، سـوڵح کـردن لەگەڵ یەکدا.

**مهار**- ا.ع(میهار- mihar): دارێکی بچوکە دەیخەنە پەرەی لوتی وشترو پەتی پێوە دەبەستن، هەوسار.

**مهارب**- ا.ع(مەهاریب- meharib): شـوێنی ڕاکردن و هەڵاتن.

**مـهـارت**- مص.ل.ع(مـەهارەت- meharet): کـارامەیی لە کـارێکدا، لێـهـاتوویی لە کـارێکدا، زیرەکی و وەستایی.

**مـــهـــارشـــه**- مص.ل.ع(مــــووهارەشـــە- mûhareşe): بـەیەکـــــدا هەڵـشـــــاخین، هەڕەشەکردن لە یەکدی، دژمنایەتی کردنی یەک.

**مـهـالک**- ا.ع(مەهالیک- mehalik): جێی لەناو چوون، شوێنی فەوتان، تالوکەخانە.

**مـهـام**- ا.ع(مـەهامم- mehamm): کـاری سەخت، ئەرک.

**مـهـان**- ا.مف.ع(مـووهان- mûhan): زەلیل کراو، ئیهانەکراو.

**مـهـانت**- مص.ل.ع(مـەهانەت- mehanet): خـواربوون، لول بوون، زەلیل بوون، ریسـوابوون، زیلەت و ریسوایی.

**مـهـب**- ا.ع(مـەهەبب- mehebb): شـوێنی هاتنی با، کونەبا.

**مـهـبط**- ا.ع(مـەهبـەت- mehbet): شـوێنی دابەزین، جێی نیشتنەوە.

**مـهـبل**- ا.ع(مـوهبـەل- muhbel): منداڵدان، ڕێی منداڵدان، ڕەحمی ژن.

**مهپاره**- ص.مر(مەهپارە- mehpare): جوان، خـشـکۆک، قـشـت، ژن یان مـناڵی جـوانی وەکـو مانگ.

**مـــهـــتـــاب**- ا.مـر(مــەهـتــاب- mehtab): مانگاشەو، تریفەی مانگ، هەیڤەشەو.

**مهتابی**- ا.مر(مەهتابی- mehtabî): هەیوان، بانیژە، بەردەمی عیمارەت.

**مـهـتـدی**- ص.ع(مـوهـتـەدی- muhtedî): کەسێک ڕێی ڕاستی دۆزیبێتەوە.

**مهتر**- ص.ت(میهتەر- mihter): سەرۆک و گەورەی قەوم.

**مهتر**- ا.ص(میهتەر- mihter): مەیتەر.

**مـــهـــجـــع**- ص.ع(مـــیـــهـــجـــەء- mihce’): غـافڵ، گـێل، ئەوەی زوو لای هەر کـەسـێک ڕام ببێ.

**مهجع**- ا.ع(مەهجەء- mehce’): خەوتنگە، جێی خەوتن و ئیسراحەت و حەوینەوە.

**مەهجو**- ا.مف.ع(مەهجوف- mehcûv): هەجوکراو.

**مەهجور**- ا.مف.ع(مەهجوور- mehcûr): بەجێ هێڵراو، دوور، چۆڵکراو.

**مهجه**- ا.ع(موهجە- muhce): خوێن، خوێنی دڵ، روح، گیان.

**مهچه**- ا(مەهچە- mehçe): هەیقۆک، سەری عەلەم کە لە زێر یان زیو لە شێوەی هەیقۆک چێدەکرێت.

**مهد**- ا.ع(مەهد- mehd): بێشکە، لانکە.

**مهد**- ا(مەهد- mehd): رووەکێکە.

**مهدی**- ا.مف.ع(مەهدی- mehdî): هیدایەت دراو.

**مهذار**- ص.ع(میهزار- mihzar): چەنەباز، هەڵەوەڕ، هەرزەگۆ.

**مهذب**- ا.مف.ع(موهەززەب- muhezzeb): بە ئەدەب، پاک و بێ خەوش، خۆش خوو.

**مهر**- ا(میهر- mihr): میهرەبانی، دۆستایەتی، مەحەبەت.

**مهر**- ا(میهر- mihr): خۆر، هەتاو.

**مهر**- ا(میهر- mihr): مانگی حەوتەمی ساڵی هەتاوی. یەکەم مانگی پاییز.

**مهر**- ا(موهر- muhr): مۆر، کیسەی سەربەستراو، سەرمۆر.

**مهر**- ا.ع(مەهر- mehr): مارەیی.

**مهراس**-ا.ع(میهراس- mihras): میکوت، هاوەن.

**مهراسپند**- ا.مر(مەهرئەسپەند- mehr espend): ناوی رۆژی بیست و نۆیەمی هەر مانگێکی هەتاوی.

**مهرافزا**- ص.فا(میهرئەفزا- mihr efza): ئەوەی میهرو مەحبەتی زۆربێ.

**مهرب**- ا.ع(مەهرەب- mehreb): شوێنی راکردن.

**مهربان**- ص(میهربان- mihrban): میهرەبان، دڵسۆز.

**مهرگان**- ا(میهرگان- mihrgan): مانگی میهر، پاییز، ناوی رۆژی شازدەیەمی مانگی میهرە، جەژنێکی کۆنی فارسانە، کە لە رۆژانی ١٦-٢١ی مانگی میهر بەر پایان دەکرد، دوای جەژنی نەورۆز گەورەترین جەژن بووە، ئەم جەژنە لە سەردەمی هەخامە نشییەکاندا باو بووەو لە قۆناغ و سەردەمەکانی دواتریشدا تا سەرهەڵدانی ئیسلام هەر باو بووە، پاش ئیسلامیش لە زەمانی سامانیان و غەزنەویاندا باو بووە، ئێستاش وەکو جەژنێکی گەورەی رۆشنبیریی ماوە، بەعەرەبی میهرەجانی پێدەگوترێ..

**مهرگانی**- ا(میهرگانی- mihrganî): ناوی لەحنێکە لە سی لەحنەکەی باربەد.

**مهرگیاه**- ا.مر(میهرگییاه- mihr gîyah): جۆرە گیایەکە.

**مهره**- ا(موهرە- muhre): مورو، مۆرەغە.

**مهرەداران**- ا.مر(موهرەداران- muhredaran): بڕبڕەداران.

**مهزول**- ص.ع(مەهزول- mehzûl): لەرو لاواز.

**مهزوم**- ا.مف.ع(مەهزوم- mehzûm): بەزیوو، هەڵاتوو، شکست خواردوو.

**مهست**- ص(مەهیست- mehist): گەورەترین.

**مهستی**- ا.مر(میهسیتی- mihsitî): پێکهاتووە لەمە (گەورە) و ستی (خانم) مهستی: خانمی گەورە.

**مهسیما**- ص.مر(مەهسیما- mehsîma): روو مانگ، جوان و خشکۆک وەکو مانگ.

**مهشید**- ا.مر(مەهشید- mehşîd): مانگەشەو، تریفەی مانگ.

**مهک**- مص.ل.ع(مەهک- mehk): نەرمکردنی شتێک، سووینەوە.

**مهک**- ا(مەهک- mehk): گیایەکە.

**مهل**- مص.ل.ع(مەهل- mehl): بە ئەسپایی کارکردن، هێمنی و نەرمی.

**مهل**- ا.ع(موهل- muhl): ئاسنجاو، قەتران و رۆنی زەیتون، زیچکاو.

**مـــهلت**-مص.م.ع(مـــوهلەت- muhlet): مۆڵەتدان، دەرفەتدان، مەدارا.

**مـــهلک**-ا.فـــا.ع(مـــوهلیک- muhlik): کوشندە.

**مـهلکه**- ا.ع(مـەهلەکـە- mehleke): جـێی لەناو چوون.

**مـــهلل**- ص.ع(مـــوهەللەل- muhellel): چەماوە، چەماوە وەکو هەیڤک.

**مـهلهل**- ص.ع(مـوهەل هەل- muhelhel): ناسکە شیعر، جلی ناسکی چنراو.

**مـهم**- ص.ع(مـوهیم- muhimm): گـرنگ، کاری گەورە.

**مهمات**- ا.ع(موهیـمـات- muhimmat): ئامێرو کەرەستەی جەنگ، ئەرک و کاری دژوارو گرینگ.

**مهماز**- ا.ع(میهماز- mihmaz): مامێز.

**مهمان**- ص(میـهـمـان- mihman): مـیوان، میڤان.

**مهماندار**-ص (میهماندار- mihmandar): میواندار.

**مـــهـــمـــانـســـرا**- ا.مـــر(مـــیـــهـــمـــانســـەرا- mihmansera): میوانخانە.

**مـــهـــمـــانکده**- ا.مـــر(مـــیـــهـــمـــانکدە- mihmankede) میوانسەرا، میوانخانە.

**مهمان نواز**- ص.فا(میهمان نەڤاز- mihman nevaz): میواندۆست، میوانپەروەر.

**مهمز**- ا.ع(میهمەز- mihmez): مامێز.

**مهمل**- ص.ع(موهمەل- muhmel): بێهودە، قسەی بێهودە.

**مهموز**- ص.ع(مەهموز- mehmûz): وشەی هەمزەدار.

**مـــهـمـوم**- ص.ع(مــەهمــوم- mehmûm): دڵتەنگ، خەمبار.

**مـهـمـه**- ص.ع(مـوهیـمـمـە- muhimme): کـار و ئـەرکی دژوارو گرنگ، ئـامێرو کـەرەسـتـەی شەڕ.

**مهمیز**- اا(میهمیز- mihmîz): مامێز.

**مـهنا**- ص.ع(موهەننا- muhenna): خـۆش، بەلەزەت و سازگار.

**مـهناوی**- اا(مـەهناڤی- mehnavî): کـەسـێک لە هێـزی دەریاییـدا کـار بکات وەکـو گـوروبانی سوپا.

**مـــهند**- ص.ع(مـــوهەننەد- muhenned): شمشێری هیندی.

**مـهندس**- ا.ص(مـوهەندیس- muhendis): ئەندازیار.

**مهوار**- ص(مەهڤار- mehvar): مانگ ئاسا، میناهەیڤ.

**مـهـوار**- اا(مـەهڤـار- mehvar): مـانگانە، موچەو جیـرەیەک کـە مـانگەو مـانـگ بە خـەڵکی بدرێ.

**مـهـوش**- ص(مـەهڤـەش- mehveş): جـوان، مانگ ئاسا، روو مانگ.

**مـهـوع**- ا.فـا.ع(مـوهەڤـڤـیئ- mûhevvi’): قێزەوەر، مایەی رشانەوە، قێزەون.

**مـهـول**- ص.ع(مــەهول- muhul): ترسناک، پڕترس.

**مهیا**- ص.ع(موهەییا- muheyya): ئامادە، تەیار.

**مهیاوه**- اا(مەهیاڤە- mehyave): خۆراکێک لە ماسی دروست بکرێ.

**مـهـیب**- ص.ع(مـەهیب- mehîb): ترسـێنەر، مایەی ترس و هەیبەت.

**مـهـیج**- ا.فـا.ع(مـوهەییج- muheyyic): هاروژێنەر.

**مـهـیـل**- ص.ع(مــەهیل- mehîl): شـوێنی ترسناک، جێی پڕ مەترسی.

**مـهـیـمن**- ص.ع(مـوهەیمین -muheymin): شایەتی راستگۆ، نیگابان، یەکێکە لە ناوەکانی یەزدان.

**مـهین**- ص.ن(مـیـهـین- mihîn): گـەورە، گەورەتر.

**مهین**- ص.ع(مەهین- mehîn): مانگ ئاسا، مانگین، ناوی ژنانە.

**مهین**- ص.ع(مەهین- mehîn): زەلیل.

**مهیوه**- ا(مەهیەڤە- mehyeve): خۆراکێک بەماسی دروستکرابێ.

**می**- ا(مەی- mey): شەراب، مەی.

**مـیـادین**- ا.ع(مـەیادین- meyadîn): مەیدانان.

**میامن**- ا.ع(مەیامین- meyamin): دەستی راست، لای راست، باڵی راستی مەیدانی جەنگ، بەرەکەت و فەڕ.

**مـیـامین**- ا.ع(مـەیامین- meyamîn): موبارەک.

**میان**- ا(مییان- miyan): ناوەڕاست، کەمەر، ناوقەد.

**مـیـان بالا**- ص.مر(مـیـیـان بالا- miyan bala): دەستە بالا.

**مـیـان بند**- ا.مر(مـیـیـان بەند- miyan bend): کەمەر بەند.

**میانچی**- ا(مییانچی- miyançî): نێوانچی، پێناو، ناوبژیوان.

**مـیـاندار**- ص(مـیـیـاندار- miyandar): وەستاو مامۆستاو رابەر لە زۆرخانەدا.

**میـانگین**- ص.ن(مـیـیـانگین- miyangîn): موعەدەل، تێکڕا.

**میانه**-ا(مییانە-miyane):ناوەند، ناوەڕاست.

**میانەرو**- ص.فا(مییانەرەو-miyanerew): میانڕەو.

**مـیـانەسال**- ص.مر(مـیـیـانەسال- miyane sal): میانەساڵ، کامڵ، نە گەنج و نەپیر.

**میاه**- ا.ع(مییاه- miyah): ئاو.

**می پرست**- ص.فا.ع(مـەی پەرەست- mey perest): مەی پەرست، کەسێک زۆری حەز لە مەی بێ.

**میت**- ص.ع(مەیت- meyt): جەنازە، مردوو.

**مـیـت**- ص.ع(مـەییت- meyit): مـردوو.

**میـترا**- ا(مـیـترا- mitra): فریشتەی میـهرو خۆشەویستی، فریشتەی پاراستنی راستی و بەڵێن و پەیمان، سەرچاوەی رووناکی و تیشک، خۆر.

**مـیـترائیسم**- ا(مـیـترائیسم- mîtra'ism): خۆشەویستی پەروەری، میهرپەروەری.

**مـیـتـولوژی**- ا.فـر(مـیـتـولۆژی- mîtûlûjî): مـیـتـولۆژی، ئەفـسـانەی قـارەمـانان، زانسـتی لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی ئەفسانەی خواوەندان و قارەمانان.

**میته**- ص.ع(مەیتە- meyte): مردار.

**میتین**-ا(مـیـتین- mîtîn): زەنگن، کـولـێنگ، تەشویی بەرد تاشین.

**میثاق**- ا(میساغ- misax): بەڵێن، پەیمان.

**میخ**- ا(میخ- mîx): مێخ، بزمار.

**مـیـخـانه**- ا.مـر(مـەیخـانە- meyxane): مەیخانە، شوێنی خواردنەوەی مەی.

**میختن**- مص.ل(میختەن- mîxten): میزتن، میزکرن.

**میخچه**- ا(میخچە- mîxçe): بزماری بچوک، مێخەکە.

**میخ درم**-ا.مر(میخ دیرەم-mîxdirem):دراو، سکە، ئامێرێک کە دراوی پێ لەسکە بدرێ.

**میخک**- ا(میخەک- mîxek): گوڵە مێخەک.

**مـیـخـوار**- ص.فـا(مـەیخـار- meyxar): شەرابخۆر، مەیخۆر.

**میخوش**- ص(مەیخوش- meyxûş): ترش و شیرین، مێخۆش، مزر.

**میخی**-ص .ن(میخی- mîxî): بزماری، خەتی بزماری.

**مــیــدان**- ا(مــەیدان- meydan): مــەیدان، گۆڕەپان، مەیدانی ئەسپ تاودانێ.

**میده**- ا.ص(مەیده- meyde): نانی گەنم.

**میده سالار**- ا.ص(میده سالار- mîde salar): نانەوا، نانکەر.

**میر**- ا(میر- mîr): میر، ئەمیر.

**میراب**- ا.ص(میراب- mîrab): میراو.

**مــیــراث**- ا.ع(مــیــراس- mîras): کــەلەپور، مــیــرات، ئەوەی لە پاش مــردوو دەمــێنێ و میراتگرانی دەیبەن.

**مــیــرخــور**- ا.ص(مــیــرئاخــور- mîraxûr): مــیــرئاخــور، کــەســێک بەتەویلــەی خــان و شــادا رادەگا.

**مــیــراندن**- مص.م(مــیــراندەن- mîranden): مراندن، کوشتن.

**مــیــرزا**- ا.ص(مــیــرزا- mîrza): ئەمــە کورتکراوەی ئەمیرزادە-یە، ئەمە لە کۆنا لەقەبی شازادەکان بووەو لە کۆتایی ناویاندا بەکار هاتووە وەکــو مــحــەمــەد مــیــرزا، هەندێ پیــاویش ئەو لەقــەبەیان لەپێش ناوی خــۆیانەوە داناوە. پاشان مــانای کــۆلــکە خــوێنەوارو نووســەرو سکرتێــری وەرگرتووە، میرزا، میرزا بنووس.

**مــیــرشکار**- ا.ص(مــیــرشــیــکار- mîrşikar): گەورەی شکارچییان، بەرپرسی راوچییان.

**میرغضب**- ا.مر(میــرغــەزەب- mîrxezeb): میرغەزەب، جەلاد، ماموری ئەنجامدانی حوکمی خەنەقاندن.

**میروک**- ا(میرووک- mîrûk): مێروولە.

**مــیــره**- ا(مــەیره- meyre): مــێــرد، شــوو، سەرۆکی خانەوادە، سەروەر.

**مــیــره**- ا.ع(مــیــره- mîre): ئازوقــە، مــیــرە، ئازوخەی دەوڵەتی، ئەرزاق.

**میز**- ا(میز- mîz): مێز.

**میزاب**- ا(میزاب-mîzab): مەرزوم، مەرزیب.

**مــیــزان**- ا.ع(مــیــزان- mîzan): تەرازوو، ئەندازە.

**میزبان**- ص(میزبان- mzban): خانەخوێ.

**مــیــزد**- ا(مــەیەزد- meyezd): مــەجلیــسی شەراب و بەزمی میــوانی، مێزی رازاوەی خواردن لە بۆنەێن ئاینیدا.

**می زده**- ص.مف(مــەی زەدە- meyzede): کەسێک زۆری خواردبێتەوەو شەراب لێی دابێ.

**میزر**- ا(مەیزەر- meyzer): مێزەر.

**میزراه**- ا.مر(میزراه- mîzrah): میزەڕۆ.

**میزک**- ا(میزەک- mîzek): میز.

**مــیــزنای**- ا.مــر(مــیــزنای- mîznay): میزەڕۆ.

**مــیــزەشناس**- ا.ص(مــیــزەشــیناس- mîzeşinas): پسپۆڕ لە واری نەخۆشی میزدا.

**مــیــزیدن**- مص.ل(مــیــزیدەن- mîzîden): میزتن، میزکردن.

**میس**- ا.ع(میس- mîs): درەختێکی گەورەیە.

**میسر**- ا.ع(مەیسەر- meyser): قومار.

**میسر**- ا.مف.ع(مویەسسەر- muyesser): ئاسان، ئاسانکراو، ئامادەو فەراهەم.

**مــیــســره**- ا.ع(مــەیســەرە- meysere): دەســتــەچەپ، لای چەپ، باڵی چەپی مــەیدانی جەنگ.

**مــیــسور**- ا.مف.ع(مــەیســوور- meysûr): سەهل و ئاسان.

**میسیون**- ا.فر(میــسیــون- mîsyûn): شاند، شاندی نوێنەرایەتی.

**میسیونر**- ص.فر(میسیونیر- mîsyûnir): ئەندامی شــاندی ئاینی، مــژدەدەری ئاییــنی، کەشیش.

**میشن**- ا(میشەن- mîşen): پێستی مەڕی دەباغی کراو.

**میشوم**-ص .ع(مەیشوم- meyşûm): شووم، نەحس، ناموبارەک.

**مــیــشــینه**- ص.ن(مــیــشــینه- mîşîne): مێگەلەمەڕ.

**میعاد**- ا.ع(میئاد- mî’ad): رۆژی قیامەت، رۆژی پەسلانێ، وعدەگە.

**میعە**- ا.ع(مەیئە- mey’e): شۆکە.

**میغ**- اا(میغ- mîx): تەمی خەست و چڕ، هەور.

**میقات**- ا.ع(میغات- mîxat): وەخت، کات، کاتی کار.

**میکا**- ا.مر(میکا- mîka): جۆرە بەردێکە، میکا.

**میکائیل**- ا.خ(میکائیل- mîkail): ناوی فریشتەیەکە.

**میکادو**- اا(میکادو- mîkadû): لەقەبی جارانی ئیمپراتۆرانی ژاپۆنە.

**میکدە**- ا.مر(مەی کەدە- meykede): مەیخانە، جێی شەراب فرۆشتن، شوێنی مەی خواردنەوە.

**میکروب**- ا.فر(میکرۆب- mîkrûb): میکرۆب.

**میکردوبیولۆژی**- ا.فر(میکروبیولۆژی- mîkrubiyulujî): میکرۆبناسی.

**میکروبیولۆژیست**- ا.ص.فر(میکروبیولوژیست- mîkrubiyulujist): میکرۆب ناس.

**میکروفون**- ا.فر(میکروفون- mîkrufûn): میکرۆفۆن، بلندگۆ.

**میکروگرافی**- ا.فر(میکروگراقی- mîkrugrafî): زانستی لێکۆڵینەوەی گەردیلان.

**میکرولیتیک**- ا.فر(میکرو لیتیک- mîkrulîtîk): بەردێک لە توخمی زۆر وردە دروست بووبێ.

**میکرومتر**- ا.فر(میکرو میتر- mîkru mitr): ئامێری پێوانەی مەودای زۆر بچووکی وەکو میلیمەتر.

**میکرون**- ا.فر(میکرون- mîkrûn): ئامێرێکی زۆر بچووکە بۆ ئەندازەگیری شتی زۆر بچووک.

**میکزودم**- ا.فر(میکزودیم- mîkzûdim): نەخۆشییەکە لە ئەنجامی نەرەسیوی غودەی دەرەقی دروست دەبێ.

**میگ**- اا(میگ- mîg): کوللە، رووبیان.

**می گسار**- ص.فا(مەی گوسار- mey gusar): مەی خۆر.

**میگو**- اا(مەیگو- meygû): کوللەی دەریایی، رۆبیان، مەیگۆ.

**میگون**- ص(مەی گون- meygûn): بە رەنگی مەی، سور، بە رەنگی شەراب، شەرابی.

**میل**- اا(میل- mîl): میل، کلچێو.

**میل**- مص.ع(مەیل- meyl): چەمین، لار بوون، ئارەزوو کردن.

**میل**- اا(میل- mîl): میل، پێوانەیەکە.

**میلاد**- ا.ع(میلاد- mîlad): کاتی لە دایک بوون، رۆژی لە دایک بوون.

**میلان**- مص.ع(مەیەلان- meyelan): لاربوون، خواربوون.

**میلاو**- ا.ص(میلاڤ- mîlav): شاگرد، شاگرد دوکان.

**میل لنگ**- ا.مر(میل لەنگ- mîl leng): ئامێرێکە کاری پستۆنی ئوتۆمبیل رێک دەخات.

**میلە**- اا(میلە- mîle): بیر، کارێز.

**میلیتاریسم**- ا.فر(میلیتاریسم- mîlîtarîsm): عەسکەرتاریزم، ولاتێک هەموو کاروبارێکی لەژێر دەسەلاتی سوپاییاندا بێ، بۆچوون و ئایدولۆژیایەکە کە پێی وایە شەڕ گرنگترین ئەرکی نەتەوەییە.

**میلیتر**- ص.فر(میلیتەر- mîlîter): سوپایی، لەشکری، عەسکەری، میللیتاری، میلیشایی.

**میلی گرم**-ا.فر(ملی گیرەم- mîlîgirem): هەزاریەکی گرام.

**میلی متر**- ا.فر(میلی میتر- mîlî mitr): هەزاریەکی مەتر.

**میمنت**- مص.ل.ع(مەیمەنەت- meymenet): مویارەک بوون، فەڕو بەرەکەت.

**میمنە**- ا.ع(مەیمەنە- meymene): بەرەکەت و فەڕ، لای ڕاست، باڵی ڕاستی مەیدانی جەنگ.

**میمون**- ص.ع(مەیمون- meymûn): موبارەک، بەفەڕ.

**میمون**-ا(مەیمون- meymûn): مەیموون.

**میمیک**- ص.فر(میمیک- mîmîk): لاسایی کردنەوەو دەمەلاسکێ، هەڵس و کەوت و گۆڕانی چارەی ئەکتەر لە کاتی دەوربینین لە شانۆگەریدا.

**مین**- ا.فر(مین- mîn): مین، لوغم.

**مینا**- ا(مینا- mîna): شووشە، میناى سەر ددان.

**مینا**- ا(مینا- mîna): گوڵی مینا.

**مینا**- ا(مینا- mîna): باڵندەیەکە.

**مینا**- ا.ع(مینا- mîna): مینا، بەندەر.

**مینافام**- ص.مر(مینافام- mînafam): شینباو، شین وەکو مینا.

**میناکار**- ا.ص(میناکار- mînakar): میناساز، کەسێک کە میناکاری بکات.

**مینو**- ا(مینوو- mînû): بەهەشتی بەرین.

**مینوت**- ا.فر(مینوت- mînût): ڕەش نووس، پێش نووس.

**مینوی**- ص.ن(مینەڤی- mînevî): بەهەشتی.

**مینیاتور**- ا.مر(مینیاتور- mînyatûr): وێنەی زۆر بچوک کە وردە کاری تیا کرابێ، جۆرە نیگارکێشییەکی تایبەتی ڕۆژهەڵاتە.

**مینیاتوریست**- ص.فر(مینیاتوریست- mînyatûrîst): مینیاتۆرساز، نیگارکێشی مینیاتۆرکار، کەسێک بە شێوازی مینیاتۆر نیگارکێشی بکات.

**مینیموم**- ا.فر(مینیموم- mînîmûm): بەلای کەمەوە، لایەنی کەم.

**میوپ**- ا.فر(میوپ- miyûp): نزیک بین، کەسێک چاوی لاواز بێ‌و دوور نەبینێ.

**میولوژی**- ا.فر(میولوژی- miyûlûjî): بەشێکە لە زانستی توێکاری دەربارەی ماسولکە، ماسولکەناسی.

**میوە**- ا(میڤە- mîve): میوە،.

**میوەنیام**- ا.مر(میڤەنییام- mîveniyam): توێکڵی هەندێ ڕوەکی وەکو نۆک و لۆبیا.

**میهن**- ا(میهەن- mîhen): وەتەن، زێد، نیشتمان، ماڵ.



**ن- حر**(ن- N):
پیتی بیست و نۆیەمی ئەلفبای فارسییەو بە (نون) دەخوێنرێتەوەو، بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (٥٠).

**نا-** (نا- na): پێشگرە، دەچێتە پێش وشەو مانای تازەی لێ دروست دەکات، وەک: نادرست، ناپسند، ناتوان.

**نا-** ا(نا- na): نای، نەی، گەروو.

**نا-** ا(نا- na): نم، رتوبەت، تەرەشوع، بۆنی ناخۆشی هەندێ خۆراکی کۆن، بۆنسارد.

**نا-** ا.عا(نا- na): وزە، شینگ، تاقەت و توانا، هەناسە.

**نارام-** ص(نائارام- na aram): بێ ئۆقرە.

**نا ازمودە-** ص(نا ئازمودە- na azmûde): بێ ئەزموون، بێ تەجرەبە، بارِ.

**نااشنا-** ص(نائاشنا- na aşna): نەناس، بێگانە.

**نائب-** ص.ع(نائیب- naib): جێگر.

**نائبە-** ص.ع(نائیبە- naibe): لێقەومان، کارەسات، بوبەرو بەلاو نسیبەت.

**نائح-** ا.فا.ع(نائیھ-naih): شینگێڕ.

**نائرە-** ا.ص.ع(نائیرە- naire): ئاگری هەلایساو، فیتنە، رق و کینەو دژمنایەتی.

**نائل-** ا.فا.ع(نائیل- nail): بە مەبەست گەییو، سوودمەند.

**نائم-** ص.ع(نائیم- naim) نووستوو، خەوتوو، خەفتگ.

**نائمە-** ص.ع(نائیمە- naime): ژنی نووستوو، مەرگ.

**ناب-** ص(ناب- nab): پاک و بێ غەل و غەش، نایاب.

**ناب-** ا.ع(ناب- nab): کەڵپە.

**ناباب-** ص(ناباب- nabab): ناپەسند، نابەو، نەگونجاو، ناشیرین.

**نابالغ-** ص.مر(نابالیغ- nabalix): نەبالق.

**نابارو-** ص(ناباڤەر- nabaver): باوەڕنەکردەنی، شتێ قەبوڵ نەکرێ.

**نابایا-** ص(نابایا- nabaya): نەزەروری، ناپێویست.

**نابایست-** ص(نابایست- nabayist): هەر شتێ پێویست نەبێ، ناپێویست.

**نابت-** ا.فا.ع(نابیت- nabit): چەکەرەکردوو، رِواو، واردوو.

**نابجا-** ص(نابیجا- nabica): نابەجێ.

**نابخرد**- ص(نابیخرەد- nabixred): بێ ئەقڵ، گێل، گەلحۆ.

**نابردار**- ص(نابوردار- naburdar): ناچار، بێ سەبر، بێ ئۆقرە.

**نابرید**- ص(نابورید- naburîd): نەبڕدراو، خەتەنە نەکراو، سوونەت نەکریاگ.

**نابسامان**- ص(نابیسامان- nabi saman): بێ سەروبەر، نارێک و پێک، شێواو.

**نابسود**- ص(نابەسوود- nebesûd): کون نەکراو، دەست لێنەدراو، سەرمۆر.

**نابغه**- ص.ع(نابیغە- nabixe): بلیمەت، هەڵکەوتوو، لەرادەبەدەر زیرەک.

**نابکار**- ص(نابیکار- nabikar): بێ کەڵک، بەدکردەوە، بێ فایدە.

**نابل**- ص.ع(نابیل- nabil): تیرەنداز.

**نابنوا**- ص(نانبینەڤا- nabineva): زایەو لەناو چوو، بێنەوا.

**نابود**- ص(نابوود- nabûd): نابوود، لەناوچوو، نەماو، فەوتاو.

**نابودمند**- ص(نابوودمەند-nabûd mend): موفلیس، هەژار، بێ حاڵ و ماڵ.

**نابهره**- ص(نابەهرە- nabehre): پیسکە، بێ خێر، زێڕی قەڵب.

**نابهنگام**- ص(نابیهینگام- nabihingam): ناوەخت.

**نابینا**- ص(نابینا- nabîna): نابینا، کوێر، کەسێک کە چاوی نەبینێ.

**نابیوسان**-ص (نابەیووسان- nabeyûsan): نشکێڤا، لەنکاو، لەپڕ، لەنا غافڵ.

**ناپاک**- ص(ناپاک- napak): پیس، ناپاک.

**ناپاکزاد**- ص(ناپاکزاد- napak zad): حەرامزادە، زۆڵ، بیژی.

**ناپایدار**- ص(ناپایدار- napaydar): ناپایەدار، رەوتەنی، زووگوزەر.

**ناپخته**- ص(ناپوختە- napuxte): نەکوڵاو، کاڵ، بێ تەجرەبە، بارِ، خاو.

**ناپدرام**- ص(ناپیدرام- napidram): ناپەسند، ناخۆش، غەمگین، شووم، ناهەموار، نادرووست، نا رێک و پێک.

**ناپدری**- ص(ناپیدەری- napiderî): زڕباب، باوەپیارە، باوەپێرە.

**ناپدید**- ص(ناپەدید- napedîd): پێوار، نادیار، پەنهان، گوم.

**ناپروا**- ص(ناپەرڤا- naperva): بێ پەروا، چاوقایم، سەرگەردان، نەترس.

**ناپرهیزگار**-ص (ناپەرهیزگار- naperhîzgar): بەدکردەوە، فاسق، داوێن پیس.

**ناپز**- ص(ناپەز- napez): نەکوڵۆک.

**ناپسری**- ص(ناپیسەری- napiserî): زڕکوڕ.

**ناپسند**-ص (ناپەسەند- napesend): ناپەسند، ناجوور، ناحەز.

**ناپیدا**- ص(ناپەیدا- napeyda): نادیار، پەنهان، پێوار، ئەوەی ئاشکرا نەبێ، نەخوویا.

**ناتراشیده**- ص(ناتەراشیدە- nateraşîde): نەتاشراو، ناهەموار، بێ تەربێت.

**ناتندرست**- ص(ناتەن دروست- naten drust): نەخۆش، دەغەزار، نەساغ.

**ناتنی**- ص(ناتەنی- natenî): زڕ، بڕا یان خوشک کە لەیەک داک و باب نەبن.

**ناتو**- ص(ناتەو- natew): ناسازگار، ناتەبا، نارێک، ناکۆک.

**ناتوان**- ص(ناتەڤان- natevan): نەتوان، بێ توانا، لاواز، بەلەنگازو بێنەوا.

**ناتور**- ا.فر(ناتوور- natûr): تەبع، تەبیعەت، گەوهەر، جەوهەر، سروشت.

**ناتورالیست**- ص.فر(ناتورالیست- natûralîst): تەبیعی زان، زانا لە تەبیعیاتدا.

**ناتوالیسم**- ا.فر(ناتووراليسم- natûralîsm): پەیڕەوی شێوازی تەبیعەت.

**ناجح**- ص.فا(ناجیه- nacih): سەرکەوتوو، سەرکەفتگ.

**ناجع**- ص.ع(ناجێ- naci’): سوودمەند، خۆش، خوازیاری پاوەن و لەوەڕو لەوەڕگە، عەودالّی گیاولەوەڕگە.

**ناجم**- ا.فا.ع(ناجیم- nacim): هەڵاتوو، سەرکێش، دەرەوشاوە.

**ناجو**- ا(ناجوو- nacû): کاژ.

**ناجود**- ا(ناجوود- nacûd): کاسە، پیالّە، شەراب و قاپی شەراب.

**ناجور**- ص(ناجوور- nacûr): نەگونجاو، تاکەو تاک.

**ناجی**- ا.فا.ع(ناجی- nacî): رزگاربوو، دەربازبوو

**ناچار**- ص(ناچار- naçar): ناچار، بێچارە، بێ دەرەتان، بە ناچاری، بێنەوا.

**ناچخ**- ا(ناچەخ- naçex): تەورزین، کولّەنیزە.

**ناچرید**- ص(ناچەرید- naçerîd): نەلەوەڕیو، مرۆڤ یان حەیوان کە هیچی نەخواردبێ.

**ناچیز**- ص(ناچیز- naçîz): کەم، هیچ، ناچیز.

**ناحق**- ص(ناهەغ- nahex): درۆ، نەهەق.

**ناحل**-ص .ع(ناحیل- nehil): بنێس، لاواز، ئەوەی نەخۆشی یان ئەشق یان سەفەر لاوازی کردبێ.

**ناحی**- ص.فا.ع(ناهی- nahî): نەحووزان، ڕێزمان زان، دەستوورزان.

**ناحیه**- ا.ع(ناهییە- nahiye): ناوچە، لا، قەراخ، بەشێک لە شارێک.

**ناخ**- ا(ناخ- nax): ناوک.

**ناخدا**- ا.ص(ناخودا- naxuda): کەشتیوان، ئەفسەری هێزی دەریایی.

**ناخلف**- ص.مر(ناخەلەف- naxelef): ناخەلّەف، منالّی نا سالّح، منالّی نالەبار، منالّی خراپ.

**ناخن**- ا(ناخون- naxun): نینۆک، نووخان، نویخان.

**ناخنک**- ا(ناخونەک- naxunek): نینۆکی بچووک، ناخونەک، خواردن لە شتێ بە بەبێ ئیجازەی خاوەنی.

**ناخنک**- ا(ناخونەک- naxunek): ڕووەکێکە.

**ناخن گیر**- ا.مر(ناخون گیر- naxun gîr): نینۆک کەر.

**ناخنه**- ا(ناخونە- naxune): زیادە گۆشتی گۆشەی چاو.

**ناخواست**- ص(ناخاست- naxast): داوانەکراو، نەویستراو.

**ناخوانا**- ص(ناخانا- naxana): خەتێ بە ئاسانی نەخوێنرێتەوە، ئومی و نەخوێندەوار.

**ناخوانده**- ص(ناخاندە- naxande): نەخوێندەوار، کەسێک بێ دەعوەت کردن خۆی بکا بە میوان.

**ناخوداگاه**- ص.مر(ناخودئاگاه- naxûd agah): کەسێک ئاگای لە خۆی نەبێ، نائاگا، بێ ئاگا.

**ناخوش**- ص.ناخووش- naxûş): نەخۆش، ناپەسند، دلّتەنگ، لەش بەبار.

**نادار**- ص(نادار- nadar): نەدار، نەبوو، هەژار، دەستکورت.

**ناداشت**- ص(ناداشت- nadaşt): هەژار، نەبوو، نەدار، بێ شەرم.

**نادان**-ص(نادان- nadan): نەزان، بێ ئەقلّ، نەخوێندەوار.

**نادانسته**- ص(نادانستە- nadaniste): نادیار، نەزانراو، لە ڕووی نەزانییەوە.

**نادختری**- ص(نادوختەری- naduxterî): زڕکچ.

